# پێشگۆتن

بیرۆکەی گەڕان بە شوێن بنەچە و ڕەچەڵەکی وشەدا، یەکێکە لەو خولیانە کۆنانەی کە هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە لەگەڵمدا بووەبەتایبەتی کاتێك لە سلێمانی چوومە قوتابخانەی نێوەندی و، خوێندن لە پڕ و یەکسەر بوو بە عەرەبی، پاش ئەوەی لە قوتابخانەی سەرەتاییدا، هەموو بابەتەکان بە کوردی بوون. جا هەرچەندە، ئەز هیچ جۆرە سەختییەکم بە دەست زمانی عەرەبییەوە نەدەدی چۆنکە هەر لە منداڵییەوە ئەو زمانە فێربووبوم، بەڵام لە قووڵایی دەروونمەوە، هەستم بە نایەکسانی دەکرد، کە دەمدی قوتابیی کورد، بە نابەدڵی و بە زۆری زۆردارەکی، زمانی بێگانە دەسەپێندرێ بەسەریدا و، تەنانەت مامۆستا کوردەکانیشمان، کە ژمارەیان لە پەنجەی دەست تێنەدەپەڕی، ناچار بووبوون بە عەرەبی قسەبکەن لە گەڵمان . ئەمە یەکەمین جەزربە بوو کە ناخی دەروونمی هەژاند و، کەوتمە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی، ڕێیەك بدۆزمەوە بۆ خزمەتی قوتابیی کورد و، لەوەوە بریارمدا، کە لە دوارۆژدا ببمە مامۆستا و، بۆ ئەمەش دەستمکرد بە خۆئامادەکردن، لەڕێی خۆخەریککردنەوە بە باشتر فێربوونی زمانی کوردی، ئەوەش هەر لە ساڵانی کۆتاییی قوتابخانەی دوانێوەندییەوە، تا سەردەمی خوێندنی زانستگە لە بەغدا و، پاشان کە بوومە هینکار (فێرکار، معلم) پتر ئارەزووم چووە سەر ئەوەی بزانم ڕەگوڕیشەی وشە کوردییەکان چین، بە تایبەتی، کە لە پاییزی 1955 ەوە تا پاییزی 1957 بوومە مامۆستا لە قوتابخانە نێوەندییەکانی کەرکووك وتێکەڵ بە قوتابیانی کورد بووم بە پێویستم زانی

دەستبدەمە نووسینی زانست بە کوردی (وەك ماتماتیك و فیزیك) و، لەم رووەشەوە خۆم زۆر بە بێکەس و بێپشتیوان دەهاتە بەرچاو، چۆنکە لەوەپێش، نە پەرتۆکێکی زانستی بەکوردی هەبوو پشتببەستم پێی و، نە زاراوەکانیش کرابوون بە کوردی، لەبەر ئەوە جارێ کەوتمە دارِشتنی زاراوە زانستییەکان و، ئەوجا نووسینی چەند بەرگێك فیزیك و ماتماتیك و، لە پاڵ ئەوانەشدا و، هەر لە پەنجاکانی سەتەی رابووردوودا، چەندین وتار و نامیلکەم بە کوردی و عەرەبی بلاوکردەوە چ لە بارەی زمانی کوردی و چ لە بارەی گیروگرۆی خوێندەواری بە زمانی کوردییەوە و، چەند بەرهەمێکیشم وەرگێرِایە سەر زمانی کوردی.[1] هەر لەم کاتەدا، هاتمە سەر گەرِان بەدوای بنەرِەتی وشە کوردییەکاندا و، هەر زوو هەستمکرد بەوەی، گەلێك وشە، کە پێمانوایە عەرەبین، لە بنەرِەتدا کوردین و، کە لە پاییزی 1957دا بە فەرمانێکی بەرێوەبەرانە (أمر إداري) شوێنی کارەکەم لە کەرکووکەوە گوێزرایەوە بۆ بەسرە و، بوومە مامۆستا لە قوتابخانەی نێوەندیی زوبێر، رووداوێکی سەیر روویدا کە پێوەندیی بەم باسەوە هەیە و شایانی لێدوانە و، دوایی دێمەوە سەری، لێرەشدا ناچارم ئەوە بێژم کە هەڵوێستی رژێمی ئەوسای عێراق وابوو، هەموو کوردێکی رەخنەگر و ئازادیخوازی بە "کۆمۆنیست" و "تێکدەر" و "ئاژاوەگێرِ" دەدایە قەڵەم. خۆ ئەگەر ئەو کوردە مووچەخۆری میری بووایە، ئەوا لە کوردستانەوە رەهەندە دەکرا بۆ نێوچەی زۆنگاوەکانی خوارووی عێراق، وەك چیایش و هۆری حەممار و تەرِرِابە و مدەینە و زوبێر و ئەو شوێنانە و، منیش لەم بگرەوبەردەیەدا، بەر زوبێر کەوتم، یان بێژم زوبێر بەر من کەوت.

ئێستە بە پێویستی دەزانم، بەر لەوەی باسی هەوڵ و تەقەلام لەم رووەوە لە زوبێر بکەم، چیرۆکی کارکردنم لەوەپێش، واتە لە کەرکووك بیگێرِمەوە چۆنکە لە کەرکووکەوە فرِێدرامە زوبێر.

دامەزرانم لە کەرکووك، پاش تەواوکردنی خوێندن لە بەشی فیزیکی کۆلێجی پەروەردە (كلية التربية) لە زانستگەی بەغدا، لەسەر داخوازیی خۆم بوو، بە ئامانجی خزمەتکردنی قوتابیی کورد. بەڵام بەداخەوە، هەر تەنێ دوو ساڵ هێشتیان لە کەرکووك بمێنمەوە. ساڵی یەکەم، لە قوتابخانەی موسەللا و رۆژاوا (غربية) و ساڵی دووەم، لە موسللا و رۆژهەڵات (شرقية) و، بە ئێوارانیش لە قوتابخانەی دوانێوەندیی ئەهلیی عەلی حیکمەت موبارەك (برای مەتحەت موبارەکی باوکی دوکتۆر ئومێد) کە بەرامبەر چایخانەی مەجیدیە بوو، وانەکانی فیزیك و ماتماتیکم دەگوتنەوە.خانووی قوتابخانەی رۆژاوا هەر خۆی بۆ قوتابخانە دروستکرابوو، گۆڕەپانێکی یەکجار گەورەی هەبوو، سالۆنەکانی فراوان و، ژمارەی مامۆستاکان و قوتابیەکانی لە چاو قوتابخانەکانی دیکەدا زۆرتربوو. بەڕێوەبەری قۆابخانەکە، مامۆستا مووسا سەمەدی هەولێری زاوای عەونی یۆسف بوو، کە لەسەردەمی قوتابێتیم دا لە قوتابخانەی دوانێوەندیی سلێمانی، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان بوو. مامۆستا فازیل عیرفان کە لە بنەماڵەی رۆشنبیری بە نێوبانگ جەمالی عیرفان بوو، کاتێك لە سلێمانی قوتابی بووم، مامۆستای زمانی ئینگلیزیمان بوو، بەڵام لەپڕ لەسەر کار لابرا و، پاش ماوەیەك گەڕاندبوویانەوە بۆ سەر کار و، ئەو دەمە لە قوتابخانەی رۆژاوا هەڤالمامۆستا بووین. قوتابخانەی رۆژهەڵات، لە خانوویەکی تازە و گەورەدا بوو، بەڕێوەبەرەکەی مامۆستا جەبار تۆما بوو، کە دیانێکی خەلکی قەلای کەرکووك بوو. مامۆستا تۆما بەرتیلخۆرێکی وابوو، پیالە و ژێرپیالەیەکیشی بە بەرتیل وەردەگرت. تەنانەت جارێکیان قوتابییەك مەڕێکی بە دیاری هێنا بوو بۆی، مەڕەکە لە باخی قوتابخانەکەدا هەر باعە باعی بوو. مامۆستا ئیحسان عەبدولحەمید، کە خەڵکی گەڕەکی ئیمام قاسم و، یەکێك بوو لەو هەشت

ماموستایەی پاش کودەتای عەبدولکەریم قاسم، واژۆ (ئیمزا) ی بیرخەرەوەکەمانی کرد، بۆ داخوازیی مافی خوێندەواری و رۆشەنبیریی کوردی، ماموستای زمانی عەرەبی بوو لەوێ.[2] قوتابخانەی موسەللا، لە خانوویەکی کۆنی بچووکی بەکرێگیراودا بوو، گۆڕەپانی یاریی نەبوو. ژووری ماموستایەکانی 3 مەترە دووجا بوو. تەویلەیەکی بێپەنجەرەشی هەبوو، کە دوایی بە پارەی خۆم کارەڤام هانی بۆی و، گەلێك دۆلاب و رەفەم بۆ کڕی و، ژمارەیەکی باش ئامێر و کەرەسەی کیمیا و فیزیکم بۆ پەیدا کرد و، کردم بە لابۆر (مختبر) ی فیزیك وکیمیا و، نێوی شتەکانم بە کوردیی لاتینی لەسەر نووسین. شێخ ئەحمەدی شێخ رەئووفی نەقیب، هاوڕێی قوتابخانە و منداڵیم لە سلێمانی، ئەو ساڵە ئەفسەری "ئیحتیات" بوو لە تیپی (فیرقە) کەرکووك و، جاروبار دەهات بۆ سەردانم بۆ قوتابخانەی موسەللا و، کە لابۆرەکەی بەو شێوەیە دەبینی، گەشکەی دەکرد لە خۆشیاندا و، ئێستەش هەر باسی دەکات. بەڕێوەبەری قوتابخانەی موسەللا، سالی یەکەمی کارکردنم لەوێ، مووسلاوییەك بوو، نێوی یونس الاحمر بوو. کابرایەکی زۆر سەیر بوو، دانووی لەگەل هیچ کەسێك نەدەکولا. کە لە مووسڵ ماموستا بوو بوو،ناخۆشییەك کەوتبووە نێوان وی و ماموستایەکی دیکەی هەڤالی کە نێوی یعقوب الاخچر بوو. ماموستا یۆنسە سۆر، ئێوارەیەکیان چووبووە سەر ماڵی ئەو ماموستا یەعقوبە کەسکە و، دەرگەی ماڵەکەی دابووە بەر بەرد. یەعقوبیش بۆی دەرپەڕیبوو، و لەوەوە بووبوو بە شەڕە بەرد و، لە ئەنجامی ئەوەدا چەند دانێکی یەعقوب شکابوو، یۆنس خۆشی بریندار بووبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو بە پەلاماردەر دانرابوو، بە فەرمانی بەڕێوبەرێتی لە مووسڵ، گوازرابووەوە کەربەلا و، ئەوجا بە تکا لە کاربەدەستی وەزارەت عەبلۆەمیر عەترە ناربوویان بۆ بەسرە و، لە

بەسرەش بەزمێکی لەو جۆرەی قەوماندبوو، ئێدی ڕەوانەی قوتابخانەی ئێمەیان کردبوو لە گەڕەکی موسەللای کەرکووك.

هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتمە کەرکووك، چوومە بەڕێوەبەرێتیی زانیاری و، فەرمانەکەی وەزارەتم برد بۆیان، لەوێ نامەیەکیان دایە دەستم و گوتیان بیبە بۆ بەڕێوەبەری قوتابخانەی موسەللا، کە چووم بەڕێوەبەر لەوێ نەبوو، مامۆستایەك لەوێ بوو، کە دوایی بووینە دوو هاوڕێیی زۆر نێزیکی یەك. ئەو مامۆستایە نێوی مووسا نووح بوو، خەڵکی ئەلقۆش بوو، بیروڕایەکی پێشکەوتنخوازانە و مرۆڤدۆستانەی هەبوو. لە کۆلێژی بازرگانی و ئابووری لە بەغدا دەرچووبوو. بەهۆی وییەوە چەند ئەلقۆشییەکی دیکەم ناسی کە لە کۆمپانیای IPC لە کەرکووك کاریاندەکرد و، پاش کودەتای قاسم بوونە نوێنەرانی کرێکاران، لەوانە عبدالرحیم کە لەسەردەمی قاسمدا بوو بە نوێنەری سانديکاى کرێکارانی عێراق.

مووسا نووح گوتی: "بەڕێوەبەرێکی نوێمان هەیە، عارەبی مووسڵە و نێوی یونس الاحمرە و تازە نێردراوە بۆ ئێرە، بەر لەو، بەڕێوەبەرێکی دیکەمان هەبوو نێوی جەلال ئەورەحمان بوو، هەولێری بوو، پیاوێکی زۆر باش بوو، لەبەر چالاکیی رامیاری ڕەهەندەی ئێرە کرابوو، بەڵام بەوەش وازیاننەهێنا لێی، دەریانکرد".

مووسا نووح گوتی: "بەڕێوەبەری تازە یونس الاحمر، ئەورۆ کەمێك ناساخ بوو، چووە ماڵەوە، بەڵام گوتی: کە مامۆستا تازەکە (واتە ئەز) هات، بیهێنە ماڵەوە بۆ لام". گوتم: "باشە". پێکەوە چووینە ماڵی یونس الاحمر لە گەڕەکی شاترلۆ.

بەڕێوەبەری قوتابخانە، لەگەڵ منداڵێکی 9ـ10 ساڵانە، لە خانوویەکی گچکەدا دەژیا. وەك دوایی زانیمان، ژنەکەی تەلاقداوەو، لەگەڵ کوڕە زاڕۆکەکەی پێکەوە دەژین. پاش بە خێرهاتن، چوو 3 پیاڵە چایی هێنا، یەکێکی خستە بەردەمی من و یەکێك بەردەمی مووسا نووح و ئەوی دیکەشی خستە نێوان خۆی و منداڵەکەی و،

ئەوجا باوك و كوڕ، هەر یەكە بە نۆرە، فرێكیان لە پیاڵە چاییەكە دەدا. ئەم دیمەنە بەلای منیش و مووسا نووحیشەوە زۆر سەیر بوو، بە دوو كەس پیاڵەیەك چایی بخۆنەوە، كە ئەو زەمانە، چاییەك لە چایخانە هەرەباشەكانی كەركووك بە دە فلس بوو.

چەند دەمژمێرێك لە ماڵی بەڕێوەبەر ماینەوە و، باسێكی دوورودرێژی خۆی كرد و، گوتی ئەو وەك بەڕێوەبەری قوتابخانە نەهاتووە بۆ كەركووك، بەلكو وەك چاكساز (مُصلِحْ) و، دەیەوێ لە قوتابخانەدا چاكسازی بكات، بەڵام مروڤی كەر و گەوج زۆرن و، لە مەبەستی وی ناگەن.

كات پاییز بوو، بەرەبەرە تاریك داهات، بەڵام بەڕێوەبەر چرای كارڤای دانەگیرساند، بەلكو رادیۆیەكەی خستەكار، كە گڵۆپەكەی رۆشناییەكی كەمی دەدایەوە و، لەوەدا گوتی: "پێویستمان بە گڵۆپداگیرساندن نییە" و، بە عەرەبییە مووسلاویانەكەی گوتی: "هێكـذ یكون ئلجەو شاعیغی" (سەرنج: ئەوانەی لە مووسڵ بە عەرەبی قسە دەكەن، دەنگی رێ (ر) دەكەن بە غێ (غ)، بە "شاعری" دەبێژن "شاعیغی").

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو كە نەیدەتوانی خواردن لە دەفرێكدا بخوا كە پڕ بێ، دەبوو تێكە تێكە بیخستایە سەر دەفرەكە و ئەوجا بیخواردایە. جارێكیان قوتابخانەكەمان سەیرانێكی رێكخست، هەر كەسە و شتێكی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بەڵام ئەو هیچی لەگەڵ خۆی نەهێنابوو. كە خواردنمان كردە سەر دەفرێك بۆی، گوتی: ناتوانم بەو جۆرە بیخۆم "پارووییەكەم بدەنێ"، "اعطونی لیقمي" لیقمی واتە: لُقْمة.

لە هەموو قوتابخانە نێوەندییەكانی كەركووكدا، ژمارەیەكی هەستپێكراو مامۆستای عەرەبی مووسڵ و تكریت هەبوو، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری

قوتابیەکانی ئەو سێ قوتابخانەیەی لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا کە وانەم دەگوتەوە تێیاندا، کورد و ترکمان بوون، تاکوتەرە،عەرەبیش هەبوو سا یان کوڕی فەرمانبەرێك بوو گوازرابووەوە بۆ کەرکووك، یان منداڵی عارەبێکی خەلکی حەویجە بوو. تاکوتەرەش قوتابیی دیان (ئاسووری و ئەرمەنی و تلکێفی) هەبوون. کوردە کەرکووکیەکان و ترکمانەکان زمانی یەکدیان دەزانی و قسەیاندەکرد پێی. لەبەر ئەوە هەوڵمدەدا جاروبار، لە کاتی وانە گوتنەوەدا، زمانی کوردی بەکاربهێنم، لە کاتێکدا کە زمانی کوردی فەرمی نەبوو، ئەمەش نەبەدڵی مامۆستا عەرەبە مووسڵاوی و تکریتیەکان بوو، کە بەسەرزاری، خۆیان بە دۆستی ترکمانەکان پیشاندەداو، نە بە دڵی ئەو ترکمانانەش بوو کە ئامانجیان تەنێ دوژمنایەتیکردنی کوردە، نەك هەوڵدان بۆ هێنانەدەستی مافی گەلی بەشخوراوی ترکمان، کە ئەوەش تەنێ بە هاوکاریکردنی کورد و ترکمان دەستدەکەوێ، نەك دوژمنایەتیی یەکدی. لە قوتابخانەی موسللا، بێجگە لە یۆنسە سۆر، کە عارەبی مووسل بوو، مامۆستایەکی دیکەی عارەبی موسل و، عارەبێکی تکریتی لێبوو، نێوی فاضل الساقي و، یەکجار کۆنەپەرست و پاشکەوتنخواز بوو، هەروەها عارەبێکی میسریشی لێبوو، نێوی قدری امین بوو، کە دەیگوت: "لە فەلەستین شەڕی کردووە و لەشکری دوژمنی بەزاندووە" (حاربت في فلسطين وقهرت گێش "جيش" العدو)[3]. بەرامبەر بەم عارەبانە، ئێمە چوار مامۆستای کورد بووین: ئەورەحمان رەزا کە خەڵکی کەرکووك و مووسا نووح کە ئەلقوشی بوو، خۆی بە کورد دەزانی و، سوبحی کاکەیی کە مامۆستای وەرزش بوو و، ئەز. تاکە یەك مامۆستای ترکمانیش لە موسەللا هەبوو. جاروباریش مامۆستا فەتاح دۆغرەمەچی هەولێری، لە نێوان موسەللا و رۆژاوادا هاتوچووی دەکرد، کە هەتا کودەتای قاسم، تۆرانییەکی یەکجار توندوتێژ بوو، ئەوجا بوو بە کورد و کۆمۆنیستێکی

توندوتیژتر.[4] دیاره بازرگانیکردن به هەر نێویکەوە بکرێ، هەر وەك یەکە، تۆرانێتی بێ، یان کۆمۆنیستی، یان شتێکی دی. فەتاح دۆغرەمەچیم لەو کاتەوە دەناسی کە خوێندکار بووین لە زانستگەی بەغدا، ئەو لە بەشی ئینگلیزی بوو. سیخوڕیی دەکرد بەسەر خوێندکارە کوردەکانەوە بۆ تەحسین ئیبراهیم، کە کابرایەکی تۆرانی و زۆر دوژمنی کورد و، دژی مافی ڕەوای خوێندکاران بوو. بەڵام لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی لە زانستگەی بەغدا تۆرانێتی بکات، خۆی وەکو ناسیۆنالیستێکی عەرەب پێشاندەدا و، زۆڕناژەنیی بۆ بنەماڵەی شا فەیسەل دەکرد و، بەرامبەر بەوە کرابوو بە ڕاگری کۆلێجەکەمان (کۆلێژی پەروەردە)، ئەگەرچی تەنێ باوەڕنامەی بەکالۆریۆسی لە کیمیادا هەبوو. لە بیرمە، بە بۆنەی وتوویژ لە نێوان عێراق و ڕژێمی ترك، لە بارەی پەیمانی بەغداوە، شاندێکی ترك هاتە بەغدا، تەحسین ئیبراهیم وەرگێڕی زاری ترکی بوو. دەسەڵاتی ئەم تەحسینە هێندە زۆر بوو، مامۆستایەکی جوولەکە، کە نێوی نەسیم عەزرا نەسیم بوو، و لە کیمیادا ماجستێری لە ئەمریکا وەدەستهێنابوو، پەرتۆکێکی کیمیای بە عەرەبی نووسیبوو، ئەو تەحسینە نێوی خۆی خستبووە سەری، لە تەنیشت خاوەنی ڕاستەقینەیەوە. نەسیمیش لەبەر ئەوەی جوولەکەیەکی بێدەسەلات بوو و، بەتەمای کۆچکردن بوو بۆ ئیسرائیل، نەیتوانی بڵێ "لەل". نەسیم خۆی ئەمەی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گێڕایەوە بۆم. فەتاح دۆغرەمەچی پیاوی ئەم تەحسینە بوو.

بەڕێوەبەری قوتابخانەی موسەللا یونس الاحمر، زۆر لە دژی قوتابییەکان بوو، دەیویست جۆرە دیکتاتۆرێتیەك بنوێنێ بەسەریاندا کە مامۆستا مووسا نووح و ئەز، کە لە لیژنەی کۆنترۆل (أنضباط) دا بووین لە دژی دەوێستیاین. بەڕێوەبەریش، بە پشتی بەڕێوەبەری زانیاری لە کەرکووك، کە ئەویش عارەبێکی

مووسڵ بوو، کەوتە راپۆرت نووسین لە دژمان و، هەردووکمانی بە بلاوکردنەوەی هەستی نارەزایی لە دژی حکومەت و، منی بە بەکارهێنانی زمانی نافەرمی (کوردی) لە پۆلی قوتابخانەدا تۆمەتبارکرد. بەم بۆنەیەوە، لە بەغداوە پشکنەرێك بۆ لێکۆڵینەوە لەم شکاتە نێردرا بۆ کەرکووك. ئەو پشکنەرە خەلکی مووسڵ بوو، نێوی عەبدوللا بوو، پاشنێوەکەیم لە بیر نەماوە. بەرێکەوت، بەرێوەبەری قوتابخانەی موسەللا، یۆنسە سۆر، لەگەڵ ئەو عەبدوللایەش، لەوەپێش هەرایەکی بووبوو. ئەو رۆژەی کە گوتیان پشکنەر دەگاتە کەرکووك، یۆنسە سۆر گوتی: "ئەو کابرایە لە مووسڵ بە "عەبۆل حمار" (واتە: عەبۆلە کەرە) بە نێوبانگە". کە ئەوەمان لێبیست، هەر ئەو دەمە، لەگەڵ مووسا نووح قسەمانکرد بەیەك، کە ئێوارێ بچین بۆ ئەو هوتێلەی لێیدابەزیوە و، خۆمانی پێشکێش بکەین و، لە راستیی کێشەکەی بگەیەنین. کە چووینە لای، باسی ئەوەمان کرد بۆی کە قوتابییەکان زمانی دایکیان عەرەبی نییە و، ئەز وەك مامۆستا ناچار دەبم، جاروبار زمانی کوردیش بەکار بهێنم. گوتی: "هیچ خەمناکات، مەبەست تێگەیشتنی بابەتەکەیە". کە کەوتینە باسی شێوەی بەرێوەبردنی قوتابخانە لە لایەن یونس الاحمرەوە، بۆمان دەرکەوت کە پشکنەر دەمێکە دەیناسێ. ئەوجا پێمانگوت "باوەر بکە جەنابتان هێشتا نەگەیشتبوونە کەرکووك، ئەو قسەی ناشرینی بە ئێوە گوت، کە نامانەوێ وشەکانی دووبارە بکەینەوە". پاش ئەوەی، بۆ سبەینێ لە قوتابخانە، لە گەڵ هەرسێکمان کۆبووەوە و، باش تێگەیشت کە ئێمە ئاژاوەگێر و گێرەشێوێن نین. ئەوجا گەرایەوە بەغدا و، پاش ماوەیەك یونس الاحمر گوازرایەوە بۆ شارێکی دیکە[5] و، دوای وی، عوسمان قۆجە قەساب، بوو بە بەرێوەبەری قوتابخانەی موسەللا.

عوسمان قۆجە ("قۆجە" لە "گۆجە"دوە هاتووە، لە "خواجە" دوە نەهاتووە) هەولێری بوو. لە هەولێر دەستكاریی نمرەی ئەو قوتابییانەی كردبوو كە منداڵی ماڵە ئاغاكان و دەوڵەمەندەكان بوون و، بەو جۆرە بە دزیی مامۆستایەكانەوە دەریچوواندبوون. چەند مامۆستایەك هەستیان بەوە كردبوو، و لە نێو خەڵكدا باسیان كردبوو، ئەوە بووبوو بە هۆی ئەوەی عوسمان قوجە بكەوێتە بەر بریاری دەركردن، بەڵام بەسەر دەستوپێی عێزەدینی مەلا بچكۆل (مەلا ئەفەندی) دا كەوتبوو، كە ئەو دەمە دەستی لە حكومەتدا دەڕۆیی، لەبەر ئەوە، دەریاننەكرد، بەڵام وەك سزادان ناردیانە قوتابخانەی موسەللا.

ئەز، عوسمان قۆجەم نەدەناسی. بەڕێكەوت، بەر لەوەی بگاتە كەركووك، رۆژێكیان چاوم بە شەمسەدین مفتی كەوت و، باسی عوسمان قۆجەم پرسی لێی، بیروڕای وی بەرامبەری زۆر خراپ بوو. هەر ئەو رۆژەش لە چایخانەی مەجیدیەی كەركووك، مامۆستایەكی خەلكی هەولێرم ناسی كە تازە گوازرابووە بۆ قوتابخانەی موسەللا، كە پێمگوت بەڕێوەبەرێكی تازە دێ بۆمان نێوی عوسمان قوجەیە، شین و مۆر هەڵگەڕا و گوتی: بەڕاستتە؟ گوتم خۆ گاڵتە ناكەم لە گەڵت. گوتی: "باوەڕ بكە، ئەگەر بە جارەك دەركراوم و بێ نان ماوم، نایەمە قوتابخانەیەك عوسمان قۆجەی تێدا بێت". نەهات و نەهات و نەهات و، ناشزانم لە كوێ گیرسایەوە. بەداخەوە، ناوەكەیم لەبیرنەماوە.

عوسمان قۆجە كابرایەكی دەسەڵاتپەرست و ماستاوكەر بوو. تا هەندازەیەكیش دەستی گەوجێتیی هەبوو. لە گەڵ هەڤاڵمامۆستا ئەوڕەحمان رەزا، سەرنجی ئەوەمان دابوو، هەر كاتێك قوتابییەك بهاتایە لای و، جلكی شڕودڕی لەبەردا بووایە، ئەو بە كوردی قسەی دەكرد لەگەڵی، خۆ ئەگەر جلكێكی دەوڵەمەندانە و رێكوپێكی لەبەردا بووایە، بە تركمانی قسەیدەكرد لە گەڵی. جا لەبەر ئەوەی

کەرکووکیەکان، بەزۆری، هەردوو زمانەکە دەزانن، عوسمان قۆجە، بە هەر زمانێك قسەیبکردایە، بەو زمانە وەرامی وەردەگرتەوە. رۆژێکیان لەگەڵ مامۆستا ئەورەحمان، لە ژوورەکەی عوسمان قۆجە دانیشتبووین، کە کورێکی گەنجی شیکپۆش هات، لە گەڵ خزمەتکارێك لە پشتەوە و، هەر لە دەرگەوە دەرکەوت، دەستبەجێ عوسمان قۆجە بە ترکمانی گوتی: بیرون، ئۆغلم.. (فەرموو کورِم). کورەکە بە کوردی گوتی: "مامۆستا ترکمانی نازانم". ئێدی ئەز و مامۆستا ئەورەحمان، دەستمانکرد بە پێکەنین، بەڵام وامان پێشاندا کە لە نێوخۆماندا بە شتێکی دیکە پێدەکەنین. کە کورەکە رۆیشت، عوسمان قۆجە ویستی بزانی بەچی پێکەنیوین. ئەوجا گوتمان: "مامۆستا ئەو چییە تۆ هەر کەسێك جلکی خراپی لەبەردابێ بەلای تۆوە کوردە و، ئەوی جلکی باشی لەبەردابێ ترکمانە. خۆ ئەگەر بەو حسێبە بێ، خۆشت دەبیتە ترکمان، گوتی: "هەی غەددارینە! ئەوە کوو ئەوەتان زانییە؟".

لە هاوینی ساڵی 1956 دا، چەند مانگێکی کەم بەر لەوەی شێخ مەحموودی بەرزنجی (حەفید)، کتوپڕ لە داریکەلی نەخۆشبکەوێ و، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، لە نەخۆشخانەیەکی بەغدا کۆچیدوایی بکا، لەگەڵ دوو هاورێی خۆشەویستم، شێخ ئەحمەدی کورِی شێخ رەئووفی نەقیب و مامۆستا عەزیز محەمەد، چووینە خزمەت شێخ مەحموود. بەهۆی ئەو سەرەدانە و، لە رێی دانوستاندنی راستەوخۆوە لەگەڵ کۆنە شای کوردستان، راستینە و درۆیینەی هێندەك زانیاریی مێژوویی رۆنبوونەوە لام، کە پێوەندییان بە سەردەمی جەنگی یەکەمیی جیهانی و، کەینوبەینی کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیاوە هەبوو، دژ بە دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ. ئەمەش دەستەوارەی ئاگاداریی منی لەبارەی دیرۆکی کوردەوە فراوانترکرد. کورتەیەکی ئەو سەردانە لە مانگنامەی

"سەکۆ"، ژ 14، چاپی بەرلین، کانوونی یەکەمی 1997 و، هەفتەنامەی "میدیا" ژ 237، چاپی هەولێر 2003/10/1 و گۆڤاری کۆنگرە ژ 20 ـ جۆزەردانی 2001 و، کۆبەرهەم ژمارە (6)، سلێمانی 2006، ل 66ـ95 دا بڵاوکراوەتەوە.

لە 26.7.1956 دا جەمال عەبدولناسر لە میسر کەناڵی سوێسی لەدەست کومپانیا بیانییەکان دەرهێنا و، خستیە سەر سامانی (دەولەت) میسر. ئەم کردارە، بەریتانیا و فەڕەنسای زۆر تووڕە کرد و هەردووکیان لەگەڵ ئیسرائیل رێکەوتن و پێکەوە پەلاماری میسریان دا.

ئەوەی راستی بێ، هیچ کاتێك باوەڕم بەوە نەبووە کە ناسر پشتی کورد دەگرێ بۆ سەربەخۆیی کوردستان و هیچ چاوەڕوانی ئەوەشم نەکردووە لێی، بەڵام بە لێکۆڵینەوەی خۆم لە کار و کردار و هەڵوێستەکانی، دەمزانی سووت وەردەگیرێ لێی بۆ گەرمکردن و پێشاندانی کێشەی کورد، کە کورد لەو رۆژەدا لە هیچ کونێکەوە دیارنەبوو و، لە هەموو ئاسماندا ئەستێرەیەکی نەبوو. ناسر، بەربەرەکانیی پەیمانی بەغدای دەکرد، کە ئەندامەکانی رژێمی ترك و ئێران و عێراق و بەریتانیا و پاکستان بوون و، ئەمەش بە بەرژەوەندیی کورد بوو. ناسر، گەلێك قانوونی دەرکرد کە لە بەرژەوەندیی چینی هەژار و دەستکورتی میسر بوو. ئەمەش لەگەڵ باوەڕی سۆسیالیستانەی من رێکبوو. لە بەر ئەوە، لە هاوینی 1956 دا پەساپۆرتێکم دەرهێنا و، بە بیانووی گۆڕینی هەوا و گەشتوگوزارەوە چووم بۆ سووریا و لوبنان و، لە دیمەشق ماوەی دە رۆژێك، شەو و رۆژ، لە هۆتێلی "فلسطين وشرق الاردن" کە خاوەنەکەی "ئەبو دیاب" کوردێکی کۆمۆنیستی خەلکی گەڕەکی "تاخی کوردان" (حي الاكراد) بوو، نامیلکەیەکم نووسی، لە ژێر نێوی "كفاح الاكراد" (خەباتی کورد) دا و، پێشکێشمکرد بە جەمال عەبدولناسر. بەهۆی رەوانشاد ئاپۆ عوسمان سەبرییەوە، چاپخانەی کەریم کەرەمم ناسکرد و،

به دزییەوە، هەزار دانەیەکم لەسەر ئەرکی خۆم چاپکرد و، لەگەڵ رەوشەن بەدرخان و دوکتۆر عێزەدین مستەفا رەسوول، کە لەو کاتەدا لە دیمەشق بوو، بە ئۆتۆموبێل بردمانە بێرووت و، لەوێوە بە پۆستە، بۆ گەلێك رۆژنامە و رامیار و کەسایەتیی هەموو دەولەتە عەرەبییەکانمان نارد و، چەند رۆژێك دوای ئەوە، لە ماڵی رەوشەن بەدرخان، چاوم بە پارێزەر عەزیز شەریف کەوت و، باسی ئەو نامیلکەیەم کرد بۆی، گوتی رەوشەن خان دانەیەکی داوەتی و خوێندیەتیەوە. دەشمزانی کە لە گەڵ ناسر ناسیاوەتیی هەیە، تکامکرد لێی کە چوو بۆ لای ناسر، لە بارەی ئەو نامیلکەیەوە، کە بۆ ناسر خۆشی چووە، قسەبکات لەگەڵی و، پێیڕابگەیەنێ کە دانانی پرۆگرامێك بە زمانی کوردی لە رادیۆی قاهیرە، دۆستایەتیی کورد و عەرەب بەهێزدەکات. بەڵێنی داپێم. پاش گەڕانەوەم بۆ عێراق، رۆژێکیان لە بەغدا، نەجمەدین عەونی، برای رەوانشاد محەمەد عەلی عەونی (باوکی دورییەخان) کە میسری بوو و، لە بەغدا دەژیا و، بەهۆی دوکانی (ئوستاد) بەشیر موشیرەوە، یەکدیمان دەناسی، پێوەندیکرد پێمەوە و، گوتی سەفیری میسر دەیەوێ بتبینێ. دوو جار چاوم بە سەفیری میسر لە بەغدا کەوت، کە ئەوەش باسێکە بۆخۆی. ئەوجا ناسر لە ساڵی 1957 دا، بەشی کوردی لە رادیۆی قاهیرە دانا، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی رژێمی ئێرانیش لە تاران پرۆگرامی کوردی دابنێ و رژێمی عێراقیش رێ بە دەرچوونی چەند گۆڤارێکی کوردی بداتـئەوەش دەبێ بێژم پاش گەڕانەوەم لە سووریا، دوو دانەم لەو نامیلکە گچکەیە (کفاح الاکراد) لە نێو پێلاوەکانمدا هانیەوە بۆ عێراق، دانەیەکیم دا بە ئەحمەد نەقیب کە ئەو ـ وەك خۆی ئێستەش باسی دەکات ـ بەو نامیلکەیە ئەندامی بۆ "پارتی" پەیدا دەکرد. لە لوبنانیش کەسایەتیی ئاشووری، یۆسف مەلەك م چاوپێکەوت، کە رۆژنامەی "الوجدان" ی بە عەرەبی و ئینگلیزی

دەردەکرد و، لۆبییەکی بۆ کورد و قوبروسی پێکهێنابوو، گەڵێك دەنگوباسی کوردستانم گەیاند پێی و، کە گەڕامەوە ولات، چەند جار، بە هۆی ژنێکی خزمییەوە، کە لە بەتاوینی بەغدا دەژیا، پارەم نارد بۆی وەك یارمەتی، دۆستایەتیمان لەڕێی نامەنووسینەوە بەهێزبوو. پاشان، رۆژنامەیەکی دیکەی دەرکرد بە نێوی "الحرية"، باشتر لە "الوجدان".

کە لە مانگی ئۆکتۆبەری 1956 دا و، کاتێك لە کەرکووك لە قوتابخانە خەریکی وانەگوتنەوە بووم، دەنگوباس بڵاوبووەوە کە لەشکری فەڕەنسا و بەریتانیا و ئیسرائیل پەلاماری میسریان داوە. ئەز، ئەو پەلامارەم بە دەستدرێژی و کردەوەیەکی ملهوڕانە دایە قەلەم و، لە نێو مامۆستاکان و قوتابییەکانیشدا باسمکرد. هەرچەندە رژێمی عێراق، بە ئاشکرا دژی ناسر نەبوو، بەڵام پشتیشی نەگرت و، پێوەندیی دیپلۆماسی، تەنێ لەگەڵ فەڕەنسا بڕی، نەك لەگەڵ بەریتانیا. لەمەوە خۆپێشاندانی جەماوەرانە لە بەغدا کەوتە سەر شەقامەکان، کە زۆربەیان خوێندکار و قوتابی بوون و، وەزارەتی زانیاریی ناچار ما، قوتابخانەکان و زانستگەی بەغدا دابخا بۆ ماوەی پتر لە مانگێك و، ئەز ژی لەو ماوەیەدا چوومە سلێمانی، چۆنکە کەسوکارم لەوێ بوون، بەڵام عوسمان قۆجە، کاتێك منی لە کەرکووك لە ماڵەوە نەدۆزیبووەوە، یەکسەر نامەیەکی بۆ بەڕێوەبەرێتیی زانیاری نووسیبوو  کە ناتوانێ پێوەندی بکا بە منەوە، چۆنکە "ڕوومکردووەتە شوێنێکی نادیار"، بە عەرەبی نووسیبووی: "لقد توجّه الى جهة مجهولة..." ئەوەشی دەزانی  کە لە کاتی پشووەکاندا دەچمە سلێمانی. ئەمە سەرنجی کاربەدەستانی وا ڕاکێشابوو، کە گوایە خەریکی کارێکی نهێنیم و، لەمەش خراپتر ئەوەبوو  کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی رۆژهەلات جەبار تۆما  دوژمنایەتییەکی خەستی لەگەڵ هەڤالمامۆستایەك هەبوو کە نێوی ساقی باقی بوو. ساقی ترکمانێکی شیعەی

خەڵکی تسعین بوو، وەك من، مامۆستای ماتماتیك و فیزیك بوو. لە بابەتیی خۆیدا بەڕاستی پسپۆڕ بوو، مرۆڤێکی سادە و دڵپاك بوو، لەگەڵ یەك هاودەنگیمان زۆر خۆشبوو. جەبار تۆما، خزمێکی لە قۆتابخانەی رۆژهەڵاتدا دەیخوێند، کە نەك هەر لە ماتماتیك، بەڵکو لە هەموو بابەتێکدا یەکجار کۆڵ و کز بوو. ساقی چەند ساڵێك بوو لەو قوتابخانەیە مامۆستا بوو، جەبار تۆمای باش ناسیبوو. کاتێك کە مامۆستاکان پرسیاری تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵیان دادەنا، دەبوو بیدەن بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، بەڵام ساقی باقی نەیدابوو بە جەبار تۆما، چۆنکە دەیگوت باوەڕم نییە پێی، کابرایەکی بەرتیلخۆرە و، لەوانەیە بیفرۆشێ. کە تاقیکردنەوەی کۆتایی، لە حوزەیرانی 1957 دا هاتەپێشەوە، ساقی و ئەز، پێکەوە پرسیارەکانی ماتماتیکی بەکالوریای پۆلی سییەمان دانا بەڵام نەماندایە دەست جەبار تۆما. جەبارە فەندی دەیویست بەهەموو جورێك خزمەکەی دەربچوێنێ، کە ساڵی پار، لەلای ساقی کەوتبوو. رۆژێك جەبار تۆما هەردووکمانی بانگکرد بۆ ژوورەکەی و گوتی: "راپۆرتی زۆر خراپ هەیە لە دژتان، ئەز دەتوانم یارمەتیتان بدەم، بەڵام ئێوەش دەبێ بەرامبەر ئەوە یارمەتیم بدەن". گوتمان: "چۆن؟" بە ئاشکرا گوتی دەبێ کوڕە خزمەکەی دەربچێ، چۆنکە ئەگەر ئەمساڵیش دەرنەچێ، لە قوتابخانە دەریدەکەن. گوتم: "باشە جارێ پێمان بڵێ راپۆرتی خراپی چی هەیە لەسەرمان؟" گوتی: "تۆ لە کەرکووك خەریکی هاندانی قوتابی و خەلکی لە دژی حکومەت و، لە لای خەڵك دەڵێیت: کورد زۆرلێکراون و، ئەم نەوتەی کەرکووك ئینگلیزەکان دەیبەن و کورد لێی بێبەشە. بێجگە لەوەش، لە پۆلی وانەگوتنەوەدا بە کوردی قسە دەکەیت". گوتم "دۆزی نەوت هیچ پێوەندییەکی بە قوتابخانەوە نییە و، ئەوە شتێکی دیکەیە". گوتی "نا، وانییە، کەرکووك شوێنێکی هەستدارە". پاشان گوتم: "ئەز بە عارەبی وانە دەڵێمەوە و، ئەگەر قوتابییەك تێنەگەییشت،

ئەوا بە کوردی تێیدەگەیەنم. مەبەست تێگەیشتنە. قوتابی هیچ گوناهێکی نییە کە زمانی باوك و دایکی عەرەبی نەبێ". بێجگە لەوەش گوتی: "تۆ گوتووتە جەمال عەبدولناسر خەباتکارێکی گەورەیە و نووری سەعید پیاوی ئینگلیزە" گوتم: "لای کێ گوتوومە؟" گوتی: "پێت نالێم". پاش ئەوەش گوتی: "بە مامۆستا سامی شاکرت گوتووە "گووی مەلا مستەفا مەخۆ، مەلا مستەفا گەورەی کوردە".[6] گوتم: "سامی مامۆستای جوگرافیایە، لە پۆلی قوتابخانەدا چەند جارێك جنێوی داوە بە مەلا مستەفا، باشە، جنێودان بە مەلا مستەفا بەشێکە لە پرۆگرامی خوێندنی جوگرافیا؟". لە ئەنجامی وتووێژدا گوتم: "پێشنیازێکم هەیە، ئەگەر مامۆستا ساقی رازی بێ، ژمارەیەکی کەم قوتابی هەن کە لە ئەزمووندا دەرنەچوون، با ئەوانە هەموویان جارێکی دی تاقییان بکەینەوە، ئەگەر دەرچوون و خزمەکەی تۆش لەوانەبوو، ئەوا کێشەکە بە پێی ویژدان چارەسەر دەبێ". جەبار تۆما گوتی: "بیست جاریش تاقیکردنەوە بکەیتەوە دەرناچێ. ئەو کوڕە نەخۆشە". گوتمان: "باشە با بچێتە لای دوکتۆر، خۆ ئێمە دوکتۆر نین". گوتی: "ئێوە دەبێ بزانن کە ئەو کوڕە نەخۆشی ئاسما (هەناسەتەنگی) ی هەیە و، ئەوەش هەر ئەو نەخۆشییەیە کە تووشی خاوەن شکۆ شا فەیسەل بووە، لەبەر ئەوە دەبێ بەهەموو جۆرێك دەریبچێنن، لەبەر خاتری خاوەن شکۆ و، وەك رێزێك بۆ خاوەن شکۆ". راستییەکەی، ئێمە نەمانتوانی، وەك خێرێك بۆ خاوەن شکۆوبەبێ تازەکردنەوەی ئەزموون، نمرەی دەرچوونی بدەینێ، چۆنکە چەند کەسێکی دیکەش هەبوون کەوتبوون، ئێدی جەبار تۆما کەوتە دژایەتیی هەردووکمان، گوایە ئێمە دژی خاوەن شکۆ و سیستەمی شا فەرمانین.

لەو ماوەیەدا کە لە کەرکووك بووم، هەوڵمدا پێوەندییەکی باشم هەبێ، نەك تەنێ لەگەڵ قوتابییکان، بەلکو لەگەڵ کەسوکاریان و، زۆر تێکۆشام کە زمانی کوردی

شیرین بکەم لە لایان و، ژمارەیەکی زۆر لە قوتابییەکان فێری نووسینی کوردی بە لاتینی بکەم. لە بیرمە، دوو قوتابی، زۆر بە کوڵ و دڵەوە خەریکی فێربوون بوون. یەکێکیان عەلی عەسکەری و ئەوی دی، جەبار جەباری بوو، کە هەردووکیان لە کوردستاندا نێویان دەرکرد و، بوونە شەهیدی نیشتمان. هەردووکیان قوتابی بوون لە قوتابخانەی دوانێوەندیی کەرکووک کە مامۆستا فاتیح بەگ بەڕێوەبەری بوو، فاتیح بەگ ترکمانێکی ژیر و تێگەیشتوو بوو.[7]

هەر لە کەرکوک لە ساڵی 1956دا چەند بەرگێك فیزیك و جەبرم بە کوردی نووسییەوە. بەرگە جەبرەکەم بە ژمارەیەکی کەم بە رۆنیۆ، هەر لە 1956 دا چاپکرد و بلاۆمکردەوە بەسەر قوتابییاندا و، بەرگێکی فیزیکیشم لە ژێر نێوی "سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی مادده" دا لە کەرکووك تەواوکرد و، لە 1960 دا لە بەغدا لە چاپدا و، ئەوەشم هەر بە خۆڕایی بەسەر قوتابییاندا دابەشکرد. چیرۆکی "لالۆکەیم"یشم، هەر لە 1956 دا لە کەرکووك نووسی و، لە چاپخانەی کوردستان لە هەولێر لە چاپمدا. هەروەها "نووسینی کوردی بە لاتینی" م لە کەرکووك لە ساڵی 1956 دا نووسی و لە 1957 دا بلاۆکرایەوە. نامیلکەی "خوێندەواری بە زمانی کوردی" م لە ئابی 1957 دا لە کەرکووك تەواوکرد و، هەر لە 1957 دا لە بەغدا چاپی یەکەمی دەرچوو. هەڤاڵمامۆستای ئەوکاتە، دوکتۆر زەنوون پیریادی لە لاپەڕە 15ی ژمارەی 114ی ساڵی 1998ی گوڤاری "ڕەنگین" دا، زۆر بە وێژدانانە باسێکی ئەو تێکۆشانەم دەگێڕێتەوە. وتارەکە بەنێوی "یادێکی هاوڕێی دێرینم دوکتۆر جەمال نەبەز"ە.

ئەوەی شایانی باسە، کوردە دەستڕۆیشتووەکانی کەرکووك، زۆر سارد و سڕ و کەمتەر خەمبوونبۆ وێنە فازیل تالەبانی سەرۆکی شارەوانیی کەرکووك بوو، بەڵام لە رۆژنامەی "کەرکووك" دا کە شارەوانی دەریدەکرد، یەك دێڕ بە کوردی

نەدەنووسرا. کە لە پاییزی 1957 دا، لە عێراق سەرژمێرییەکی گشتی کرا و فۆرمەکان بەسەر خەلکی کەرکووکدا بلاوکرانەوە بۆ پڕکردنەوە، بە ترکمانی و عەرەبی نووسرابوون، بەلام بە کوردی نە نووسرابوون. لەم بارەیەوە وتارێکم نووسی لەژێر نێوی "بۆچی خراینە پشت گوێ؟" کە لە ژمارە 109ی رۆژی 30.9.1957 ی گۆڤاری "هەتاو" دا کە مامۆستا گیوی موکریانی لە هەولێر دەریدەکرد. هەروەها، لە ژمارە (1362)ی رۆژی 1957/9/26 ی رۆژنامەی "ژین" دا کە لە سلێمانی دەردەچوو، بلاوکرایەوە. لێرەدا دەبێ ئەوەش بێژم، کە مامۆستا گیو، لە هەموو ژمارەیەکی "هەتاو"، دە دانەی دەنارد بۆم کە بە خۆڕایی دەمدا بە خەلك، بەتایبەتی بە قوتابییەکان و، تکامدەکرد لێیان، کە خوێندیانەوە، بیدەن بە خەلکی دیکە. لێرەدا بە پێویستی دەزانم، یادێکی عومەر بێکەسیش بکەمەوە، کەوەك تاکە کەسێك لە کەرکووك کونەدۆکانەکەی کردبوو بە شوێنی فرۆشتنی پەرتۆکی کوردی.

هەر لە کەرکووك، لەو سەردەمەدا، برایم ئەحمەد و عومەر دەبابە لە گەڕەکی ئیمام قاسم دەژیان و، بە زۆری، بە ئێواران، لە مالی کاکەی حاجی مەحموود (باوکی نەوزاد کاکە) خەریکی دۆمینە کردبوون، هیچ جۆرە چالاکییەکی رامیاری، یان رۆشنبیرییان نەبوو، بە پێچەوانەی مام جەلالەوە، کە زووزوو هاتوچووی کەرکووکی دەکرد و، سەرەڕای ئەوەی، وەك من، لە بەهاری گەنجێتیدا بوو، بە چالاکی نێوی دەرکردبوو.

بەرەی سەر بە سوڤێت لە پەنجاکاندا، هەر چەند سال جارێك، جۆرە جێژنێکی سازدەکرد بۆ لاوان و خوێندکاران، بەنێوی "ڤێستیڤالی جیهانیی لاوان و خوێندکاران" ەوە، حیزبە کۆمۆنیستەکانی سەر بە سوڤێت لە ولاتانی بندەست و سەرمایەداری دا، کەسانێکیان دەستنیشاندەکرد بۆ بەشداریکردن. پارتی

کۆمونیستی عێراقیش، چەند کەسێکی دیاریدەکرد بۆ ئەو کارە، کە پاش هەراوزەنایەکی یەکجار زۆر، ئەندامێکی "پارتی"شی تێدەخرا و، ئەو شاندە دەبوو زۆر بە نهێنی لە عێراق دەربچێ و هەر بە نهێنیش بگەڕێتەوە. لەو ڤێستیڤالانەدا پرۆپاگەندە بۆ ئەوە دەکرا کە ئەو بەرەیەی کە نێویان نابوو "بەرەی سۆسیالیزم" بە سەرۆکایەتیی یەکێتیی سۆڤێت، خزمەتی "ئاشتیی جیهان و مافی گەلانی بندەست و ئازادی" دەکات و "بەرەی سەرمایەداریش" بە سەرۆکایەتیی ئەمریکا، هەوڵی "جەنگ هەڵگیرساندن و دیلکردنی گەلان و رووتاندنەوەی چینی کرێکار و جۆتکار" دەدات.

لە ساڵی 1956 دا، مام جەلال بە نێوی نهێنی حەمە مین (محمد أمین) ەوە، وەك لاوێکی کورد بەشداریی ئەو ڤێستیڤالەی کرد و، وتارێکیشی لەو ڤێستیڤالەدا بە عەرەبی خوێندەوە کە لە بەشی عەرەبیی رادیۆی موسکۆدا بلاّوکرایەوە و، خۆشم لە ماڵەوە لە کەرکووك گوێم لێبوو، باسی "ئاشتیی جیهان و دۆستایەتیی گەلان و برایەتیی کورد و عەرەب و بەشخوراویی کوردی لە لایەن ئیمپریالیزمەوە" کرد. کە گەڕایەوە ولات، رۆژێکیان لە کەرکووك، لە چایخانەیەکی شەقامی رێی وێستگەی شەمەندەفەر، پێکەوە چەند دەمژمێرێك دانیشتین و باسی ئەو سەفەرەی کرد و گوتی: "ئەوەی پێمکرا کردم، بۆ ئەوەی ئەوانەی لەو فێستیڤالەدا بەشداربوون، کورد و کێشەکەی بناسن، بەڵام باوەڕ بکە ئەو ولاّتانەی بەرەی رۆژهەلاّت، ئەو تەپڵ و زوڕنایە ناهێنن، کە بۆیان لێدەدرێ". ئەوجا گوتی: "با جارێ ئەمە هەر لەنێوان خۆماندا بێ چۆنکە ئێمە دۆستمان نییە". گوتم: "دەزانم دۆستمان نییە، بەلاّم ئایە سۆڤێت و بەرەی رۆژهەلاّت دۆستمانن؟". گوتی: "دەبێ هەوڵبدەین بیانکەین بە دۆست". گوتم: "باشە، ئایا ئەوان بۆ دۆستی وەك ئێمە دەگەڕێن؟ ئەگەر واشبێ بۆچی دەبێ هەر هەوڵی دۆستایەتیی لایەك بدەین؟

با له هەموو لایەکەوە خەریك بین. ئەوەتا داگیرکەرانی کوردستان، لای ئەمریکا و بەرەی رۆژاوا دەڵێن: کورد هەموو کۆمۆنیست و نۆکەری سوڤێتن".

له کەرکووك، گەڵێك له سیاسەتکارانی کورد دەهاتن بۆ لام، جارێکیان شەهید ئەوڕەحمانی قاسملۆ، به جلکی کوردی و کلاش له پێ، هات بۆ قوتابخانەی موسەللا بۆ لام و، پێکەوە چووینه دەرەوە و، خۆی به من، به نێوی "ئەنوەری" یەوە ناساند و، گوتی له سەر راسپێریی مامۆستا حەمه تۆفیق وردی هاتووە بۆ لام و، ئەندامی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێرانه و، دەیانەوێ رۆژنامەی "کوردستان" دەربکەنەوە و، پێویستییان به پارەیه و، دەبێ پارەکه بدرێ به مامۆستا وردی، ئەو دەیگەیەنێ پێیان. پاش ئەوەی یارمەتییەکی باشم بەهۆی مامۆستا وردییەوە نارد بۆیان، رۆژنامەی "کوردستان" یش جارێکی دی کەوتەوە گەڕ. وەك دوایی بۆم دەرکەوت، قاسملۆ به نێوی ئەنوەرییەوە، له دەوروبەری سلێمانی دەژیا. دووسێ ساڵێکیش لەوەبەر، که هێشتا له بەغدا دەمخوێند و جارێکیان شەمسەدین مفتی بردمییه ماڵەکەی خۆی که لەگەڵ عەبدوللای عەلی کانیمارانی به کرێیان گرتبوو و، کۆبوونەوەی حیزبییان تێیدا دەکرد و، مام جەلال و هەمزە عەبدوللاش سەرەدانی ئەوێیان دەکرد، ژنێکی گەنج و منداڵەکەیم دی، کەلەوێ بوون و، ژنەکه خواردنی دروست دەکرد. شەمسەدین گوتی ئەمه ژنی برادەرێکی کوردی خەلکی ئەودیوە، چیکیه، لێرە نێوی نەسرینە، مێردەکەی نێوی ئەوڕەحمانی قاسملۆوە. وادیاربوو، ئەوان مەسرەفی ماڵیان دەکرد و نەسرینیش وەك کابانی ماڵ.

پاش ئەوەی له هاوینی ساڵی 1956 دا و، له ماوەی گەشتەکەمدا بۆ سووریا و لوبنان، پێوەندیم به چەند نووسەر و هۆزان و رۆشنبیر و رامیاری کوردی رۆژاوا کرد، لەوانه ئاپۆ عوسمان سەبری و رەوشەن بەدرخان و قەدری جان و ئەحمەد

نامی و، باسی ڕێ و شوێنی هەوڵدان بۆ خزمەتکردن و پێشخستنی زمانی کوردیم کرد لە گەڵیان و، لە نامیلکەی "نووسینی کوردی بە لاتینی" دا (1957) نووسینێکی ئاپۆ عوسمان سەبریم بە دەستنووسی خۆی بە زینکۆگراف بلاوکردەوە، لە بارەی ڕێکەوتنمان بۆ چاککردن و بیرازکردنی ئەلفوبێی لاتینیی دەستکردی میر جەلادەت بەدرخان، لە هاوینی 1957 دا و، هەر بە بیانووی گەشتەوە، لە ڕێی خانەقین و خەسرەوی و قەسری شیرینەوە چوومە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئێران. لە کرماشان چاوم بە ڕۆشنبیری کورد فەتحعەلی حەیدەری زیواجۆیی کەوت، کە لەو ڕۆژانەدا دیوانی مەلا پەرێشانی کوردی لە چاپدابوو. لە سنەش چاوم بە ئایەتوللای مەردۆخ کەوت لە ماڵەکەی خۆی کە لەبەر دوکانەکان بوو. مەردۆخ، چەند ساڵێك لەوەبەر فەرهەنگێکی گەورەی کوردی ـ فارسی بڵاوکردبووەوە. ئەم دوو بەرێزە هەردووکیان زۆریان پێخۆشبوو کە هاووڵاتێکیان لە باشوورەوە دەچێتە سەرەدانیان و باسی زمانی کوردی دەکات لە گەڵیان و، بەڵێنیاندا کە لەسەر خزمەتی ئەم زمانە بڕۆن. لە هەردوو شارەکە گەلێك پەرتۆکخانە و پەرتۆکفرۆشیی گەڕام و چاوم بە چەند ڕۆشنبیرێکی دیکەی ئەو دوو شارە کەوت، یەکێك لەوانە خاوەنی پەرتۆکفرۆشیی غەریقی بوو لە سنە. کە گوتم: پەرتۆکی کوردیت هەیە؟ تەماشای دەموچاومی کرد و گوتی: جەنابتان لە کوێوە هاتوون؟ گوتم: "لەو دیوەوە". گوتی: "دەفەرموون دانیشن". چاییەکی بانگکرد بۆم و گوتی: "تۆ زۆر بەختیارتریت لە من کەوا بە ئازادی داوای پەرتۆکی کوردی دەکەیت. ئەو شتەی تۆ داوایدەکەیت لێرە باسی سەرە". لە سنەوە بە پاس کەوتمەڕێ بەرەو مەهاباد، بەڵام لە سەر سنووری شار دامیانبەزاند و پاش، ماوەیەکی دوورودرێژ ڕاگرتن و پرسیار و وەرام، گوتیان: بۆت نییە بچیتە نێو شار و گێڕامیانەوە دواوە. کە هاتمەوە سلێمانی، هەر لە هاوینی 1957 دا واتە: پەنجا

ساڵ لەمەوبەر لە رۆژنامەی "ژین" دا کە لە سلێمانی دەردەچو، وتارێکم نووسی لە ژێر نێوی "یاریکردن بە ئاگر" و بە توندی هەڵسوکەوتی زۆردارانە و هۆڤانەی رژێمی داگیرکەری ئێرانم لە رۆژهەلاتی کوردستاندا خستەڕوو.
بە تێپەڕبوونی کات، بە تەواوی ئاشکرا بوو بۆم کە سیخورەکانی رژێمی عێراق، لە گەلێك لاوە چاویان ئاڕاستەی من کردووە. رۆژێکیان، نەوزاد، کوڕی کاکەی حاجی مەحموود کە قوتابیی من بوو لە نێوەندیی موسەللا، گوتی خاڵی (مامۆستا حەمە تۆفیق وردی) ئەم بەیانییە لە بەغداوە گەیشتووەتە کەرکووك و، دەیەوێ چاوی پێمبکەوێ و دێ بۆ لام. گوتم باشە بەخێر بێ. کە چوومە پۆلی وانە گوتنەوە، بەردەست (فەڕاش) هەکە هات و گوتی: "یەکێك هاتووە و، دەیەوێ بتبینێ". پێموابوو، مامۆستا وردییە. بەڵام پیاوێك بوو نەناس. ئێستەش لەبیرمە بە کوردی گوتی: "محەمەد تۆفیقولوردی لای تۆیە؟"، لەبەر ئەوەی کاخەزێکی بە دەستەوە بوو، هەستمکرد نیازی باش نەبێ، گوتم نا. بۆچی خۆی گوتوویەتی دێ بۆ لای من؟ وەرامی نەدایەوە و رۆیشت، لە بەردەستەکەم پرسی ئەو پیاوە دەناسیت؟ گوتی: "ئا. لە پۆلیسخانە کاردەکات". دەستبەجێ چووم نەوزاد کاکەم لە پۆل دەرهێنا و گوتم: "بڕۆ بە خاڵت بڵێ دەگەڕێن بەدوایدا، با خۆی بشارێتەوە، ئەگەرنا دەیگرن"، چوو پێیگوت.
بە کورتی هێندە راپۆرت و سیخوڕی بە سەرمەوە کەڵەکە بووبوو، لە پاییزی 1957دا فەرمانی گواستنەوەم بۆ زوبێر دەرچوو. کە چوومە وەزارەتی زانیاری لە بەغدا و گوتم: "نامەوێ بچمە زوبێر و دەمەوێ دەست لە کار بکێشمەوە"، کاربەدەستی وەزارەت عبود زلزلە، کە پاش کودەتای قاسم بووبوو بە کۆمۆنیستێکی پلە یەك. پاش پەسندانی پاشا (نووری سەعید) و جنێودان بە ناسر گوتی: "ئەگەر نەچیت بۆ زوبێر، دەبێ جلکی سەربازی لەبەر بکەیت و، ئەوجا

وەك سەرباز بچيت بۆ ئەوێ، نەك وەك مامۆستا، دەبڕۆ دەی، ئێدی كاتم نييە قسەبكەم لە گەڵت، كاتی نوێژی نيوەڕۆيە، دەبێ نوێژەكەم بكەم، نوێژم دەچێ.."

بەر لەوەی من ڕەهەندەی زوبێر بكرێم، مامۆستايان كەمال جەلال غەريب و كەمال ئەحمەد سەعيد، كە هەردووكيان خەلكی سلێمانی بوون، ئەوانيش وەك سزادان، ڕەوانەی بەسرە كرابوون. لەگەڵ ئەوان و، دوو كۆنە هەڤالخوێندكاری عەرەبی زانستگەی بەغداش، كە يەكێكيان عەبدولسەتتار فەزلی و ئەوی ديكەيان مونيب عەبدولواحيد ئەلدرووبی بوو، كە يەكەميان كۆمۆنيست و دووەميان لە برا موسلمانەكان بوو و، هەردووكيان خەلكی بەغدا بوون، لە بەسرە يەكمان گرتەوە. عەقيد ڕوكن مەتحەت مفتی كە دۆستێكی كۆن و بەشيريستێكی تۆخ بوو، ئەويش لە "حاميەی بەسرە" كاريدەكرد و، جاروبار بە شەو، بەڵام بە جلكی سڤيلەوە، نەك لەشكری، يەكديمان دەدی و، باسی بارودۆخی راميارييی كوردستانمان دەكرد. هەر لەو سەردەمەدا، مامۆستا مەلا جەميلی ڕۆژبەيانی، لە كەركووكەوە ڕەوانەی ئەبولخەسيب كرابوو، كە قەزايەكی سەر بە بەسرە بوو، وەك ئيمام و خەتيبی ئەوێ. پارێزگار (متەسەرف) ی بەسرەش ڕەشيد نەجيب بوو، كە كۆنە نووسەرێكی كورد بوو، بەڵام بووبوو بە پياوی حكومەت.

حسەين هەڵەبجەيی، كە لەبەر ئەوەی كەمێك دەشەلی، ئوستاد بەشير موشير نێوی نابوو حسەين تۆپال تۆپال بە توركی مانای شەل) و لە بەغدا سكرتێری حەمە سەعی حاجی برايماغا (برا گەورەی دوكتۆر نەجيب خەفاف) بوو، ئەويش جاروبار لە بەغداوە بە فرۆكە دەهاتە بەسرە بۆ وەرگرتنی ئەو كووتاڵانەی كە بە پاپۆڕ دەهاتن بۆ بەندەری بەسرە و، بە ئێواران چاومان بەيەك دەكەوت. هێندەك جاريش، لەكەڵ كۆمەڵێك مامۆستا بە بەلەم لەم بەری "شەتولعەرەب" ەوە كە پێدەگوترێ "كۆرنيش" دەچووينە ئەو بەری "شەتولعەرەب" كە فارسەكان

"أروندرود" ی پێدەڵێن و دەگەیشتینە "عەرەبستانی ئێران" (خۆزستان). جارێکیان، چەند مامۆستایەك و، لە نێوماندا مامۆستا کەمال جەلال غەریب، سواری بەلەمێك بووین بۆ پەڕینەوە، لە پڕ کەشتییەکی گەورە لە نێزیکمانەوە تێپەڕی و ئاوەکەی وا بە توندی شڵەقاند، کە ئێستەش نازانم چۆن نوقومی ڕۆبارەکە نەبووین. ئا لەو کاتە تەنگانەیە دا و، کە شەپۆلی ئاوەکە گوژمی بە بەلەمەکەمان دەدا، هیچ کامێکمان مەلەمان نەدەزانی و، بە ڕێکەوت ڕۆژەکە دواڕۆژی ئەو مانگە بوو، مامۆستا کەمال گوتی "های! ئەوا مووچەی ئەم مانگەمان وەرنەگرت".

زوبێری ئەوسا، شارەدێیەکی نێزیك بەسرە بوو (ڕەنگە ئێستە بووبێ بە گەڕەکێکی بەسرە) ژمارەی دانیشتووانی ئەوکاتەی دە هەزار کەسێك دەبوو. زۆربەی زۆری خەلکی بەسرە شیعە بوون و، کەمەیەکیش سوننی. شیعە و سوننە حەزیان لە چارەی یەك نەدەکرد، بەڵام وانەبوو دەست لەیەك بوەشێنن. بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان مامۆستا سالم ئەلبەدر لە بنەماڵەی "ألبدر" بوو کە بنەماڵەیەکی ناسراوی سوننی بەسرەییە. مامۆستا سالم زۆر ڕێزی منی دەگرت و، هەر کاتێك دووبەدوو بووینایە، سکاڵای دڵی خۆی لای من لە دژی شیعەکان دەکرد و، دەیگوت: "شیعەکان زۆر خراپن لەگەڵمان"، بەڵام ئەز بۆ خۆم هیچ خراپەیەکم لە شیعەکان بەرامبەر بە خۆم نەدی.بەگشتی، خەڵکی بەسرەی ئەو سەردەمە میواندار و ڕووخۆش و ئاوارە دۆستبوون.

قوتابخانەکەمان لە قەراخی شارەکە بوو، بە بەرد و خشتی سۆر و، بە شێوەیەکی مۆدێرن دروستکرابوو. سێسەت قوتابییەك و، بێجگە لە بەڕێوەبەر، پێنج مامۆستا و بنووسێك (سکرتێر) مان هەبوو. مامۆستای زمانی عەرەبی و ئایین، مامۆستا عەبدولڕەزاق بوو کە خەلکی بەسرە بوو و، لە دەرچووانی زانستگەی ئەزهەری

میسر بوو. ئەو مامۆستایە، کە باوەڕی بە هونەری پێوەندیکردن بە گیانی مردووان (تحضیر الارواح)ەوە هەبوو، مامۆستایان حسەین ڕەشوانیی هەولێری و عەبدوللا زێباریی بادینانی باش دەناسی، کە ئەوانیش کاتی خۆی لە سەر ئەرکی ڕەحمەتی عەلی کەمال بەگ (نوێنەری ئەو کاتەی سلێمانی لە پەرلەمانی عێراق و سەرمایەداری گەورە و خێرخواز) لە ئەزهەر دەیانخوێند. مامۆستا عەبدولڕەزاق دەیگوت کە لە ئەزهەر دەمانخوێند، محەمەد مەحموود سەوواف (عەرەبی مووسل و ئیخوانی موسلمین) هەر لەوێ دەیخوێند و، زۆر دژایەتیی کوردی دەکرد و، سیخوڕیی بە سەر ئەو دوو خوێندکارە کوردەوە دەکرد و، لە ئەنجامدا، هەردووکیانی بەگرتن دا، بە تۆمەتی "کۆمۆنیستی" و "جیابوونەوە خوازی". پاشان بۆ دەرکەوتنی ڕاستینەی ئەم هەواڵە، لە هەردوو مامۆستام لەو بارەیەوە پرسی، هەردووکیان گوتیان: "ڕاستدەکات وابوو، ئەگەر تکا و گوشاری بەڕێز عەلی کەمال بەگ نەبوایە، لە زیندانی میسردا دەڕزاین". ئەمەوا و، کە چی ئێستا مزگەوتێك لە هەولێر هەیە بە نێوی مزگەوتی "سەوواف" ەوە. لێرەدا گلەییم لە کاربەدەستانی دوو زلحیزبە دەسەلاتدارەکە نییە، ئەوان وەك فارسەکان دەبێژن "معلوم الحال" ن و، دەمێکە دەستم ششتووە لێیان. بەڵام گلەییم لە مرۆڤێکی نیشتمانپەروەری وەك مامۆستا محەمەد شاکەلی یە کە کاتی خۆی قوتابییەکی ڕەوشتجوان و چالاك بوو لە قوتابخانەی دوانێوەندیی "موسەللا" لە کەرکووك. ئەو دەبووایە نێوی مزگەوتەکەی بکردایە بە نێوی شەهید مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی.

بەڕێوەبەری قوتابخانەی زوبێر مامۆستا سالم البدر، دەیویست لە نێو قوتابخانەکەدا، کە گەلێك ژووری ڤالای هەبوو، ژوورێکم بداتێ تێیدا بژیم، زۆر سوپاسمکرد، بەڵام لەبەر گەلێك هۆ وەرمنەگرت. بەتایبەتی دەبوو زوو زوو سەری

نامەخانەکانی بەسرە بدەم و، لە مامۆستاکانی نێو شاری بەسرە زۆر دوورنەکەومەوە. لەبەر ئەوە لە هۆتێلێك لە گەڕەکی عەشار ژوورێکم گرت بەکرێ و، پرێمزێکی چێشتلێنانم کڕی، لەگەڵ هێندەك کەوچك و چنگاڵ و دەفر و پیاڵە و ژێرپیاڵە و کەلوپەلی پێویست و، بە ئێواران و شەوان، ئەگەر لەگەڵ برادەرەکانم یەکدیمان نەدیایە، خەریکی نووسین و خوێندنەوە دەبووم و، لە نامەخانە گەورەکەی بەسرە پەرتۆکم بۆ ماوەیەك دەخواست و دەمخوێندنەوە و، پێوەندیم بە رۆشنبیرانی بەسرەوە دەکرد. لە بەسرە نامیلکەی "وەرگێڕان هونەرە" م لە 31.01.1958 دا تەواوکرد و لە سلێمانی هەر لەو ساڵەدا چاپکرا. چیرۆکی "پاڵتۆ" ی چیرۆکنووسی رووس گۆگوڵم هەر لەو ساڵەدا لە بەسرە کرد بە کوردی. لەبەر ئەوە دڵم بە ژوورەکەم خۆشبوو، بەڵام دەبوو هەموو رۆژێك بە پاس بچوومایە بۆ قوتابخانە، کە رێگەکە بە ئۆتۆمۆبێل 10ـ15 خولەك دەبوو. گەلێك جار، وا رێکدەکەوت کە پاسەکە لەرێ پەکیدەکەوت و هاژۆرەکە دەیگوت "یاللّا أهل الغيرة! ثره الباتری مچسی لازم ندفع" (ئەوە پاتریەکە گیراوە دەبێ پاڵبنێین) ئەوجا دەبوو دابەزین وپاڵیپێوەبنێین بۆ ئەوەی بیخەینەوە کار. بەڵام جاری وا هەبوو، هەڵنەدەبووەوە و، ئێمەش هەر پاڵمان پێوە دەنا، هەتا دەگەیشتینە زوبێر. جا چۆنکە قوتابخانەکەمان لە قەراخی شار بوو، ئەوا ئەز خواحافیزیم دەکرد لێیان و، دەمگوت "عەل گووە" واتە: خوا هێزتان بداتێ" ئەوانیش پاڵیان پێوە دەنا، تا پاسەکەیان دەیانگەیاندە گەراج.

لە کاتێکدا کە پاڵمدەنا بە پاسەکەوە، پێکەنینم دەهات بە حاڵی خۆم، خەلکەکە کە هێندێکیان پاڵیان دەنا و، هێندێکیان لە گەڵمان دەڕۆیشتن، پێیان سەیر بوو کە ئەز پێدەکەنم، دەیانپرسی بە چی پێدەکەنیت؟ دەمگوت "شَرُّ البَلِيَّةِ ما يُضحِك".

ئێوارەیەکیان لە ژۆوەرەکەم دانیشتبووم، خاوەن هۆتێلەکە کە عارەبێکی لوبنانی

بوو، هات گوتی: "پیاوێك دەیەوێ قسەبكات لە گەڵت". گوتم: "نێوی چییە؟". گوتی: "نازانم". گوتم: "فەرموو با بێ، بزانم كێیە" كە هات بە كوردییەكی عارەبیلێداو گوتی: "تۆ ئوستاد جەمال نەبەزیت؟". گوتم: فەرموو. گوتی: "بەهۆی مامۆستایەكی قوتابخانەكەتانەوە زانیم كە تۆ كوردیت و، لە كەركووكەوە هاتوویت. ناوم عومەرە و خۆشم كەركووكیم و سالآنێكی دووروودرێژە لە زوبێر دەژیم و تاكسیلێخوڕم و حەزمكرد بتناسم". لە ماوەی قسەكردندا، لە كاكە عومەرم پرسی: "لە زوبێر چەند كورد هەن؟"، گوتی: "بە خۆمەوە سیو دووین". منیش گوتم: "كەواتە وا بووینە 33"، گوتی: "نا، سیودوو". گوتم" "بۆچی؟". گوتی: "تۆیشم حسێبكردەوە". لە كورتی بیبڕمەوە، لەگەڵ تێپەڕبوونی كات، ئاشنایەتیی نێوان من و كاكە عومەر زۆر خۆشبوو.

جارێكیان كاكە عومەر باسی كابرایەكی عارەبی كرد و گوتی: "عارەبێك هەیە نیشتەجێی بەسرەیە، بەلاَم خەلكی بەسرە نییە، عارەبی، تركی، فارسی و، وەك خەلك دەلێن هیندیش دەزانێ. ئەم كابرایە لەهەر شوێنێك دادەنیشێ و قسە بۆ خەلك دەكات، دەلێ كورد زمانی نییە و، هۆنراوەیەكی فارسی دەخوێنێتەوە كە دەلێ: گوو و میز و ریخ و تەرس و چی و چیان تێكەلكرد، كوردی دەرچوو. چەند جار ویستم هێندەی بكوتم كە بە دە كەس لە ژێر دەستم دەرینەهێنن. ئەز نەمخوێندووە، بەزەحمەت نێوی خۆم دەنووسم، بە عەرەبی رەوان قسە دەكەم، بەلاَم ناتوانم بنووسم. تۆ خوێندەواریت، وەرە وەرامی ئەو كابرایە بدەرەوە و، ئەگەر قسەیكرد تێیهەلدەدەم".

پاش ئەوەی كە ئامۆژگاریی كاكە عومەرم كرد دەست لەو كابرایە نەوەشێنێ، گوتم: "هەولدەدەم كارێك بكەم". بەر لە هەموو شتێك بیرم لەوە كردەوە كە شوێنێك بدۆزمەوە، بە كەلك بێ بۆ پێشكێشكردنی وتارێك.

له زوبێر  کۆمەڵەیەك هەبوو بەنێوی "جمعیة الاصلاح الاجتماعي"، خانوویەکیان هەبوو، سالۆنێکی زۆر گەورەی تێدابوو. دەیاندا بەو کەسانەی وتار بۆ خەڵك دەخوێننەوە. ئەم کۆمەڵە بۆ ئەوە دروستبووبوو کە بەربەرەکانێی نێربازی بکات.چۆنکە وەك باسیان دەکرد، دەیانگوت، ژمارەیەکی فرە لە پیاوانی زوبێر، هەرچەندە ژن دەهێنن، بەڵام گوێنادەنە ژنەکانیان، بەڵکو نێربازی دەکەن و، ئەم کۆمەڵەیە دەیەوێ لەو رووەوە چاکسازی بکات.

چوومە لای سەرۆکی کۆمەڵە. کە ئەویش بە روویەکی زۆر گەشەوە بەرەو پیرم هات و، کە باسەکەم کردەوە بۆی، گوتی: "زۆرباشە. ئێوارەیەك 5ـ6 دەمژمێر بۆ تۆ دادەنێم، هەرچەندە باسەکەی تۆ پێوەندیی بە ئامانجی کۆمەڵەکەمانەوە نییە، بەڵام تۆ میوانیت لای ئێمە و باسەکەشت باسێکی بە تام و نوێیە". منیش سوپاسمکرد و، گوتم حەزدەکەم پاش مانگێك ئەو وتارە بخوێنمەوە و، رێکەوتین کە گەلێك لایەن بە نامە و تەلەفۆن ئاگادار بکات و، ئەز ژی گەلێك لە هەڤالمامۆستاکان و خەلکی دیکەم ئاگادارکرد و، لەو مانگەدا چەند جار چوومە نامەخانەکانی بەسرە و، گەلێك سەرچاوەم لە بارەی زمانی عەرەبی و زمانناسییەوە خوێندەوە، چ بە عەرەبی و چ بە ئینگلیزی. زمانی ئینگلیزیم دەزانی، چۆنکە بێجگە لەوەی لە زانستگەی بەغدا، زۆربەی سەرچاوەی خوێندنەکەمان بە ئینگلیزی بوو، سالێکیش لە British Council Institute لە بەغدا، زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزیم خوێندبوو.[8] کە لە کەرکووك بووم  لە لای هاوڕێی و هاوپیشەم، مامۆستا مووسا نووح، سەرەتای زمانی فەڕەنسیم خوێند، پاشان لە بەغدا لە 1959 دا لە لای دیانێك کە 40 ساڵ لە پاریس ژیا بوو، درێژەمدا پێی. لە ئەنجامدا، لەبەر رۆشنایی ئەو زانیارییانەی کە تا ئەو کاتە هەمبوون، وتارێکی گەورەم نووسی لەژێر نێوی "رفع الاوهام ودفع التضليل عمّا في

اللغةِ الكرديةِ مِنَ الدَخيل" و، هەوڵمدا شێوازی نووسینەکەم تا پێمبکرێ رەوان و ڕۆن بێ و، لاشم وایە لەوەدا سەرکەوتنم وەدەستهێنا.

لە وتارەکەمدا، جارێ سەرنجی گوێگرانم بۆ ئەوە راکێشا کە زمانی عەرەبی دەکرێ بە دوو بەشەوە، بەشی یەکەم زمانی قسەکردنە، کە ئەمەش دابەشدەبێ بەسەر ژمارەیەکی یەکجار زۆر شێوەزار و بنزار و، جاری وا هەیە لەیەکدی ناگەن. وەك مامۆستا سالم البدر (کە خۆشی لەوێ بوو) جارێکیان باسیکرد، کاتێك وەك خوێندکار لە بەغدا لە بەشی نێوخۆیی بووە، بەردەستەکە گوتوویەتی "طوز هوایە جەوە القریولە". مامۆستا سالم وایزانیوە بە ترکی قسەدەکات، چۆنکە خەلکی زوبێر بە طوز (کە تۆزە و کوردییە) دەڵێن (غبار) و بە "هوایە" (زۆر) دەبێژن "واجد" بە "جەووە" (ژێر) دەبێژن "حدر" بە "قریولە" (کە ترکییە) دەبێژن "چەرپایە" (کە کوردییە). بەشی دووەمیش زمانی فەرمییە، کە زمانی نووسین و قسەی فەرمیە و زمانی کلاسیکی عەرەبە، کە ئەوەش لە بنەڕەتدا شێوەزاری نەبەتی (نبطي) بووە. ئەوجا لەبەر ئەوەی کۆمەلگەی عەرەبی پێش ئیسلامەتی، کۆمەلگەیەکی پاشکەوتووی بتپەرست و بیابانشین و، لە شارستانێتی دوور بووە، تەنێ لە ڕێی بازرگانیکردنەوە گەلێك وشەی عیبری و ئارامی و یۆنانی و، ئەوجا پاش داگیرکردنی کوردستان و ئێران، گەلێك وشەی بابەتی بەڕێوەبەرێتی و حکوومەتی و تەکنیکی و زانستی کەوتنە عەرەبییەوە، کە لە بنەڕەتدا کوردین و زمانی عەرەبی پڕە لە وشەی بێگانە. هەر بۆ بەلگەهێنانەوە، گوتم، وشەی لُغَة لە لۆگیکۆ λογικοή ی یۆنانییەوە هاتووە، قاموس و أطلس هەردووکیان لاتینی و یۆنانین. وشەی أجرُمية کە بۆ دەستووری زمان (قواعد اللغة) بەکاردەبرێ، لە بنەرەتدا ئوگرومیە و لە گرامماتیکی γραμματική

یۆنانییەوە هاتووە. هەندەسە و کارەبا و دەفتەر و قەڵەم و دیوان و منصة و لهجة و برنامج کوردین. وشەی حرف وشەیەکی ئێرانیی کۆنە. وشەی جَهَنَّمْ لە "جهیٚ (جیٚ) ی نزم" ەوە هاتووە کە بە "اسفل السافلين" نێودەبریٚ، و هێندەك پێیانوایە ئارامییە، بەڵام کوردییە.  هەروەها میحراب لە "میهراڤا" وە هاتووە (واتە جێی خۆشەویستیی خۆ پێشاندان بە خۆدیٚ)، ئەوەش کوردییە، سکر (شکر) و سفر (صفر) هندین، یَمْ (یەم) واتە: زەریا  عیبریە. بنەچەی ئەم وشانە، ئەگەر نەڵێم بەلایەن هەموویانەوە، بەلایەن هەرە زۆری ئامادەبووانەوە نامۆبوون. لەو سمینارەدا، گەلێك مامۆستا و تەنانەت بەڕێوەبەری زانیاریی بەسرە (مدير المعارف) بەشداربوون. پاش تەواوبوونی وتارەکە و وتووێژ لەسەری، هەموو سۆزی دۆستانەی خۆیان بەرامبەرم پێشاندا و، کابرای قسەزل دۆڕاندی. کە هاتینە دەرەوە، کاکە عومەر گوتی "زۆر زۆرم پێخۆشبوو، بەقوربانی دەمت بم، ئێستە بچم تێیهەڵدەم". گوتم "کاکە عومەر، ئەم شەڕە شەڕی ڤاچ نییە، شەڕی رۆشنبیرییە و، ئێمە بردمانەوە و، ئەو کابرایە شەقی خۆی خوارد. خۆ ئەگەر ئەو کارە بکەین، ئەوجا ئێمە دەیدۆڕێنین و ئەو دەیباتەوە"، ئێدی کاکە عومەر وازیهێنا لێی. لەو سمینارەوە  بەڕێوەبەری زانیاریی بەسرە بوو بە دۆستم و، جاروبار دەچوومە سەرەدانی[9] و، لە پاش کودەتای ڤاسم، منی لە کوێرەوەریەکی گەورە رزگار کرد، کە باسکردنی لێرەدا بە خراپ نازانم.

لە نێو مامۆستاکانی ڤوتابخانەی زوبێردا، مامۆستایەك هەبوو نێوی حافز بوو. حافز مامۆستای وەرزش بوو، گەنجێکی رەشپێست وەك ڤولەڕەش، رەوشتبەرز، رۆشنبیر و کەمێك چەپاژۆ. زۆر حەزی بە هاوڕێیەتیی من دەکرد. بەڕاستی خۆشم زۆر رێزم دەگرت. هێندەك جار بە ئێواران دەهاتە گەڕەکی عەشار و

پێکەوە دەچووین بۆ گەڕان، خەلکێکی زۆری دەناسی و منیشی کردە ناسیاوی گەلێك کەس، کە باسی کوردستانیان دەپرسی لێم.

ئەو ساڵەی رەوانەی زوبێر کرام، چەند مانگێك وانەم گوتەوە، ئەوجا پشوویەکی 15 رۆژی هاتە پێشەوە، کە پێیان دەگوت پشووی بەهار، لەبیرم نەماوە کەیبوو. لە بەسرەوە هاتمەوە بەغدا و، لە دوکانی (ئوستاد) بەشیر موشیر، لەگەڵ برادەرەکی هەولێری کە نێوی فازیل سەعید بوو دانیشبووین، لە پڕ کوڕێك هات و گوتی: "کەس هەیە سەفەری سلێمانی بکات؟"، گوتمان بۆچی؟. گوتی: "ئوتۆمۆبێلم هەیە و هاژۆری رێی بەغدا و سلێمانیم". کاك فازیل و ئەز، کە ئەو بەتەمای هەولێر و ئەز ژی بەتەمای سلێمانی بووم، گوتمان باشە. فازیل تا کەرکووك دێ و ئەز ژی تا سلێمانی دێم. کوڕەکە ئێمەی بردە گەراجێك لەو نزیکانە و، چەند نەفەرێکی دی پەیداکرد یەکێکیان ژنێکی کەرکووکی بوو، بوخچەیەك و مریشکێکی پێبوو، دوو کەسی دیکەش کە خەلکی کەرکووك بوون لە پێشەوە دانیشتن و، ژنەکە و ئەز و فازیل لە دواوە. کە گەیشتینە بەغدا جەدیدە، ئۆتۆمۆبێلەکەمان خۆی دا بە ئوتۆمبلێکی دیکەدا، بەڵام باش بوو هیچ نە قەوما کابرای لێخۆڕی ئوتۆمۆبێلەکەی دی هاتەخوارەوە و، دەستیکرد بە جنێودان بە هاژۆرەکەمان و، بە پاڕانەوەی ئێمە رزگاری بوو. وەك سەیرمان کرد، هەڵسوکەوتی هاژۆرەکەمان ئاسایی نییە، کە لە چایخانەیەك لە چۆڵی قورفە لاماندا، پیاوێکی خەلکی سلێمانی، قسەی لەگەڵ هاژۆرەکەمان کرد، لێم پرسی ئەم تاکسیلێخوڕەمان کوێندەرییە؟ گوتی خەلکی سلێمانییە و برای "بەکری نادی" یە. کە سواری ئوتۆمبیلەکە بووینەوە و، ماوەیەکی دی بە چۆڵی قورفەدا لێیخوڕی، ئێدی کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم، کە دوو پۆلیس منیان لە نێو ئوتۆمۆبیلەکە رادەکێشایە دەرەوە و، گوێم لێبوو یەکێکیان بە کوردی گوتی: "ئەمیشیان دەمرێ". تومەز

زۆرمان نەمابوو بگەیەنە چیای حەمرین، لەو دەشتە کاکیبەکاکییە شەڕەشۆقی لەگەڵ ترۆمبێلێکی دیکە کردبوو، ژنە کەرکووکیەکەی تەنیشتم، کە مریشکەکەی خستبووە سەر کۆشی، مرد بوو، بەڵام مریشکەکە زیندووبوو، فازیلی کولۆڵ، دەستێك و پێیەکی شکابوو، ئەز ژی پەراسوویەك و چەند دانێکم شکابوو، چەناگەم بە جۆرێك بریندار بووبوو کە پاش دروونەوەش، ئێستەش شوێنەکەی هەردیارە. پۆلیسەکان منیان بردە نەخۆشخانەی کەرکووك. یەکێك لە کۆنە قوتابییەکانم کە لە قوتابخانەی ئێوارانی عەلی حیکمەت لە کەرکووك دەیخوێند و، لە پاڵەوە نەخۆشەوان بوو، زۆر خزمەتی منی کرد، ماڵی ئاوابێ. بەڵام لەبەر ئەوەی هێندە خوێن لە لەشم رۆیبوو، نەمدەزانی دەژیم یان دەمرم، ویستم رێ بدرێ پێم بچمەوە سلێمانی، بۆ ئەوەی پێش ئەوەی بمرم، دایکم و خۆشکەکانم ببینم. لە سلێمانی ناردبوویان بە شوێن دوکتۆر قادر شالی (کوڕی حاجی عەبدوللای شالی) دا کە بێ بکەوێتە فریام، بەڵام گوتبووی کاتی نییە، بێگومان دەیزانی کە لە سەر دژایەتیی حکوومەت دەربەدەرکراوم و، دەترسا لەوەی پڕیشکێکی پێبگات، بەڵام دوکتۆر کەمال عەبدوللا ناجی (زاوای سەعید قەزاز) گوتبووی لەسەر کاریش دەرمبکەن هەر دەچم بۆ یارمەتی و، ماڵی ئاوابێ هات و، ئەوەی پێویست بوو کردی و، گەلێك دڵخۆشی دایکم و خوشکەکانمی دایەوە. دانساز محەمەد مەمەندیش، دانە شکاوەکانمی تیمارکرد. رۆژنامەی "ژین" لە سلێمانی و "هەتاو" لە هەولێر، خەمباریی خۆیان لەو بارەوە دەربڕی و لە گەلێك شوێنەوە خەلك هاتن بۆ هەواڵپرسیم. پاش پانزە رۆژ، چوومەوە بۆ زوبێر، لەوێ لیژنەیەکی دوکتۆرەکان بە هوردی کەوتنە نێرینی گیانم و، گوتیان دەبێ دوو مانگ بە ئارامی بژیت و، نابێ هیچ خۆت ماندوو بکەیت. گەڕامەوە سلێمانی. لە ماوەی ئەو پشووەدا رۆژێکیان لە سلێمانی لە ماڵەوە نانم دەخوارد، یەکێك لە

دەرگەی دا و کە هاتە ژوورەوە، هێندەك شوێنی لەشی پێچابوو، تۆمەز ئەمە هاژۆرەکەمان بوو. دەستی کردە ملم و گوتی: "ببورە بەڕاستی شەوێك لەوەبەر زۆرم خواردبووەوە و بەیانی سەرخۆشی بەرمینەدابوو" گوتم: "کاتی خۆشی پۆلیس پرسیاری کرد لێم، گوتم داواکارنیم لە دژی". پێکەوە نانمان خوارد. گەنجێکی قسەخۆش و زمانشیرین بوو.

پاش دوو مانگەکە، کە گەڕامەوە زوبێر و، هەتا کۆتایی ساڵی خوێندن، جاری واهەبوو ناچاردەبووم لە رۆژێکدا، لە باتی (5) دەمژمێر (10) دەمژمێر بۆ قوتابییەکانم کاربکەم بۆ بژاردنەوەی ئەو وانانەی کە لە دەستیانچوو بوو. کە کاتی تاقیکردنەوە هاتە پێشەوە، مامۆستا حافزی هاوڕێم، رۆژێکیان گوتی: "بەڕاستی شەرمدەکەم بۆ شتێك رووبنێم لێت". گوتم: "فەرموو بڵێ". گوتی: "کوڕێکی خزمم هەیە، لە هەندەسەدا زۆر خراپە، بەلکۆ دەربچێ". کە دەفتەرەکانم سەرڕاستکرد، تەماشامکرد ئەو قوتابییە یەکێکە لە چوار قوتابی، کە لەو پولە و لەو بابەتەدا کەوتوون. گوتم: "حافز، دەکرێ ئەو چوار قوتابییە جارەکی دی و بە پەلە خۆیان ئامادە بکەنەوە و تاقیکردنەوە دووبارە بکرێتەوە بۆیان، بەشکو هەموو دەرچن". گوتی: "باشە". لە تاقیکردنەوەی دووەمدا، دووانیان دەرچوون و دووانیان کەوتن، یەکیکیان خزمەکەی حافز بوو. جارەکی دیکەش تاقیکردنەوە دووبارە کرایەوە، یەکەکەی دی دەرچوو، بەڵام ئەو دیسانەوە کەوتەوە، ئەمجارە بە نمرەیەکی نێزیك لە دەرچوون کەوتبوو. ئەو دەمە نمرەکەیم بەرزکردەوە و، نمرەی هەموو قوتابیەکانیشم بەو رێژەیە بردە سەرەوە، تا کەس بەشخوراو نەبێ. پاش ئەمە گەڕامەوە سلێمانی.

لە 1958/7/14دا، واتە نێزیکەی مانگێك دوای گەڕانەوەم بۆ سلێمانی، کودەتای قاسم روویدا و، هەر چەند رۆژێك دوای ئەوە، ئێمە هەشت مامۆستای خەلکی

کوردستان، بیرخەرەوەیەکمان دا بە قاسم و وەزیری پەروەردە و فێرکردن دوکتۆر جابر عومەر و، داوای مافی خوێندەواری و رۆشنبیریمان بۆ قوتابیان و خوێندکارانی کوردستان کرد و، بیرخەرەوەکەم بردە بەغدا و، لە رۆژنامەی "البلاد"دا بلاوکرایەوە و، بەهۆی هاورێی مندالی و قوتابخانەم دوکتۆر عێزەدین مستەفا رەسوول، کە ئەو دەمە، چەند رۆژێك بوو لە بەشی کوردیی رادیۆی بەغدا کاریدەکرد، بە دەنگی خۆم خوێندمەوە. ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی خەلکێکی زۆر پشتگیریمان بکەن و، گەلێك لایەنیش بکەونە دوژمنایەتیکردنمان. عەبدولسەلام عارف، رۆژنامەی "البلاد"ی لەسەر ئەمە داخست.کۆمۆنیستەکان کەوتنە جنێودان پێمان، چۆنکە رۆژنامەی "البلاد" داخرابوو، ئەوەش تاقە رۆژنامەیەك بوو کە شتی وانی بلاودەکردەوە. خۆیان هێشتا رۆژنامەیان نەبوو. تۆرانییەکان لە دژی وەستان، چۆنکە گوتبوومان دەبێ بەرێوبەرێتیی زانیاریی کوردستان دابمەزرێ و مەلبەندەکەی کەرکووك بێ. پارتەکان لە دژمان بوون، چۆنکە کارەکە خۆیان نەیانکردبوو. نازم تەبەقچەلی تۆرانی  کە قائد فیرقەی کەرکووك بوو، گەلێك راپۆرتی نهێنی لە دژمان نووسی بوو کە ئەو راپۆرتانە و بیرخەرەوەکەی ئێمە  لە "مذکرات" ە کانیدا بلاوکراونەتەوە. ئەز لە بەغدا هەولمدەدا کە بمگەرێننەوە کەرکووك، بەلام هەولەکەم سەرینەگرت و، کرام بە مامۆستا لە قوتابخانەی دوانێوەندیی جەعفەری ئەهلی لە بەغدا، کە قوتابخانەی شیعەکان بوو، و ژمارەیەکی یەکجار زۆر کوردی فەیلی، قوتابی بوون لەوێ.

کە گەرامەوە زوبێر بۆ مالاوایی و وەرگرتنی نامە لە بەرێوەبەرێتیی زانیاریی ئەوێ، لەپێشدا چوومەوە هۆتێلەکە. خاوەن هۆتێلەکە گوتی: "دوو رۆژ لەوەبەر بەرێوەبەری زانیاری تەلەفۆنی کرد و ویستی بزانێ هاتوویتەوە، گوتم نەهاتووتەوە، گوتی کە گەرایەوە پێی بلێ سەرم بدات". کە چووم بۆ لای

بەڕێوەبەر، پیرۆزبایی شۆڕشی تەمووزی کرد لێم و گوتی: "زۆرم پێخۆش بوو کە بیرخەرەوەکەتانم لە رۆژنامەدا خوێندەوە". ئەوجا گوتی: "تۆ دەزانیت ئەگەر شۆڕش نەقەومایە، تۆ ئێستە لەکار دوورخرابوویتەوە". گوتم: "بۆچی؟" گوتی: "قوتابییەك نامەیەکی نووسیوە بۆم دەڵێ لە هەندەسەدا کەوتبووم، بەڵام فیسارە مامۆستا (واتە تۆ) نمرەی دەرچوونی داوە پێم، کە مافی دەرچوونم نەبووە". ئەمە چییە؟ ئەز ژی باسەکە چۆن بوو، هەر ئاوا گێرامەوە بۆی. گوتی: "باشە کەوایە، بۆچی شکات دەکات لێت، دەبوو سوپاست بکات". گوتم: "راستە، بەڵام نازانم بۆچی دەبێ لە حافز بپرسم، دەتوانم تەلەفۆن بکەم بۆ حافز؟ گوتی: "فەرموو". تەلەفۆنمکرد بۆ حافز و چاوم بە حافز کەوت، حافز بە دڵێکی شکاو و بە شەرمێکی زۆرەوە داوای لێبۆردنی کرد و گوتی: " ئێمە سەر بە هۆزین، برای ئەو کوڕە داوای کچێکی لە بنەماڵەی ئێمە کردووە و کچەکە نەیویست شووبکا پێی، هاتن بۆ لام و گوتیان تۆ دەبێ زۆر لە کچەکە بکەیت شوو بکات پێی، بەڵام زۆرمنەکرد لێی، تۆ دەزانیت ئەز مرۆڤێکم باسی پێشکەوتنخوازی دەکەم، چۆن شتی وا دەکەم، لەبەر ئەوە ئێستە بوونەتە دوژمنمان". گوتم: "باشە گوناهی من چییە؟" گوتی: "ئەو دەزانێ تۆ هاوڕێی منیت، دەیەوێ لە لایەکەوە تۆ بکات بە دوژمنی من، بەوەی زیان بە تۆ بگەیەنێ و، دەزانێ زیان لە خۆی ناکەوێ، چۆنکە حکوومەت بڕیاری داوە ئەوانەی دەرنەچوون بە "زەحف" (خۆڕاکێشان) دەردەچن و، لە هەمان کاتدا دەیەوێ منیش پیاوخراپ بکات کە من هاوڕێیەتی خۆم لەگەڵ تۆ بەکارهێناوە بۆ کاری ناقانوونی". گوتم: "دەباشە تۆ ئەم قسانە ئاوا بۆ بەڕێوەبەری زانیاری باسبکە". کە چووینە لای بەڕێوەبەر، حافز هەمووی وەك خۆی، بۆ بەڕێوەبەری زانیاری گێڕایەوە. بەڕێوەبەری زانیاری گوتی: "هەرچەندە مامۆستا جەمال غەدری لە کەس نەکردووە، چۆنکە نمرەی هەموویانی بەرێژە

بەرزکردووەتەوە، بەڵام کارەکە ناقانوونییە. لەگەڵ ئەوەشدا، میوانێکی خۆشەویستە و لەگەڵ قوتابییەکانمان زۆر زەحمەتی کێشاوە و، لەو رۆژەوە کە گوێم لە وتارەکەی بوو، دەزانم شت دەزانێ و، زۆر ناخۆشە بەلامەوە کە بە جێمان دێڵێ". زۆر سوپاسمکرد. ئەوجا کە گەڕامەوە بەغدا و، بوومە مامۆستای دوانێوەندیی جەعفەرییە و دوو ساڵ لەوێ کارمکرد و، پاش ئەوەش، ساڵێك لە هەولێر بوومە مامۆستای قوتابخانەی دوانێوەندیی و قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتایی. چیرۆکی ئەو سێ ساڵەش دووردرێژە، پێوەندیی بە زمانی کوردی و سیاسەتیشەوە هەیە، بەڵام ئەو باسە بەتەواوی لە چیکلدانەی ئەم پێشگوتنەدا جێی نابێتەوە. لەبەرئەوە لێرەدا، زۆر بەکورتی پەنجە بۆ چەند رووداوێك رادەکێشم:

وەزارەتی زانیاری، خزمەتی منی بە خواستەمەنی (إعارة) و بەکرێ (تأجير) دابوو بە قوتابخانەی دوانێوەندیی جافەرییە، کە نێزیك پێچی حافز قازی (فلكة حافظ القاضي)، واتە: شەقامی رەشید بوو. لە هۆتێلی رەشید کە چەند خولەکێك لە قوتابخانەوە دوور بوو ژوورێکم بەکرێ گرتبوو. ساڵ ساڵی 1958 بوو، کودەتای 14 ی تەمووز روویدابوو، بەغدا دەکولا و بووبوو بە نێوەندی چالاکیی رامیاری. بەتایبەتی قاسم لەلایەن بەعسییەکان و ناسرییەکانەوە تەنگی پێهەڵچنرابوو، بە دوای هەڤاڵبەندیدا دەگەڕا. ئەم هەڤاڵبەندێتیەشی لە کۆمۆنیستەکاندا دەدی، کە بە پێچەوانەی سەردەمیپێش قاسمەوە کە پشتگیریی ناسریان دەکرد، ئێستە بووبوونە زوڕناژەنی قاسم و دوژمنی ناسر و "یەکێتیی عەرەب". لەبەر ئەوە هەتا 14 تەمووزی 1959، کە کارەساتی کەرکووك روویدا، کۆمۆنیستەکان یەکجار دەسەڵاتداربوون، لێ، بەداخەوە، بۆ خزمەتی خەلك بەکاریاننەهێنا و، لەوەوە زیانێکی گەورەیان بەخۆیان گەیاند. شایانی باسە لەسەرنەگرتنی هەوڵدانمدا بۆ

گەڕانەوەم بۆ کەرکووك، دەستی وانیشی تێدابوو، ئەوان لەو سەردەمەدا کەرکووکیان کردبوو بە مەڵبەندێکی چالاکیی خۆیان لە کوردستاندا و ڕۆژنامەکەیان "ئازادی" لەوێ دەردەکرد و بڵاودەکردەوە. لەبەر ئەوە لە دژی ئەوەبوون کە یەکێکی وەك من کە هەڵسوکەوتی وانم بەدڵ نەبوو، لەوێ بم. چونکە دوکتۆر فەیسەل سامر (فیصل الثامر) کە بووبوو بە "بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردە و فێرکاری" (مدیر عام التربیة والتعلیم) ناسیاوم بوو، ساڵی 1952 پێکەوە لە "معتقل أبو غریب" زیندانی بووین، دەیویست یارمەتیم بدات، بەڵام پشکنەری گشتی عبود زلزلە ی کۆنە زوڕناژەنی "نوری پاشا"، بووبوو بە کۆمۆنیستێکی وا تۆخ کە، بە پێچەوانەی کاتی ڕەهەندەکردنم بۆ زوبێر منی بە "کۆمۆنیست" و "ناسری" دەدایە قەڵەم، ئێستە منی بە "جیابوونەوەخواز" و "دژی یەکێتیی عێراق" دەدایە قەڵەم. لەم ماوەیەدا ناسیاوەتیم لەگەڵ عەبدولئەحەد فرەنسیس مالح پەیداکرد کە دیانێکی عەنکاوەیی و کۆمۆنیست، بەڵام مرۆڤێکی ژیر و خێرخواز بوو و، زۆر دەستی دەڕۆی لە سەندیکای مامۆستایاندا. بیرۆکەی گواستنەوەی کارەکەم بۆ قوتابخانەی جافەرییە لە عەبدولئەحەد فرەنسیسەوە بوو. هەر لەو سەردەمەشدا، هاوڕێم مووسا نووح، کارەکەی گواسترابووە بەغدا، ئەویش بیروڕای وابوو کە لە بەغدابم باشترە.

قوتابخانەی دوانێوەندی جافەرییە، لەنێو خەلکدا بە "ثانویة موسکو" (قوتابخانەی دوانێوەندیی مۆسکۆ) نێویرۆیبوو. قوتابییەکانی بە زۆری شیعە و لایەنگری پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوون و، لە نێویاندا فەیلییەکی یەکجار زۆر هەبوو، چونکە فەیلییەکان قوتابخانەی دوانێوەندیی خۆیان نەبوو. ژمارەیەکی زۆر کەم قوتابی سوننی هەبوو، کە سەر بە بەعس بوون و کەمەیەکیش دیان. چەند کوردێکی دیکەش، بێجگە لە فەیلییەکان، لەوێ بوون لەوانە: برایەکی

دوکتۆر کەمال مەزهەر و شێرکۆی کوڕی هەژار (کە باوکی هێنابووی بۆ ئەوێ، چۆنکە ئەز لەوێ بووم). مەلایەکی شیعەی خەلکی نەجەف، کە نێوی شێخ عەبدولزەهرە ئەلسەغیر (عبدالزهرة الصغیر) بوو، مامۆستای زمانی عەرەبی و ئاین بوو. هەردووکمان لە لیژنەی کۆنترۆل (أنضباط)دا بووین و بووبووینە دۆست. رۆژ نەبوو قوتابییە فەیلییەکان لە قوتابییەکی سەر بە بەعس نەسرەوێنن و، لێکۆلینەوەش لە کارەکە بەرەو رووی من و شێخ عەبدولزەهرە دەکرایەوە. رۆژێکیان بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان حەسەن زەلزەلە (خزمی عبود زەلزەلە بوو، بەلام لە بابەتی وی نەبوو) گوتی: "مامۆستا جەمال تۆش کوردیت وەك ئەم فەیلییانە، ناکرێ کارێك بکەیت کە ئێدی کەمێك ئارام بن". گوتم: "مامۆستا، کوردە فەیلییەکان لەلای من دەبێژن، ئێمە هەر لە یەك لاوە تێمانهەلنادرێ، بەلکو لە دوو لاوە. چۆنکە شیعەش و کوردیشین". گوتم دەبێژن: "بۆچی دەبێ ئێمە قوتابخانەی دوانێوەندیی خۆمان نەبێ و، بۆ دەبێ بە کوردی نەخوێنین".حەسەن زەلزەلە، کەمێك مات بوو گوتی: "راستدەکەن. بەلام چارچییە؟" گوتم: چار ئەوەیە بەرەسمی رێبدرێ بە من وانەی کوردی بلێمەوە و مێژووی کورد باسبکەم بۆیان و...هتد". گوتی: "زۆرباشە و رازیم". دەستبەجێ نامەی نووسی بۆ وەزارەتی پەروەردە و فێرکاری بۆ رازیبوون. ئەز ژی، بەو پەڕی دلخۆشییەوە، نەخشەی پەرتۆکێکی کوردیفێربوونم ئامادەکرد و، بەڕێوەبەریش سالۆنێکی گەورەی خستە ژێر دەستم بۆ ئەو کارە و، چەند مامۆستایەکیش، لەوانە شێخ عەبدولزەهرە و خزعل محمود (کە مامۆستای زانستی ژینەوەران و، خوشکەکەی ژنی پیاوێکی خەلکی سلێمانی بوو) گوتیان دێن بۆ گوێگرتن. پاش مانگێك، وەرامێك هاتەوە بۆ قوتابخانە کە "ئەو کارە کارێکە لە پرۆگرامی خوێندندا نییە و رێی پێنادرێ". ئیمزا؟ کێ ئیمزای کردبێ باشە؟ دوکتۆر سەدیق

ئەترووشی، کە ئەو دەمە لە وەزارەتی زانیاریی عێراق بەرپرسی بەرنامەی خوێندن بوو.

کاتێك لە زانستگەی بەغدا (کۆلیژی پەروەردە) خوێندکار بووم، دوکتۆر سەدیق ئەترووشی لەوێ تۆمارکەر (مُسَجّل) بوو، بە دزییەوە نەبوایە، بە کوردی قسەینەدەکرد. هیچ جۆرە چالاکییەکی رامیاری پێوە دیارنەبوو. کە قاسم هاتە سەرکار، یەکسەر خۆی گەهاندە کۆمۆنیستەکان و، دەستیکرد بە عێراقچێتی و هەر لەبەر خاتری وان، وتاری بلاودەکردەوە بۆ لایەنگریی بنەزاری بادینانی. چۆنکە ـ وەك حەمەی مەلا کەریمی ـ سەر بە پارتی کۆمۆنیستی عێراق جارێکیان راست دانیپێدانا ئەم شەڕە سۆرانی و بادینانییە، برادەرەکانی وی دایانهێنا، ئەوەش لە دژی پارتی و بۆ حیزبحزبێنە بوو. سەدیق ئەترووشی بۆ خۆشخزمەتیی وان بادینانچێتی بلاودەکردەوە، وەك چۆن مەحمود عەلی عوسمان خۆی نێونا دوکتۆر مەحموودی سۆرانی و سۆرانچێتی بلاودەکردەوە.

کە بەعسییەکان لە 1963/2/8دا قاسمیان کوشت و کەوتنە وێزەی کۆمۆنیستەکان دوکتۆر سەدیقی کوڕی رۆژ، کە خۆی تا ئەو کاتە لە نێو پارتەکانیشدا بەهێز کردبوو، بەهۆی ئەوەوە کە رێسان خانی ژنی، خۆشکی خێزانی مامۆستا برایم ئەحمەد بوو، رایکردە نێو پێشمەرگە، و چووە پەنای ئەو پێشمەرگانەوە کە نەیدەویست زمانەکەیان بخوێندرێ. بەڵام ئەوەبوو بەختی نەیهێنا و لە شاخ مرد. بەڕاستی سەیرە! زۆر کەس هەن شانازی بەوە دەکەن کە چوونەتە شاخ، بەڵام ئەوە ناهێننە بەرچاو، کە هەر شێر و پڵنگ بە شاخەوە نین، گورگ و بزنەکێویش بە خۆی و ریشیەوە بە شاخەوەن.

لە پاییزی 1958 دا وتارێکم نووسی لە رۆژنامەی "صوت الاهالي" دا لەمەڕ بەرپێچدانەوەی یەکێك لە سەرکردەگەورەکانی حیزبی بەعس ریاچ گە، کە داوای

تواندنەوەی کوردی کردبوو. وتارەکەم لەژێر نێوی "الکرد المفترى علیهم" بوو، زۆر دەنگی دایەوە. محەمەدی مەلا کەریم وەریگێرایە سەر کوردی و لە گوڤاری "هیوا" زمانی حالی "یانەی سەرکەوتنی کورد" لە بەغدا لە 1959 دا بلاویکردەوە.

بەهۆی دۆستایەتیمەوە لەگەڵ شێخ عەبدولزەهرە، توانیم لە بەهاری 1959 دا سەرێکی رێبەری شیعەکانی ئەوسەردەمە، سەید موحسین حەکیم بدەم لە نەجەف. سەید موحسین پیاوێکی سادە و خاکی و زمانشیرین و، لەماوەی چەند دەمژمێر و توویژ لەگەڵی، بۆم دەرکەوت کە بەڕاستی سەری لەگەلێك شت دەردەچێ. بە عەرەبیش و بە فارسیش بێگرێ و گۆڵ قسەیدەکرد. هێندە رێزی منی گرت، کە ئەز لەو تەمەنە کەمەدا بووم، شەرمم بەخۆم هات. پێکەوە، سەید و شێخ عەبدولزەهرە و من نانێکی نیوەڕۆی، وەك کورد دەبێژن دەرویشیمان خوارد و کە ماڵاواییم کرد لێی تا بەردەرگەی "منتدى النشر" کە شوێنی وانەگوتنەوەی بوو، لەگەڵمان هات و گوتی: "زۆر دڵمخۆش بوو بە بینینت، بە برا کوردەکانم بێژە دان بەخۆدابگرن، دەوڵەتی مەیموون درێژە ناکێشێ"، وگوتی: "ألظلم إن دامَ دمَر" و، لە کاتی قسەکردندا داوایکرد لێم، ئەگەر بتوانم کورتەیەك لە بارەی کورد و بەسەرهاتەکانیان و داخوازییەکانیانەوە بنووسم بۆی. بەڵێنم دا پێی و، کە گەرامەوە بەغدا نێزیکی 70 لاپەرەم لەو بارەیەوە نووسی و دامە دەست شێخ عەبدولزەهرە و بردی بۆی. ئەز یەکەمین کەس بووم کە باسی کورد و کێشەکەیم بە سەید موحسینی رەحمەتی گەیاند. ئەو فەتوایەی کەدای، ئەوە لە خۆوە نەهات. ئەو دۆستایەتییە کە سەید بەرامبەر کورد نیشانیدا ـ وەك ئەوڕۆ باسی دەکەن ـ باپیرانی کەس دایاننەمەزراند. ئەو دەمەی کە چوومە سەرەدانی سەید، یەك کەس لە سیاسەتکارەکانی کورد، سەیدیان بە خەیالدا نەدەهات، لە بەغدا باسی مارکس و لینین و ستالینیان دەکرد.

پاش ئەوەی دوو ساڵ لە قوتابخانەی جەعفەرییە وانەم گوتەوە، ئەوجا ویستم بمگەڕێننەوە بۆ کەرکووك. گوتیان جارێ دەبێ بچیتەوە بۆ زوبێر. چووم سەرێکی زوبێرم دایەوە. لەو ماوەیەدا "بەڕێوەبەرێتیی دیراساتی کوردی" لە باتی "بەڕێوەبەرێتی زانیاریی کوردستان" کە ئێمە داوامانکردبوو، دامەزرابوو، دوکتۆر جەمال شەفیق کرابوو بە بەڕێوەبەری، سادق بەهائەدینی ئامێدیش لەوێ کارێکی هەبوو. گوتیان: ناتوانین بتنێرینەوە کەرکووك، بەڵام دەتوانین کارەکەت بگوێزینەوە هەولێر. گوتم: باشە. ساڵی 1960 بوومە مامۆستا لە قوتابخانەی دوانێوەندیی هەولێر.

لێرەدا ناتوانم بە دووروودرێژی باسی بەسەرهاتی ئەو ساڵە بکەم، کە گەلێك لایەنی خۆش و ناخۆشی تێدابوو. هەر هێندە دەبێژم ساڵی 1960 ئەو سەردەمەبوو، کە قاسم گێڕی گۆڕیبوو بەرامبەر کۆمۆنیستەکان و، گەلێك لە کۆمۆنیستەکان، لە لایەن تیرۆریستانی سەر بە بەرەی بەعس و تۆرانییەوە، لە بەغدا و مووسل و کەرکووك تیرۆرکران و هێندەك لە مامۆستا و قوتابییەکانیان رایانکردبووە هەولێر. بەر لەوەی بچمە هەولێر، وەك نووسەرێکی بەرهەڵستکار (معارض) ناسرابووم، بەتایبەتی لە ڕێی ئەو زنجیرە وتارەوە کە لە ژێر نێوی "ألابجدية الكردية اللاتينية بين دعاتها ومعارضيها. رد على أضاليل وأباطيل جريدة أتحاد الشعب". ئەم بابەتەم بە زنجیرەیەکی پەنجا وتاری لە رۆژنامەی "صوت الاكراد/دەنگی کورد" دا لە 1960 دا بلاوکردەوە کە، لە بەغدا عومەر جەلال حەوێزی خاوەنی بوو و، منیش ماوەیەك، سەرپەرشتیی بەشە عەرەبییەکەیم دەکرد و مامۆستا حەمە تۆفیق وردی سەرپەرشتیی بەشە کوردییەکەی دەکرد. وتارەکان بە بۆنەی ئەوەوەبوون کە بەهادین نووری

سکرتێری گشتیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، له رۆژنامەی "اتحاد الشعب" ی ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقدا، به نێوی خواستەمەنییەوە وتارێکی دژی من نووسیبوو، هەچەندە نێوی منی نەهێنابوو، بەڵام هەوڵدانی منی بۆ بڵاوکردنەوەی ئەلفوبێی لاتینی بەکارێکی کۆنەپەرستانە و ئیمپریالیستانە و دژ به یەکێتیی عێراق دابووە قەڵەم. بێجگە لەوەش، پێشەکییەکم بۆ کۆمەڵە هۆنراوەیەکی کامیل ژیر کە بە نێوی "کوردایەتی" یەوە بوو نوسیبوو، کە حەمەی مەلا کەریم بە فەرمانی حیزبی کۆمۆنیست بەر "نەشتەرە کۆڵە" کەی دابوو. منیش بەرامبەر بەوە و بەنێوی خواستەمەنیی "زەرەدەشت" ەوە، نامیلکەیەکم بڵاوکردەوە "کوردایەتی، بزووتنەوە و بڕوا و رژێم" و بەرپێچی قسەکانی حەمەی مەلا کەریمم دابووەوە. هەروەها زنجیرەیەك وتارم له دژی وتارەکانی مامۆستا مەسعود محەمەد بلاوکردبووەوە لەژێر نێوی "حول مفاهیم خاطئة في القومية الكردية" له رۆژنامەی "صوت الاكراد" له 1960 دا.

له بارەی زمانیشەوە، له حوزەیرانی ساڵی 1960 دا، "هەندێك زاراوەی زانستی"م له چاپخانەی کامەران له سلێمانی و "سەرەتای میکانیك و خۆمالەکانی مادده"م له بەغدا له چاپدا و، هەر لەو ساڵەشدا زنجیرەیەك وتارم نووسی له گوڤاری "رۆژی نوێ" دا کە له سلێمانی دەردەچوو، لەژێر نێوی "زاراوەکانی لیژنەی (ریاضیات) لەژێر وردەبینی لێکۆلینەوەدا" و، گەلێك هەڵەم راستکردەوە بۆیان.

کە چوومە هەولێر، ئەوانەی سەر بە هێڵی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوون، بوونی منیان لەوێ پێخۆش نەبوو. بەهەموو جۆرێك هەوڵیاندا دزانە خراپە بکەن لەگەڵم، هەر بەو بۆنەیەوە 6-5 مانگ، مانگانەیان نەدا پێم، بە بیانووی ئەوەوە کە "دۆسێیەکەم ون بووە". بەڵام من وانەم گوتەوە. هەر بە گەیشتنم بەوێ،

لەگەڵ مامۆستا مەلا عەبدولحەمید ئیسماعیل، لیژنەیەکمان دروستکرد بە نێوی "لیژنەی پێشخستنی زمان و وێژەی کوردی" .

ئەو سەردەمە مامۆستا عادیل مستەفا بەڕێوەبەری قوتابخانەی دوانێوەندیی هەولێر بوو، ئەو بەڕێزە زۆر هەلپەرست بوو، لەگەڵ هەر کەسێك دابنیشتایە، بە دڵی ئەو کەسە قسەیدەکرد، بەڵام ناچار بوو، لابۆر (مختبر) ە کەی قوتابخانە بخاتە ژێر دەستمان، بۆ ئەوەی بەشێکی بکەین بە نامەخانەیەك و، سەتان پەرتۆکی کوردی و سەر بە کوردمان تێدا کۆکردەوە و، لە پۆلی وانەگوتنەوەدا، بە کوردی وانەم دەگوتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانەی دژی ئەو کارە بوون گلەییان گەیاندبووە وەزارەتی زانیاری و، وەزارەتیش پشکنەری ماتماتیك، مامۆستا سەعید سەفۆ، کە دیانێکی خەلکی مووسڵ بوو و، لە بەغداوە دەمناسی، نارد بۆ لێکۆلینەوە لە باسەکە و، لە بەردەمی ویدا بە کوردی و بە عەرەبی وانەم گوتەوە، کە گەڕایەوە بەغدا، نامەیەکی سوپاسی نارد بۆم. لەگەڵ ئەوەشدا، رۆژێکیان قوتابییەکی هەولێری، لەبەر دەمی قوتابخانەدا منی دواند و گوتی: "ئەریٚ مامۆستا تۆ لۆ لۆ کوردییەکەی هێندە تەنگاویت؟ زۆر پێکەنینم بە قسەکەی هات و گوتم: ئەدی، تۆ لۆ بە کوردییەکەی هێندە تەنگاویت؟ پاش قسەکردن لەگەڵی، بیری گۆڕا و ئەویش، وەك مومتاز حەیدەری، کە زۆر بە کوڵ و دڵەوە لە لیژنەکەدا کاریدەکرد، هاتە ریزی لیژنەکەوە.

مامۆستایەکانی هەولێر، دابەشبووبوون بە سەر دوو حیزبدا، پارتی و کۆمۆنیست، کە هەردووکیان بە فەرمی (رەسمی) کاریاندەکرد و، ژمارەیەکی یەکجار زۆر مامۆستاش هەبوون، چ لە نێو شاری هەولێر و چ لە دەرەوەی، کە سەر بە هیچ لایەکیان نەبوون. پێوەندیمکرد پێیانەوە و، بووینە کۆمەڵێکی بە ژمارە زۆری ناحیزبی و، چووینە هەلبژاردنی سەندیکای مامۆستایانەوە. پارتییەکان بە

سەرۆکایەتیی بەڕێز عەلی عەبدوللا، لەگەڵ کۆمۆنیستەکان لە دژی لیستەکەی ئێمە، کە لیستەی "سەربەخۆکان" بوو، بوون بەیەك، لە ئەنجامی هەلبژاردندا ئەوان بردیانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە نێزیکەی 300 دەنگێکمان هێنا. بەرزترین دەنگ جوانەمەرگ مامۆستا کاڵی موکریانی، کچی مامۆستا گیوی موکریانی وەدەستی هێنابوو، پاش ئەویش ئەز.

پاش ئەوەی چەند مانگێك مانگانەی منیان راگرتبوو، رۆژێکیان لەسەر شەقامی بەرەو قوتابخانە، بەڕێز دادوەر بورهانم چاوپێکەوت، کە لە سلێمانییەوە دەمناسی و، باسی کێشەی مانگانەکەمی پرسی لێم. پێمگوت هێشتا نەدراوە. گوتی سبەینێ شکاتێك بنووسە و بیدە بەمن، بزانە برای خۆت چون هەق دەداتە دەستت. کە ئەوەمکرد، مامۆستا عادیل مستەفای بەڕێوەبەر و بەڕێوەبەری زانیاری نەشئەت سەفوەت، پەنایان بردە بەر مامۆستا گیوی موکریانی و هەر ئەو رۆژە دۆسێیەکەم دۆزرایەوە و لەبەر خاتری مامۆستا گیو لێیانبوردم، شایانی باسە لەگەڵ شکاتنامەکەم، ئێدی نەچوومە پۆلی قوتابخانەوە و، ئەوە ئاژاوەیەکی گەورەی لە هەولێردا دروستکرد و راستە خەلکەکەش هەموو پشتی منیان گرت.

بێجگە لە قۆتابخانەی دوانێوەندی، پاش کۆچیدوایی مامۆستا حەیدەر محەمەد ئەمین کە لە قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتایی زمانی کوردی دەگوتەوە، مامۆستا مەجید ئاسنگەر، یادی بەخێر بێ، گوتی: حەزدەکەم تۆ زمانی کوردی بلێیتەوە لە جیاتی من ـ چۆنکە ئەویان دانابوو بۆ ئەو کارە ـ مامۆستا مەجید گوتی: "تۆ ئەو کارە باشتر دەکەیت لە من". لەماوەی ئەو ساڵەدا هەولێکی زۆرم دا کە، وا لە قوتابییەکانم بکەم، خەریکی باشتر فێربوونی زمانی کوردی بن. پاشان، گەلێکیان بوونە مامۆستای زمانی کوردی. لەو سەردەمەدا "فەرهەنگۆکی زانستیی" و کۆمەڵە وانەکانم لە ژێر نێوی "زمان و ئەدەبیاتی کوردی"دا بە

ڕۆنیۆ چاپکرد و بلاّوکردەوە بەسەریاندا. هێندەك لەوانەی کە چاویان بە خزمەتکردنی زمانی کوردی هەڵئەدەهات، دەیانگوت: "ئەوە چییە، زمانی کوردی لە فیزیا و کیمیا گرانتر کراوە!!".

دەمێك بوو دەمویست خوێندنی خۆم لە ئەورووپا درێژە پێیبدەم، بەلاّم کاربەدەستانی وەزارەتی زانیاری ڕازی نەدەبوون، بە بیانووی ئەوەی کە مامۆستای ماتماتیك و فیزیك کەمن و پێویستییان بە خزمەت و کاری من هەیە، بێگومان ئەوەش درۆ بوو، ئەگەر مەبەست پێویستیی بووایە، هێندە خراپە بەرامبەر من نەدەکرا. پاش ئەوەی کە چەند جارێك نامەی خۆکشاندنەوە (استقالة)م نووسی و وەرنەگیرا، ئەوجا چوومە ماڵەوە و دانیشتم، تا ناچارمان، بە "خۆکێشەرەوە" (مستقیل) دابمنێن.

بە کورتی پێشهاتەکەی زوبێر، مەبەستم وتارەکەمە لە بارەی وشەی بیانی لە زمانی کوردیدا، هەروەها تاقیکردنەکانی وانەگوتنەوەی ساڵانی دوای ئەوە لە بەغدا و هەولێر، چەند تەکانێکی دیکەیان دا بە منەوە، کە بەرەو خۆخەریککردن بە زمانەوانی و، لێکدانەوەی بنچینەی وشەکانی زمان پتر بجووڵێم، ئەوجا ئەمە، نەك هەر بۆ زمانی کوردی، یان عەرەبی، یان فارسی، یان ترکی، بەلکو بە تێپەڕبوونی کات و بەتایبەتی لە ئەورووپا، گەلێك زمانی دیکەم خوێند و، کوورتر خەریکی زمانەوانی بووم، ئێدی، بنیاتی وشە بوو بە بەشێك لەو شتانەی بەلامەوە بالکێش بوون. بەلاّم بەداخەوە، هەر وشەیەکم ساخ بکردایەوە، تۆمارمنەدەکرد لە دەفتەرێکدا بۆ پاراستنیان، تا لەم سالانەی دواییدا، جاروبار، کە وشەیەك بهاتایە بە خەیاڵمدا و، ڕەگەکەیم بۆ دەربهێنرایە، لەسەر پارچە کاخەزێك دەمنووسی و هەڵمدەگرت. کە ژمارەی ئەو پارچە کاخەزانە، لەگەڵ کات، زۆر بوو، کەوتمە سەر

کەڵکەڵەی ئەوەی وشەکان بخەمە نێو دەفتەرێکەوە، بێگوێدانە ریزکردنیان بە پێی ئەلفوبێ. چۆنکە بە تەمای چاپ و بڵاوکردنەوەیان نەبووم.

رۆژێکیان چوومە سەرەدانی برای هێژا و بەرێز هۆشەنگ ئاپۆ ئوسمان سەبری، کە ئەویش دەرمانخانەکەی لە بەرلین، هەروەك دوکانی (ئوستاد) بەشیر موشیر لە بەغدا، بووە بە "کوردخانە". بەرێکەوت، لەپال قسەکردنماندا لە ئێتمۆلۆژیای چەند وشەیەکی کوردی، باسی ئەو دەفتەرەم کرد، بەرێز هۆشەنگ، زۆر بە کوڵ و دڵەوە حەزی بە چاپکردنی ئەو بەرهەمە پێشاندا. پاش ئەوەش، هەر کاتێك چاومان بەیەك بکەوتایەوە، یەکسەر پرسیاری ئەو وشەنامەیەی دەکرد لێم و، دەیگوت پێویستە بکەوێتە بەر دەست خەلك و، منیش پێمدەگوت کارەکە هێشتا بەرکوڵە و، کاتی ئەوەشم نییە تایپی بکەم و، بۆ چاپ ئامادەی بکەم و، کەسێکیش ناناسم دەستەبەر بێ بە تایپکردنی، بەلام ئەو هەر سۆر بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی و، گوتیشی "باشە یەکێك دەدۆزمەوە تایپی بکات". هەر دوای ئەوە، یەکێکی بۆ ئەو کارە پەیداکرد و هەر چەندێکیش کردم و کۆشام، رێینەدا کە کرێی تایپکردنی بدەم و گوتی: "تۆ ئەو زەحمەتەت داوە بە خۆت، با بەشێکی منیش لەو کارە خێرەدا هەبێ، کە ئەوەش هەر بۆ خزمەتی گشتییە". هەر جارێکیش دەمبینێ، داوای ئەوە دەکا لێم، کە ژیننامەی خۆم بنووسم و بیدەمە دەستی. وا لەم پێشگۆتنەدا، کورتەیەك لە داخوازییەکەیم هێناوەتە دی.

کورت و کرمانجی پاڵپێوەنەری هاتنە کایەی ئەم "وشەنامەك"ە، جوامێریی هێژا هۆشەنگ بوو، ئەز ژی لێرەدا، پڕ بە دڵ سوپاسی هەستی نیشتمانپەروەرانە و پشتگیریکردنی لە راژەی کولتووری کوردی دەکەم.

هەرچی ئەم کارەشە، ئەوا یەکەمین هەنگاوە لەم پێناوەدا و، هەرچەندە بەم شێوەیەی بە دڵی من نییە، بەلام کەوتنەرووی بەناتەواوییەوە، باشترە لەوەی لە

پاش نەمانی خۆم سەریتێدابچێ چۆنکە، هیچ نەبێ هاندەرێك دەبێ بۆ ئەوانەی حەز لەم بابەتە دەکەن.

هێژای گوتنە، کە نێوی ئەم بەرگەم ناوە "وشەنامەك"، نەك "فەرهەنگ". چۆنکە سنووری فەرهەنگ گەلێك فراوانترە لە سنووری زمان و وشە و، مانای راستینەی فەرهەنگ، وشەی کولتوور Kultur ی ئەوروپاییە، نەك قاموس، کە بنەڕەتێکی لاتینی هەیە (Campus) و، لە زاری عەرەبیدا بۆ پەرتۆکێك بەکاردەبرێ کە تەنێ وشە و ماناکانیان بگرێتە خۆی. چەند زمانێکیش هەن کە "وشەنامە" (پەرتۆکی وشە) بۆ قاموس بەکاردەبەن، وەك ئەڵمانی Wörterbuch و سوێدی Ordlista.

وشەکانی ئەم بەرگە بە پێی تیپی لاتینی و، بەم شێوەی خوارەوە ریزکراون:
a ئا، b ب، c ج، ch چ، d د، e ئە، e´ع، ê ئێ، f ف، g گ، h ه، ĥ ح، î ئی، j ژ، k ك، l ل، m م، n ن، o ئۆ، p پ، q ق، r ر، s س، sh ش، t ت، u ئو، v ڤ، w و، x خ، xh غ، y ی، z ز.

وەك لە سالانێکی کۆنەوە باسمکردووە، پێموایە ئەلفوبێی لاتینی، لەبەر گەلێك هۆی خۆیی و ناخۆیی، پتر لەگەڵ زمانی کوردی دەگونجێ، وەك لەو تیپانەی کە لە نێو خەڵکدا بە تیپی عارەبی، یان فارسی ناسراون و، لە بنەڕەتدا تیپی ئارامین، کە زمانی ئارامیش زمانی کۆنی جووەکان بوو و، ئەمەشم بۆ یەکەمین جار لە پەرتۆکی "زمانی یەکگرتووی کوردی" دا ئاشکراکرد، کە لە بەرلین لە 1974/2/21 دا تەواومکردووە و، چاپی یەکەمی لە بامبێرگ (ئەلمانیا) لە 1976 دا دەرچووە. بەکارهێنانی تیپی لاتینی لە جیاتی تیپی ئارامی، لەبەر ئەوە نییە کە کورد لە نووسیندا، خۆیان لە عەرەب و فارس جیابکەنەوە. ئەگەر ئەوەبێ، ئەوە بیانوویەکی نەزانانەیە. زمان وەك جلك وایە، کە پێویستیت هاتە سەر جلك، دەبێ

جلكێك لەبەر بكەیت كە بە بەرت بكات، نەك جلكێك لەبەر نەكەیت لە خۆشنەویستنی كەسێك و، جلكێك لەبەر بكەیت لە خۆشەویستیی كەسێكی دی. تیپی لاتینی، چ لە بارەی ئاسانییەوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەم تیپە كۆنە و، چ بۆ دوارۆژی زمانی كوردی، بەتایبەتی بۆ نێزیكبوونەوە لە زۆربەی زمانە زیندووەكان، كە بوونەتە زمانی زانست و تەكنیك لە جیهاندا، یەكجار سووتبەخشترە لەمەی ئێستە.

ئەو بیانووەش كە دەهێنرێتەوە بۆ بەكارنەهێنانی تیپی لاتینی، كە گوایە ئەلفوبێی لاتینی، پێوەندیی كورد بە كولتووری رابوردوویەوە دەپچڕێنێ، زۆر لاوازە. چۆنكە ئەگەر بێتو هەموو ئەو پەرتۆكانەی كە بەم تیپانە بە زمانی كوردی نووسراونەتەوە، كۆبكرێنەوە، لە چەند هەزارێك تێپەڕناكات و، دەتوانرێ بەرەبەرە، ئەوانەی بە كەڵك دێن، وەربگێڕدرێنە سەر ئەلفوبێی لاتینی. دیارە، وازهێنان لە ئەلفوبێی كۆن بە كوتوپڕی نابێ، بەلكو لەسەر خۆ و هەنگاو بەهەنگاو جێی خۆی دەگرێ و، دەبێ لە باشووری كوردستانەوە دەستپێبكات و كاربەدەستانی پەروەردە و زانست پشتگیریی تەواوی بكەن، ئەگەرنا سەرناگرێ.

دەمێنێتەوە سەر ئەوەی كە ئەم ئەلفوبێ كۆنە، ئەلفوبێی قورئانە و، نابێ دەستهەڵبگیرێ لێی، خۆ ئەگەر ئەو كارە بكرێ، ئێدی كەس لە قورئان ناگات. دیارە ئەمەش بەڵگەیەكی ساویلكانەیە. قورئان بە شێوەزاری چوارسەت سەتە لەمەوبەری هۆزێكی عەرەبە، كە نەك هەر ئەوانەی عەرەب نین لەو زمانە ناگەن، بەلكو عەرەبەكان خۆشیان، ئەگەر قورئانیان پێنەخوێندرابێ، ئەوا تێیناگەن. ئاشكرایە، ئەو كوردانەی دەیانەوێ ببنە پسپۆر لە ئاینی ئیسلامدا، وەك مەلاكان و خوێندكارانی بەشی ئێزدناسی (إلهيات)، دەبێ زمان و وێژەی عەرەبی بە كووری (قووڵی) بخوێنن و، راستە خەلكەكەش، قورئانی وەرگێردراو لەلایەن

شارەزایانەوە، بە زمانی کوردی بخوێننەوە. بێجگە لەوەش ـ وەك گوتمان ـ ئەلفوبێی عەرەبی لە بنەڕەتدا، ئەلفوبێیەکی ئیسلامی نەبووە و، زمانی عەرەبیش لە پێش هاتنەخوارەوەی قورئاندا، زمانی بتپەرستەکان بووە.

ئێستە، کە ئاوا بێپێچوپەنا، لایەنگریی ئەلفوبێی لاتینی دەکەم، مەبەستم ئەوە نییە ئەو ئەلفوبێیەی کە ئەورۆ لە نێو کوردی رۆژاڤا و باکووردا باوە، کوتومت وەربگیرێ، بەڵکو دەبێ دەستکاریبکرێ و، ئەوەشم پەنجا ساڵ لەمەو بەر لەگەڵ رەوانشاد ئاپۆ عوسمان سەبری، کە کوردیزانێکی ژێهاتی بوو، باسکردووە (سەرنجی نامیلکەی: جەمال نەبەز: نووسینی کوردی بە لاتینی بدە، کە لە کەرکووك لە 1957/6/26 دا تەواومکردووە و، لە بەغدا لە 1957دا چاپی یەکەمی دەرچووە و، چاپی دووەمی لە سوێد لە 1987 دا دەرچووە).

بەڕای من، دەبێ خۆمان لە چوکڵە و کڵاوەکان دووربخەینەوە. بۆ وێنە: ش بەشێوەی ş و چ بە شێوەی ç و غ بەشێوەی x̃ نەنووسین، بەلکو بۆ ش **sh** و بۆ چ **ch** و بۆ غ **xh** بەکارببەین و، لە جیاتی ی، î بەکارنەبەین، بەلکو **i** بەکارببەین و، واز لە بزرۆکە (الکسرة المختلسة) بهێنین، کە لە ئەلفوبێی کۆندا دەرناکەوێ و، لە ئەلفوبێی لاتینیدا بە (**i**) نیشانەدەکرێ. بو وێنە: کردن وا: **kirdin** نەنووسین، بەلکو، وا: **krdn** بنووسین.

رێی ی قەڵەو (ڕ) وا: ř نەنووسین، بەڵکو وا: **rh** و لە جیاتی لێی قەڵەو (ڵ) وا: l' نەنووسین، بەلکو، وا: **lh** بنووسین. (سەرنجی **Jemal Nebez: Alfabêya kurdî, ZEND, Kovara Enstîtuya Kurdî, Istenbul, Bihar 94, Hejmar 1, L 47-50.**). لەگەڵ ئەوەشدا، لەم بەرهەمەدا، پێڕۆیی هەموو ئەم پێشنیازانەم نەکرد، بەلکو تەنێ **ch** و **sh** و **xh** م لە جیاتی چ و ش و غ بەکاربرد

و، ئەوانەی دیکەم، هەر وەك ئەلفوبێی لاتینیی باو، بەکاربرد، بە هیوای ئەوەی ڕۆژێك بێ، سەرنج و تێبینییەکانم لەو بارەیەوە بنجی خۆیان دابکوتن.

خوێنەرەوە لەم پێشگۆتنەدا دەبینێ، بنەڕەتی بیرکردنەوەم لە وشەی کوردی بەتایبەتی و، زمانی کوردی بە گشتی، تەنانەت خەریکبوونم بە مێژوو و کولتووری کوردەوە، دەگەڕێتەوە بۆ هەستکردنم بە بەشخوراویی کورد، وەك کەسێك کە بەڕێکەوت و، بێ ئەوەی هیچ پرسێك کرابێ پێم، لە نێو ئەو کۆمەلگەیەدا پێم ناوەتە مەیدانی ژیانەوە. چۆنکە، ئەگەر لە جیاتی کوردستان، لە چین لە دایکبوومایە، چینی دەبووم، نەك کورد. خۆ ئەگەر لەوێش لە دایکبوومایە و، بمزانیایە کورد هەن و دەچەوسێندرێنەوە، بەپێی توانستی خۆم یارمەتیم دەدان. لەبەر ئەوە خزمەتکردنی زمان و کولتووری کورد و، لەسەرکردنەوەی مافی کورد، پێوەندیی بە ناسیۆنالیزم و ڕەگەزپەرستی و دژبیانێتی نییە، بەلکو پێوەندیی بە بنەمای یەکسانیی ماف و دەسەلاتی وەکیەکی مرۆڤەوە هەیە.

ئەمەیان لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە، بەکارهێنەری ئەم وشەنامەکە دەبینێ، کە چۆن گۆڕینی دەنگێك لە وشەیەکدا، وا لەو وشەیە دەکات کە بۆ مانایەکی دیکە بەکاربێ، واتە وشەیەکی نوێ دێتە کایە. هەروەها جێگۆڕکێی دەنگەکان لە وشەیەکدا، دەبێتە هۆی چێکردنی وشەیەکی دی بە مانایەکی دی.

شایانی باسە، بوونی وشەی کوردی لە زمانی عەرەبیی کۆندا و، بە تایبەتی لە قورئاندا، ڕەنگە یەکسەر لە ڕێی کورد خۆیەوە، نەبووبێ، بەلکو لە ڕێی عیبری زمانان و ئارامی زمانان و سریانی زمانانەوە بووبێ، کە ئەمانە هەر لە کۆنەوە پێوەندییان بە کوردەوە هەبووە. جوولەکەکان، پاش ڕەهەندەکردنیان بۆ ولاتی میدیا، لە نێو کورددا ژیاون و ئەوەتا هەتا ئەوڕۆش توانیویانە زمانە ئارامییە کۆنەکەیان، کە زمانی ئاینیان بووە بپارێزن، لە کاتێکدا، لە نێو عەرەب و ترك و

فارسدا، ئەو بوار و سەربەستییەیان نەبووە، زمانەکەشیان تا رادەیەکی زۆر کەوتووەتە ژێر کارکردی زمانی کوردییەوە. ئارامییەکانیش لە کوردستاندا، سالانێکی دوور و درێژ فەرمانڕەوابوون و، ئەوەتە هێندەك لە دیانەکانی کوردستان، ئەو زمانە ئاینییەیان پاراستووە، کە لە نێو عەرەب و ترك و فارسدا نەیانوێراوە بیپارێزن، سریانەکانیش هەروەها. بێجگە لەوەش ئەو قوتابییە عەرەبانەی کە لە سەردەمی پێش ئیسلامەتیدا هاتوونەتە حەڕان (هاران)ی نێزیك ئورفە (باکووری کوردستان) جۆرە تیپێکی عەرەبییان لەگەڵ خۆیان هێناوە کە لە ساڵی 568 ز. دا (واتە ماوەی چەند ساڵێك پێش هاتنی ئاینی ئیسلام بۆ کوردستان) لە تەنیشت چەند وشەیەکی یۆنانییەوە نووسراوە و، هەتا ئێستەش بەتەواوی شیرۆڤەنەکراوە. دووریش نییە، هێندەك وشە یەکسەر لە ئاڤێستاییەوە وەرگیرابێ، چۆنکە زمانی ئاڤێستا لە کوردستاندا قسەکراوە پێی و زمانی ئاینی بەشێکی کوردی ئەو سەردەمە بووە کە موسلمانان هاتوونەتە کوردستانەوە.

ئەو گەنجانەی دەیانەوێ خزمەتی کوردۆلۆژی بکەن، دەبێ نەك هەر خەریکی زمانی کوردی، بەهەمموو شێوەزار و بنزارەکانییەوە بن و بەس، بەلکو ئاوڕێك لە زمانە پێوەندیدارەکان بە کوردییەوە، وەك سانسکریت و ئاڤێستایی و پازەند و پارتی و سۆگدی و هەتیتی و پەهلەوی و پەشتوون و بەلووجی و ئۆسێتی و فارسی و لاتینی و یۆنانیی کۆن بدەن. بێجگە لەوەش زمانە سامییە کۆنەکان وەك ئارامی و سریانی و عیبری بخوێنن و هەوڵبدەن بە خەباتێکی گشتلایەنە خەریکی کۆکردنەوەی وشەی کوردی و بنەچە و ڕەچەلەك و خزمایەتییەکانیان بن و، هەر کەس چی دەستکەوت و چی بە بیردا هات، بینێرێ بۆ ماڵپەرێکی ئینتەرنێتی کە بە تایبەتی بۆ ئەم کارە دابمەزرێ. بۆ ئەوەی هەمموو کەسێك بتوانێ سەرنجی کارەکە بدات و بیروڕای خۆی لەو بارەیەوە دەرببڕێ و، ئەم کارانەش پاش چەند

ساڵێك، دەبنە بەرهەمێكی پوختە و بنەمایەك بۆ وشەنامەیەكی زمانەوانیی ئینسیكلۆپیدیایی.

زمانی كوردی، هەمووی سەتساڵێك نابێ كە كورد خۆی خەریكی خزمەتكردنێتی، پاش ئەوەی هەزاران ساڵ بوو خستبوویە پشت گوێ. دووسەت، سێسەتساڵێكیش دەبێ، كە ژمارەیەك لە رۆژهەلاتناسانی ئەوروپایی، وەك بابەتێكی لاتەنیشت، خۆیان پێوەخەریككردووە. بەرهەمەكانیان، بەداخەوە، كەمەیەكی كەمی لێدەرچێ، ئەوانەی دی، بە گیانێكی زانستانە نەنووسراون، بەلكو هەوڵدراوە كە زمانی كوردی، وەك چەند زمانێك بدرێتە قەڵەم. فەیلی و گۆرانی و سۆرانی و كرمانجكی (زازاكی) هەریەكێكیان بە زمانی سەربەخۆ دانراون، نەك بە شێوەزاری زمانی كوردی. بێجگە لەوەش، زمانێكی وەك پەهلەوی، بە "فارسیی نێوەڕاست" دراوەتە قەڵەم، لە كاتێكدا كە ئەمە راست نییە. پەهلەوی زمانی فەرمی (رەسمی) ئیمپراتۆرێتیی ساسانی بوو، تا ئەو رۆژەی عەرەبە موسلمانەكان، پێتەختی ساسانیەكان (تەیسەفوون/ مەداین) یان گرت و تاقی كیسرایان رماند. ئەم فارسییەش كە ئەورۆ بەكاردەبرێ، ئەو كاتە هەبوو، چۆنكە ئەوەتە، هەر ماوەیەكی كەم پاش رۆچوونی ئیمپراتۆرێتیی ساسانی، رودەكی و فیردەوسی دەستیانكرد بە هەڵبەستدانان بە فارسی و، هەزاران وشەیان لە كوردییەوە وەرگرت، كە "شانامە" شایەتە بۆ ئەمە. باشە، خۆ پەهلەوی زمانێكی زیندوو بوو، جا ئەگەر پەهلەوی فارسی بوو، بۆچی پاش رووخانی دەوڵەتەكە، درێژەیان نەدا بە نووسین بەو پەهلەوییەی كە ئەوروپاییەكان كردوویانە بە "فارسیی نێوەڕاست" و ماوەیەكیش ئێمەیان پێهەڵخڵەتاند؟ لە كاتێكدا دەتوانین بێژین كە پەهلەوی زمانێكی دەستكردبوو، تێكەڵێك لە ئارامی و ئاڤێستایی و پاشماوەی زمانە كۆنەكانی دیكەی نێوچەی میدیا كە بنەچەی زمانی كوردیی ئەوڕۆن. پاش

ئەوەش، ئەگەر ئیمپراتۆریەتیی ساسانی، دەوڵەتێکی فارسی بوو و، پەهلەویش "فارسیی نێوەڕاست" بوو، بۆچی تەیسەفوون لە ولاتی فارسەکاندا نەبوو، بەلکو لە کوردستاندا بوو، چۆنکە ئێستەش، چوار هەنگاو لە تەیسەفوون دووربکەویتەوە، کوردستان دەستپێدەکات.جلەولا و شارەبان و زەرباتییە و مەندەلی ئێستەش کوردستانن. پاشان، بۆچی، گرنگترین تێکستی پەهلەوی، لە پەیکولی و کرماشان و شوێنەکانی دیکەی کوردستاندا پارێزراون، نەك لە نێوچەی فارس؟ بەڕاستی دەبێ چاوێك بە زمان و مێژووی کورد و فارسدا هوردبینانە و زانستانە بخشێندرێتەوە، ئەوسا گەلێك راستینەی لە تاریکیدا قەتیس ماو، دەکەونە بەر تیشکی رۆناکی. یەکەمین هەنگاوی ئەمەش، بەهاتنەکایەی کۆلێجێك دەبێ کە بەتایبەتی بۆ خوێندن و لێکۆلێنەوەی بابەتەکانی کوردۆلۆژی دامەزرابێ، نەك لێدانی تەبڵ و زوڕنای "سۆرانێتی" و "بادینانێتی".

لەم سالانەی دواییدا و، پاش ئەوەی هەزاران کورد، لە ئەنجامی گەلێك هۆکارەوە، لە کوردستانەوە کۆچیانکرد بۆ ئەوروپا و ئەمریکا، بەهۆی خوێندن و تێکەڵبوونەوە لە گەڵ خەلك و فەرهەنگی ئەم ولاتانە، وشەی رۆژاوایی لە نووسینەکانیاندا بەکاردەبەن. ئەم وشانە، هێندێکیان پێویست نین، چۆنکە لە کوردیدا بەرامبەریان هەیە و، هێنانیان بۆ نێو زمانی کوردی تەنێ بۆ خۆپێشاندانە. هێندێکیشان پێویستن و ، دەبنە هۆی دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی. بەلام کێشەکە لێرەدا ئەوەیە ئەو وشانە لە هەموو زمانە رۆژاواییەکاندا، وەك یەك نانووسرێن و دەرنابڕدرێن. لەبەر ئەوە، ئەو کوردانەی لە شوێنە جیاوازەکانی ئەم ولاتانە دەژین، ئەوانیش بەو شێوە جیاوازانە دەیانخەنە زمانی کوردییەوە. بۆ وێنە: یەکێك دەنووسێ: "کەڵچەر"، یەکێکی دی دەنووسێ

"کولتوور"، ئەوی دەنووسێ "کەلتوور". لێرەدا دەبێ رێکەوتنێك هەبێ لەسەر ئەوەی، چ وێنەیەکی ئەم وشەیە بچێتە زمانی ستانداری کوردییەوە.

لە کۆتایی ئەم پێشگۆتنەدا دەخوازم بێژم کە بوونی ژمارەیەکی زۆر کوردی هەموو لایەکی کوردستان لە ئەوروپا، بە خوێندەوار و نەخوێندەواریانەوە و، تێکەڵبوونم لەگەلیان ساڵانی ساڵ، کارێکی وایکرد کە گوێبیستی گەلێك لە شێوەزارەکانیان ببم و بەشێکی زۆری لای خۆم تۆماربکەم و لەگەڵ یەکدی بەراوردیان بکەم و لێیانبکۆڵمەوە. ئەوەش یارمەتییەکی باش بوو، چ بۆ فەرهەنگەکەم (فەرهەنگی ئەلمانی ـ کوردی، کە هێشتا چاپنەکراوە) و چ بۆ هێنانە بەهەمی ئەم وشەنامەکە، کە دیارە، وەك یەکەمین هەنگاوێکی دەستپێشکەرانە، هەڵە و ناتەواوییەکی فرەی تێدا هەیە و، تکای منیش لە هەموو لایەك ئەوەیە، بە چاوێکی هوردبینانەی بابەتهەڵسەنگێنەرانەوە، لە بیروبۆچوونی خۆیانم بگەیەنن، بۆ ئەوەی ئەگەر ژیانم بە بەرییەوە مابوو و، چاپێکی دی هاتە کایە، ئەوا ئەو سەرنجانە، بە سوپاسەوە، بخەمە بەرچاو و، گەلێك وشەی دیکەشی بخەمە سەر، بەلکو ئەو دەمە لە "وشەنامەك" ەوە ببێتە "وشەنامە".

جەمال نەبەز

بەرلین 2007/7/7

[1]. لێرەدا هێندەك لەو كارانە باسدەكەم: لە یەكەمین ژمارەی گۆڤاری "صدى المستقبل" دا كە لە 1953/11/1 دا دەرچوو، وتارێكم نووسی لەژێر نێوی " كيف تتعلم اللغة الكردية" و، بە تەمابووم لە ژمارەكانی دوای ئەوەشدا، درێژە بەو وتارە بدەم و، وتاری دیكەش بنووسم، بەڵام، تەنێ دوو ژمارە لەو گۆڤارە دەرچوو، چۆنكە هەر پاش دەرچوونیژمارەی یەكەمی بریاری داخستنی درا. گۆڤارەكە دەبوو هەفتانە بێ، بەڵام لە سەرەتاوە بریاردرا، جارێ لە مانگێكدا دوو ژمارە دەربچێ لێی. خاوەنەكەی رسمي العامل و، بەڕێوەبەری بەرپرسیاریش عبدالكريم الشيخ داوود بوو، كە هەردووكیان چەپاژو و دژ بە رژێمی عێراق بوون. رسمی العامل لە سەردەمی عبدالكريم قاسم دا، بوو بە لایەنگری محەمەد حەدید (محمد حديد) كە یەكێك بوو لە سەركردەكانی پارتی نیشتمانیی دێمۆكراسی (ألحزب الوطني الديمقراطي) بە سەرۆكایەتیی كامل چادرچی و، بە هاندانی قاسم جیابووەوە لێی و، پارتی نیشتمانیی پێشكەوتنخواز (ألحزب الوطنى التقدمي)ی دامەزراند. رسمی العامل لە 1961 ەوە تا سەردەمی رۆخانی رژێمی قاسم لە شوباتی 1963 دا، رۆژنامەیەكی بە نێوی "المستقبل" ەوە دەردەكرد كە زمانی حالی ئەم حیزبە بوو. وابزانم دوایی رسمی العامل تیرۆر كرا.

لە رۆژنامەی "صدى الاهالي" دا كە ئۆرگانی پارتی نیشتمانیی دێمۆكراسی بوو، لەساڵی 1952 دا وتارێكم نووسی لە بارەی مافی خوێندەواری و رۆشنبیریی كوردەوە كە رۆژنامەكە سەرنێوەكەی كردبوو بە "ألحقوق الثقافية للمواطنين الاكراد" لەوێدا باسی ئەوەم كردبوو كە قوتابیی و خوێندكاری كورد زمانی عەرەبی بە زۆر دەسەپێندرێ بەسەریدا و لە زمانی زكماكی خۆی بێبەشدەكرێ. ئەم رۆژنامەیە پاش قەلەمباز (إنتفاضة)ی تیشرین 1952 داخرا.

لە رۆژنامەی "صوت الاهالى" دا كە زمانی حالی "پارتی نیشتمانیی دێمۆكراسی بوو، لە ساڵی 1954دا وتارێكم نووسی وەك بەرپێچدانەوەی سەركۆماری ئەو دەمەی رژێمی ترك جەلال بایار، كە لە سەفەرێكدا بۆ ئەمریكا گوتبووی "لە تركیا هەر ترك هەن". هەر لەو ژمارەیەدا، نووسینێكی رەحمەتی پارێزەر برایم ئەحمەدم بەنێوی "بەرەو رۆناكی" (نحو النور) كردبوو بە

عەرەبی. وتارەکەم لە ژێر نێوی "سیاسة تتريك الاكراد في تركيا" بوو. بە هۆی نەسیری کوڕی کامیل چادرچییەوە کە هاوڕێم بوو، چوومە لای چادرچی و، کە نووسینە عەرەبییەکەمی دی گوتی: "تۆ کوردیت؟. گوتم: "ئەریّ". گوتی: "ئەم عەرەبییە لە کویّ فێربوویت؟" گوتم: "لە کوردستان". بەلایەوە سەیر بوو. گوتم: "بەهۆی خوێندنی زانستە ئیسلامییەکانەوە سەتان زانای کورد هەڵکەوتوون کە چەندین بەرهەمی بەرزیان بە عەرەبی نووسیوە و، هیچ لە وڵاتی عەرەبیشدا نە ژیاون". گوتی: "تکایە جارەکی دی وەرەوە، باسی وتارەکەت دەکەین، ئەوڕۆ کاتم زۆرنییە". بۆ جاری دووەم لەگەڵ مام جەلال چووین پێکەوە بۆ لای. ئەوەم لە بیرە کە چادرچی گوتی: "ئێمەی عەرەب دەمانەویّ یەکێتیی عەرەب بگەیەنینە ئەنجام، ئەوجا ئەگەر کورد بیانەویّ ئەو چەند ستانەی خۆیان جیابکەنەوە و ببنە دەوڵەت، ئەز لە دژ نابم". بەڵام گوتی: "ئەمە بیروڕای خۆمە، لە نێو حزبدا باسم نەکردووە". پاش بڵاوبوونەوەی وتارەکەم، مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانی، وتارێکی نووسی هەر لەو رۆژنامەیەدا بۆ پشتگیریی من، لەژێر نێوی "ألتتريك لايزيد الشعب الكردي إلاّ قوة وثورة على المستعمر". لەوەوە، سەفیری رژێمی ترك لە بەغدا شکاتی لە هەردووکمان و لە رۆژنامەکەش کرد. ئەز وتارەکەم بە نێوی خواستەمەنی ج.أ. کلۆڵ و مامۆستا جەمیل بە: ج.ب.ر. نووسیبوو. کامیل چادرچی ئامادە نەبوو نێوی ئێمە ئاشکرا بکات. لە دادگەییکردنی یەکەمدا کە حسین جمیل پارێزەری رۆژنامەکە بوو، دادگە بریاریدا کە سووکایەتی بە سەرۆکی دەوڵەت کراوە، نەك بە سەرۆکی حکوومەت کە بە پێی قانوونی عێراق ئەوی سووکاتی بکردایە بە سەرۆکی حکوومەت سزا دەدرا و باسی سەرۆکی دەوڵەتی تێدا نەبوو. بەڵام سەفیری رژێمی ترك شکاتەکەی بردە دادگەیەکی بەرزتر و، ئەوجا رۆژنامەکە بە سزای پارەدان سزادرا. هەرچەندە پارێزەر عباس حسن جمعه کە بەرپرسیاری رۆژنامەکە بوو، دەیگوت "ئەمە شەڕی کورد و ترکە، ئێمەی عەرەب بۆچ دەبیّ سزا ببژێرینەوە"، بەڵام رەحمەتی چادرچی گوتی: "ئەمە بیروباوەڕ و، رێی ئێمەیە و، ئێمە رازی بووین ئەو وتارانە بڵاوبکەینەوە". لە 1954/12/17 دا رۆژنامەکە داخرا. (سەرنج: نێوی هێندەك لە بڵاوکراوەکانی دیکەم لەم پێشگوتنەدا دێن).

[2]. بیرخەرەوەکەمان لەژێر نێوی "مذكرة المدرسين ألاكراد الى وزارة المعارف حول رفع مستوى الثقافة في كردستان خاصة والعراق عامة" دا بلاوکرایەوە. ئەو مامۆستایانەی ئیمزای بیرخەرەوەکەیان کرد ئەمانەبوون: فایەق عارف (دوانێوەندی/ سلێمانی)، ئیحسان عەبدولکەریم فوئاد (دوانێوەندی/ سلێمانی)، ئیحسان عەبدولحەمید (نێوەندی رۆژهەلات/کەرکووك)، مستەفا سەید ئەحمەد نەریمان (قوتابخانەی قەلای عێراقی/کەرکووك)، عەبدوللا محەمەد حاج ئەلیاس (میدیا) (قوتابخانەی سویسوێنان/سلێمانی)، نەجمەدین مفتی (دوانێوەندی هەولێر)، عەبدولرەحمان رەزا (دوانێوەندی موسەللا/کەکووك)، جەمال نەبەز (نێوەندیی زوبێر).

3. قەدری ئەمین، مامۆستایەکی میسری گەنج بوو، و مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو. قوتابییە کەرکووکییەکان، لە زمانی عەرەبەکانی عێراق نەدەگەیشتن، لە زمانی وی، ئەوا هیچ. جارێکیان لە تاقیکردنەوەدا قۆپیی لە قوتابییەك گرتبوو و، لە سالۆنی تاقیکردنەوە دەریکردبوو، قوتابییەکەش کە نێوی تەحسین بوو هەڕەشەی کردبوو لێی و ترساندبووی. جا لەبەر ئەوەی ئەز و مامۆستا مووسا نووح لە لیژنەی کۆنترۆل (إنضباط) دا بووین، دەبوو تەماشای کێشەکە بکەین. لە کەرکووك مام تۆفیقێك هەبوو چەخماخساز بوو، مالی لە گەڕەکی موسەللا بوو، کە ئەز مندالْ بووم، جاروبار سەری سلێمانی دەدا و ناسیاوی باوکم بوو، وەك کوردی جاران، کە جلکی کوردییان دەپۆشی، خەنجەرێکیان دەکرد بە پشتێنەکەیاندا، ئەویش خەنجەرێکی لە پشتێندا بوو. لەپڕ مام تۆفیق پەیدا بوو، گوتی": ئەوە چییە، ئەو مندالە بەسزمانەیان دەرکردووە و دەگری و خۆی و باوکی هاتوونە لام و هانایان هێناوە بۆ من، چی کردووە؟" گوتم: "لە کاتی تاقیکردنەوەدا، شتەکانی لەبەرنەبووە، تەماشای کتێبی کردووە و لەبەر کتێبەکە نووسیویەتەوە". گوتی: "جا ئەوە چیە؟ هەلبەتە فەقیرە نەیزانیوە، گوتوویەتی بۆ بە خراپ و هەلە بینووسم، با راست بینووسم". لەگەلْ مام تۆفیق لە ژووری مامۆستایان بووم کە قەدری ئەمین خۆی کرد بە ژووردا و مام تۆفیقی بە خەنجەرەوە دی، ترسی لێنیشت و گوتی هەردەبێ بمبەیت بۆ لای "محافظ المدينة" (واتە: متەسەریفی ئەو سەردەمە). ناچار کەوتمەڕێ لەگەلی و کە بە "خاسە" دا تێپەردەبووین، وەك خولخولۆکە بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوە. گوتم ئەوە

چیه؟ گوتی: "والله أنا بالتفت شرقاً و غرباً وشمالاً و گنوباً (جنوباً) کل کردي عنده خنگر (خنجر)، یرید یرتکب گریمة (جریمة) اتل (قتل). که چووینه نێو سەراکەوە و پۆلیسی دی، رویکردە من و گوتی:"أستاد گمال (جمال) والله أنا في منتهی الشگاعة (الشجاعة) والرگولة (الرجولة). حاربت في فلسطین وقهرت گیش (جیش) العدو" لە سەرای کەرکووك بردمە لای دادوەر (حاکم)ێك، دادوەرەکە پێیگوت، ئێرە کوردستانە و ئەوەش رەوشتێکە کە خەلك خەنجەر لە پشتێنەکەیان دەدەن و بۆ کوشتنی کەس هەڵیان نەگرتووە. قوتابییەکە (تەحسین) ئەو ساڵەی لە دەست چوو، بەلاَم بردمە لای قەدری ئەمین و گوتم: داوای لێبووردن بکە لێی، بۆ ئەوەی بە جارێ لە قوتابخانە دەرنەکرێ. بەو شێوەیە کێشەکە کۆتایی هات. لەو پارچە نووسینەدا کە باسی یونس الاحمرم کردبوو (ژ5) لە بارەی قەدری ئەمینەوە نووسیبوم: "أما عن قضیة قدري امین الذي حارب في فلسطین، فکان من المنهزمین، ولا سیما في قضیة تحسین".

[4]. پاش دوورخستنەوەی من لە کەرکووك، عومەر عارف قاپرەش، وەك مامۆستا لە جیاتی من، لە قۆتابخانەی موسەللا دامەزرا. عومەر خەلکی سلێمانی بوو، لە زانستگەی بەغدا ناسیم، لەبەشی ماتماتیك دەیخوێند، دە ساڵێك لە من بەتەمەنتر بوو. هەرچەندە خۆی بە کۆمۆنیست دەدایە قەڵەم و زۆرناژەنیی بۆ رژێمی سوڤێت دەکرد، بەلاَم بیروباوەرەکی زۆر کۆنەپەرستانەی بەرامبەر بە ژن هەبوو. هاوڕێی نێزیکی دەرەبەگێکی هەمەوندی بوو، کە ئەویش سەرەڕای هاوکاریی لەگەل رژێمی عێراق، خۆی بە چەپی دەدایە قەڵەم. رۆژێکیان عومەر و ئەو مەحموود فەهمی هەمەوندییەم پێکەوە لەسەر جادە دی، گوتم: "عومەر! وادیارە لە وردە و مردەدا کزیت!". کە عومەر گوازرایەوە کەرکووك، یەکەمین کاری ئەوەبوو، ئەو وشە کوردییانەی لە لابۆرەکە نووسیبووم، هەمووی لابردبوون و، بووبووە هاوڕێی ئارەق خواردنەوەی فەتاح دۆغرمەچی و، پاشی کودەتای قاسم، رۆژێکیان لە کەرکووك، مامۆستا مستەفا نەریمانم دی و عومەریش لەدوورەوە دەرکەوت لەنێو ئۆتۆمۆبیلێکی پڕ لە چەپلە لێدەراندا بۆ قاسم، گوتم "عومەر عارف لە چیدایە" نەریمان گوتی: "ئەوەتا ئالای مۆسکۆی هەڵکردووە و، فەتاح دۆغرەمەچیشی بە کلکی خۆیدا راکێشاوە".

5. ماموٚستاکان، لەنێو خوٚماندا، زوٚرجار بە قسەوکردەکانی یونس الاحمر پێدەکەنین. ئەز ژی بوٚ رابواردن پارچە نووسینێکم بە عەرەبی ئامادەکردبوو، کە دەمخوێندەوە بوٚ هەڤالماموٚستایان خوٚشیاندەهات لێی. بەداخەوە، هەموویم لە بیر نەماوە، وا لێرەدا ئەوەی لە بیرم ماوە دەینووسمەوە: "أما عن المصلح الاكبر، المعروف بيونس الاحمر، فليس له مقام و مقرَ، كأنه كاولي من الغجر. لقد هجم مرة على بيت يعقوب ألاخضر وأمطره بوابل من الحجر. فخرج له يعقوب وقال: من أنت؟ فأجاب: أنا يونس الاحمر. فقال يعقوب: ألم تكن لوطياً في الصغر؟ فرد عليه يونس قائلا: دعني أكون لوطيا في الصغر، فانا الان في الكبر. فقاطعه يعقوب و قال: كلا، التعلم في الصغر كالنقش في الحجر. فحكم عليه بالنقل الى مدينة كربلاء، لتكون عليه كربا وبلاء. إلا أنه وقع على قدمي عبدالامير عطرة لينقله الى بصرة. فكان له فيها صولات وجولات.
أما بشأن شخصه فهو سليط اللسان، بيد انه رعديد و جبان. إذ انه يخاف من ظله لخلل في عقله. أما عن شحه وبخله، فله فيهما آراء ونظريات و حكم و "خرنگعيات". فلقد صرح مرة بأنه لايستطيع أن يأكل الطعام إذا كثر، ثم أنه إذا أراد أن يستمع إلى المذياع فإنه يعوض عن ثمن الكهرباء صاعا بصاع. حتى إذا اضاء الراديو، اطفأ ضوء الغرفة، فتصبح كالليل في صحراء قرفة. فإن سأله سائل أو دخل عليه داخل، قال أن الغرفة المظلمة كالاحاديث المطلسمة، ففيها جو شاعرى وخيال ساحري.

[6]. سامی شاکیر کە بە سامی شاکر العراقي نێوناس دەکرا، ماموٚستای جوگرافیا بوو، لە سەرەتاوە لە قوتابخانەی نێوەندیی روٚژاوا بوو، پاشان لە دوانێوەندیی موسەللا. ترکمانێکی نەخوٚش و زمانشڕبوو، روٚژێك لە پوٚلی قوتابخانەدا، بێ بوونی هیچ بوٚنەیەك، گوتبووی: "مەلا مستەفا جەردە و رێگر و یاخیبووە". قوتابییە کوردەکان لەوە تووڕە بووبوون و لە پوٚلەکە هاتبوونە دەرەوە، کە ئەمەم بیست زوٚر بێزاربووم و پێمگوت: "سامی، کەس نەما مەلا مستەفا نەبێ گووی بخوٚیت؟" گوتم: "ئەو قسەیە دەبێتە هوٚی ئاژاوە نانەوە لە هەموو کەرکووکدا و دەتەنێتەوە بوٚ شارەکانی دیکە". دوایی پەشیمانبووەوە لە قسەکانی و کێشەکە کوٚتاییی هات. بەرێز ماموٚستا

محەمەد ئەحمەد شاکەلی کە ئەو کاتە لە قوتابخانەی موسەللا قوتابی بوو و ئێستە وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئاینیی حکوومەتی کوردستانە، لە وتارێکدا لە ژێر نێوی "کورد و تورکمان" کە لە لاپەرە 22 ی ژمارە 268 ی هەفتەنامەی "میدیا" دا لە 2006/12/5بڵاوکراوەتەوە ئاماژەی بۆ ئەو ڕووداوەکردەوە.

[7]. سەرەتای دامەزراندم لە کەرکووک لە قوتابخانەی دوانێوەندیی کەرکووک بوو، کە فاتیح بەگ بەڕێوەبەری بوو. بەڵام لەبەر ئەوەی مامۆستا جەمال عەزیز کە لە سلێمانی هەڤالقوتابیم بوو، خەلکی کەرکووک بوو، ئەویش مامۆستای ماتماتیك بوو لە سلێمانی، مامۆستا عەلی خەفوور شالی کە ئەویش لە سلێمانی هەڤالقوتابیم بوو، لە کەرکووک وەك مامۆستای ماتماتیك دامەزرابوو، دەیویست جێگەکەی لەگەڵ مامۆستا جەمال عەزیز بگۆڕێتەوە و ئەوجا ئەز دەبوو لە جێگەی عەلی شالی کاربکەم و جەمال عەزیزیش لە قوتابخانەی موسەللا، بەڵام لەبەر ئەوەی ماڵی خزمەکانی جەمال عەزیز نێزیك قوتابخانەی دوانێوەندی بوو، ئەو چووە جێی من و ئەز ژی بۆ موسەللا. لەگەڵ ئەوەشدا نێوانم لەگەڵ فاتیح بەگ خۆشبوو. پاش کودەتای قاسم کە مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە کۆنگرەیەکیان بەست بۆ باسی کێشەی خوێندن لە قوتابخانەکان و بەکارهێنانی زمانی کوردی. مامۆستا ترکمانەکانیش کۆنگرەیەکیان بەست، کە لەوەدا داوایانکرد خوێندن بە عەرەبی بێت. ڕۆژێکیان لە فاتیح بەگم پرسی، لەو بارەیەوە دەبێژی چی؟ گوتی: ئێمە سالانی ساڵ هەوڵماندا قوتابی و مامۆستای ترکمان مافێکیان وەدەستکەوێ، کەچی ئەمانە مافی خۆیان دەخەنە ژێر پێوە، ئەمانە بۆ مافی ترکمان کارناکەن، بەلکو تەنی دوژمنایەتیی کورد دەکەن. وەکو کەری دێز وانە، هەربۆ ئەوەی کورد هیچ مافێکی دەستنەکەوێ! واز لە مافی خۆیان دێنن". کە ئەو قسەیەی کرد، چیرۆکێك هاتەوە بیرم کە لەوە پێش لە کابرایەکی عەرەبی بەغدایی بیستووم، گوتی: سالانێك لەمەوبەر لە وەزارەتی نێوخۆ کارمدەکرد و، ماوەیەك بوو بەشێکی کوردی لە رادیۆی بەغدا کرابووەوە، جارێکیان نامەیەك هات بۆمان، بە ئیمزای ژمارەیەك ترکمان، نووسیبوویان: "دەبێ بەشێکی ترکمانی لە رادیۆی بەغدا بکرێتەوە. ئەگەر ئەوە ناکەن، بەشە کوردییەکە داخەن. خۆ ئەگەر بەشە کوردییەکە دابخەن، ئەوا ئێمە داوای

بەشی ترکمانی ناکەین" ئەوجا کابرا گوتی "ئەگەر کەسانێك داوای بەشێکی ترکمانی بکەن تێدەگەم. بەڵام ئەگەر بەشی کوردی دابخرێ، ئێدی داخوازییان نەمێنێ، لەوە ناگەم؟". ئەمەم بۆ فاتیح بەگ گێڕایەوە. گوتی: ئەوەش هەر لەم بابەتەیە.

[8]. لە ساڵی 1955 دا چیرۆکی "گەرداو" The Tempest ی نووسەری بەنێوبانگی ئینگلیز ولیەم شێکسپیرم کرد بە کوردی و هەر لەو ساڵەدا بڵاوکرایەوە.

[9] . هەرچەندە دوو ساڵ لە فوتابخانەکانی کەرکووك خزمەتم هەبوو، بەڵام کارەکەم جێگیرنەکرابوو. لە فوتابخانەی زوبێر رۆژێکیان لە وانەیەك هاتمە دەروە و چوومە ژووری بەڕێوەبەر پیاوێکی چوار شانە دانیشتبوو، کە هەستمکرد دیومە، بەڵام نەمناسییەوە. مامۆستا سالم گوتی "ئەوە خزمەکەت هاتووە بۆ سەرەدانت". ئەو پیاوە محەمەد عەلی مستەفا قەراخی بوو کە پشکنەری ماتماتیك بوو لە وەزارەتی زانیاری. محەمەد عەلی مستەفا لە سەردەمی عوسمانیدا لە ئەستەموول خوێندبووی و بلیمەتێك بوو لە ماتماتیکدا و زۆربەی پەرتۆکی جەبر و هەندەسەی فوتابخانە نێوەندییەکانی عێراق بەرهەمی وی بوون. یەك دوو جار لە بەغدا لای رەحمەتی ئەورەحمان جادر (کە دۆستی باوکم بوو) دیبووم. کە منی دی دەستبەجێ بە کوردی چۆنی و چاکی کرد لەگەڵم و گوتی: "بەڕێوەبەر زۆر لە تۆ رازییە". منیش سوپاسمکردن و کە هاتە ژووری پۆلەکە و گوێی لە وانەکانم گرت، گوتی تۆ دەزانیت تا ئێستە کارەکەت جێگیرنەکراوە. دۆسێیەکەمی بەدەستەوە بوو. گوتم: "خۆت لە پۆلی وانە گوتنەوەمدابوویت". گوتی: "خۆ نەنووسراوە، کە تۆ وانە خراپ دەڵێیتەوە، بەڕێوەبەری زانیاریش بە باشی باسی تۆی کرد، شتی دیکە لە دژت نووسراوە، کە پێوەندیی بە کاری وانەگوتنەوە نییە"، ئەوجا باسێکی رابوردووی خۆم لە کەرکووك کرد بۆی، گوتی: "وریابە، ئێمە گەلێکی بێکەسین". پاش ماوەیەك بەڕێوەبەری زانیاری بەسرە داخۆیانییەکی دەرکرد و کارەکەمی جێگیرکرد.

Adem ئادەم، وشەکە عیبرییە אדם. بە مانای← خاك xak/ ← گڵ gil’. بەهائوللا 1892.1817، پەیامیبەری بەهائییەکان، کە دوو ساڵ 1855.1854 بە دزییەوە و بەنێوی خواستەمەنیی دەروێش محەممەدە لە سلێمانی ژیاوە و، مامۆستای خوێندنخانەی ئایینی بووە، پێیوایە کە ئادەم بە کوردی قسەیکردووە (سەرنجی: E.G.Brown: Material for the Study of the Bahai Religion, (Cambridge 1961).

Aftawe ئافتاوە، واتە: مەسینە mesîne > ← ئاڤ av + ← تاوە tawe واتە: تاوەی ئاڤ/و tawey av/w. لە فارسیدا بووە بە آفتابە، وادیارە بنەڕەتەکەی کوردییە، چۆنکە ئاف/ڤ af/v نەبووە بە آب ab ی فارسی (فارسی: آب ab، کوردی: ئاڤ/ف av/f)واتە نەبووە بە آب تابە abtabe. تاوە tawe بە پەهلەوی تاڤەك tavek و تاپەك tapek.

Agir ئاگر، بە ئاڤێستایی ئاتەر(س) ater(s) ە و بە پەهلەوی ئاتەخش atexsh و ئاتور atur. لە زمانی کوردیدا وشەی ئار ar یش هەر بۆ ئاگر Agir بەکاردەبرێ.

Akam ئاکام، واتە: (أجل) بە عەرەبی. ئا a وێنەیەکی دیکەی ها ha یە کە کورتەی هات hat. ← کام kam و کات kat و گاڤ gav و ← هەنگاڤ hengav و ← قاف qaf هەمووی مانای کات kat ە. ئاکام akam لە بنەڕەتدا: هاکات hakat و/ ← هاکا haka یە.

**Akar** ئاكار (ڕەوشت rewisht) لە: ئاوایی کار awayî/kar (چۆنێتیی کار) ەوە هاتووە.

**Al** ئال (← لا la ← پەراسوو perasû).

**Al’** ئاڵ، بە ڕەنگی سۆری کاڵ دەگوترێ ئاڵ al’. ئاڵ وێنەیەکی دیکەی ئار ar ە. کە ئار ar وشەیەکی دیکەیە بۆ ئاگر ← agir و ئاور awir. "ئاڵ" واتە: ڕەنگی وەك ڕەنگی ئاگر وایە. وشەی ئاڵ al’ کەوتووەتە فارسی و ترکییەوە. لە پەهلەویشدا وشەی ئەرووس erûs بە کاردێ بو ڕەنگی سۆری کاڵ، کە وشەی ئەروس erûs لە ئاروس arûs ەوە هاتووە، کە بەشی یەکەمی ئار ar (ئاگر agir)ە و بەشی دووەمی ûs لە ووس wûsەوە هاتووە. ووس wûs دەبێ لە بنەڕەتدا واس was و واش wash بووبێ، کە لە کوردیدا دەگوترێ جلکەکە ڕەنگەکەی سپی واش sipî wash ە، واتە: بەلای سپیدا دەڕوانێ، وەك سپییە. واش wash و واس was یەك مانان، کە وشەی وەش wesh مانای ← وەك wek ە، بە گۆڕینی دەنگی ش sh و س s و ك k لە جێی یەکدی. (سەرنجی وشەی وەسا wesa بدە کە مانای وەك wekە).

**Al’et** ئاڵەت، (جۆرە بەهاراتێکی تیژە، دەکرێ بە خواردنەوە بۆ تامخۆشی). ئاڵەت al’et > ئاڵ al’ + ـە e + ت t. ئاڵ al’ وێنەیەکی دیکەی ئار ar ە، کە ئار ar یش شێوەیەکی کورتکراوی ← ئاگر agir ە، واتە: ئاڵەت al’et شتێکی هێندە تیژە، وەك ئاگر گەرمە و دەسووتێنێ.( ← ئیسۆت îsot، ← ئاڵ al’).

**Alternatîv** ئالتەرناتیف. وشەیەکی ئەوروپاییە، کە لە ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەلمانیدا بۆ "لە جیاتی le ciyatî"، "ژ بری ji birî" و "بدیل" ی عەرەبی بەکاردەبرێ.

**Amaje** ئاماژە، مانای نیشانە (إشارة) یە، لە ئارمانجە armance وە هاتووە. ئارمانجە armance > ئارماژە armaje (نج nc بووە بە ژ j، سەرنجی وشەی تانجی tancî و تاژی tajî و هەنجیر hencîr و هەژیر hejîr بدە) ئەوجا دەنگی ر r کەوتووە و ئارماژە armaje بووە بە ئاماژە amaje. (← awat ئاوات).

**Amar** ئامار، واتە: هەژمار hejmar. ئامار amar لە بنەڕەتدا هامار hamar و هەمار hemar و هەژمار hejmare ە. هەژ hej و هش hish و هۆش hosh مانای (عقل)ە. مار mar دەچێتەوە سەر وشەی ئاڤێستایی: مەر mer، کە مانای: لە بیری خودا هێشتنەوەی شتێك. سەرنجی وشەی ئەڵمانی: merken بدە، کە مانای: سەردەرچوون لە شتێك، تێگەیشتنی شتێك دەگەیەنێ. هەروەها وشەی: merkbar کە مانای شتێکە بە ئاسانی لە بیردا بمێنێتەوە. سەرنجی وشەی لاتینی: memoria بدە، کە مانای بیرەوەری (ذاکرة) یە و وشەی mémoire ی فەرەنسی لەوەوە وەرگیراوە.

**Anahîta** ئاناهیتا (← ناهیت nahît).

**Ar** ئار (← Agir ئاگر).

**Ar** ئار (شەرەف) لە ئاڤێستاییدا ئەرییە erye. لە زمانی ئەلمانیدا (ئێرە) Ehre یە. زمانی عەرەبی ئەم ئار ar ەی کردووە بە "عار". (← Arya ئاریا).

**Ard** ئارد/ هارد hard لە پەهلەویدا ئارت art ە. (← هارین hařîn).

**Arezû** ئارەزوو، بە پەهلەوی/ ئارزۆك **arzok** ە.

**Arî** ئاری (⟵ ئاریایی **aryayî**).

**Arya** ئاریا، نێوچەی نێشتەجێبوونی ئار(یا)ییەکان (⟵ ئاریایی **aryayî**).

**Aryayî**/ئاریایی/ **Arî** ئاری. بەشێکبوون لە هۆزە هیندۆئەوروپاییەکان، کە هێندێکیان لە هیندستاندا نیشتەجێبوون و، ئەوانی دیکەش رروویانکردە نێوچەی خۆرهەڵاتی ناڤین و دوورونێزیك و، ولاتەکەیان نێونا ولاتی ئاریا **Arya**. وشەی ئاریا بە مانای دۆست و زمانشێرین و پێزان (بەوەفا) و رووخۆش و بە ئاوڕوو و بە رۆمەت دێ. سەرنجی وشەی **Ehre** بدە لە زمانی ئەڵمانیدا کە بە مانای رۆمەت **romet** و ئاوڕوو **awřû**ە. هەروەها سەرنجی وشەی ئار **ar** بدە کە لە زاری عەرەبیدا بووە بە "عار" و بە مانای شەرم و شوورەیی بەکاردەبرێ. بێ ئار **bê-ar** واتە بێشەرم **bêsherim**. دوورنییە وشەی ئێرەیی **êreyî** ش کە بە مانای: چاوچینۆکی و رووهەڵماڵراوی و بەخیلیبردن، دێ، هەر لەمەوە هاتبێ. ئەو ئاریاییانەی کە لە ئێران و هێندستان ژیاون، لەسەر دەمی کۆندا فەرهەنگێکی یەکگرتوو و زمانێکی یەکگرتوویان هەبووە بە نێوی زمان و فەرهەنگی ئاریاییەوە. بەکارهێنانی وشەی ئاری **Arî**، وەك پێناسەیەکی رەگەزی بۆ ئەڵمان، کە لە سەردەمی هیتلەردا باوبوو، هەروەها، ماوەیەك لە لایەن تۆرانییەکانەوە بۆ

# A ئا

ئامانجێکی تایبەتی بەکاردەبرا، ساختەکارییەکی مێژوویی و فەرهەنگیی گەورە بوو، هیچ چەپی نەبوو، لە ساختەکارێتیی بەکارهێنانی زاراوەی سۆسیالیزم بۆ رژێمی تۆتالیتێر و دیکتاتۆری سۆڤێت و پاشکۆکانی لە ئەوروپای رۆژهەڵاتدا. ئەڵمانەکان گێرمانی باکوورن و ترکەکانیش بە بنەچە و رەچەڵەك، خەڵکی چیای ئالتاین و، ئەڵمان و ترك ئاریایی نین، چۆنکە هیندۆئێرانی نین. وشەی **Êran** کە لە ئاڤێستادا بە شێوەی ئەئیریە **eîrye** و، لە پەهلەویدا بە شێوەی ئێران ە **Êran** (وەك کوردی) و لە فارسیدا بووە بە ئیران **Îran**، لە بنەڕەتەوە لە ئاریان **Aryan** ەوە وەرگیراوە (← ئێران **Êran**).

**Asayish** ئاسایش، بە پەهلەوی: ئاسایشن **asayshn**.

**Asewar** ئاسەوار، ئاس **as** لە کوردیدا مانای رووت و رماو و رەجاڵ و بەرد و داوەشاوە، ← وار **war** مانای شوێن و جێ یە. ئاسەوار **asewar** مانای شوێنی دارماو و پەرپووت.

**Asman** ئاسمان، < ئاسۆ **aso**+ مان **man**، ئاسۆ **aso** بە عارەبی (أفق)ە، ← مان **man** نیشانەی جێ **cê** یە. دەگوترێ دارەمان **dareman** واتە: شوێن و جێگەی دار، ئەو شوێنەی دارو درەختی لێیە، ئاسمان **asman** بە پەهلەوی: ئاسمان **asman**.

**Ashti** ئاشتی، بە پەهلەوی: ئاشتیە **ashtîh**.

**Aso** ئاسۆ (← **Asman** ئاسمان).

**Ast** ئاست (← **Hendese** هەندەسە).

**At** ئات (← **Tat** تات).

Av/w ئاڤ/و، بە ئاڤێستایی ئاپە ape و بە پەهلەوی: ئاپ ap و لە فارسیدا بووە بە آب ab. لە زمانی فەرەنسیدا: ئۆ eau یە.

Avjenî ئاڤژەنی، واتە: ← مەلە mele، ئاڤژەنی واتە: ژەندنی ئاڤ/و jendinî av/w. فارسی بۆ مەلە mele وشەی شنا shena و آشنا ashna و شناو shenav بەکاردەبا. وشەی آشنا ashna لە ئاڤ شەنا avshena > ئاڤ ژەنی avjenî یەوە هاتووە، بە گۆڕینی دەنگی ژ j بە ش sh. وشەی شناو shnaw ژەنینی ئاو jenînî aw ە کە دیارە ژەن jen کوردییە و بەفارسی زن zen ە، ئاو/ڤ aw/v کوردییە و فارسییەکەی آب ab ە. بۆ مەلەکردن melekirdin وشەیەکی ئاڤستایی هەیە کە سنا sna یە، کە رەنگە وشەی کوردیی سۆبەیی sobeyî و سۆبایی sobayî کە بۆ مەلەکردن بەکاردێ پێوەندیی بەم وشە ئاڤێستایە وە هەبێ، ئەوەش لە بریتی "سۆن بە ئاڤی" son bi avi کە سۆن son لە گەل: ژۆن jon و ژۆنین jonîn و ژەنین jenîn هاوڕەگ بن.

Awa ئاوا، بە پەهلەوی ئاپات apat ە واتە: شوێنێك کە ئاوایی بێ و ژیانی تێدا بێ و ئاوی تێدا بێ، بە فارسی بووە بە آباد. لە کوردیی باکووردا وشەی ئاڤاهی avahî بۆ خانوو/خانی xanû/î بەکاردەبرێ، کە وشەی ترکی ئێڤ/و ev/w لەمەوە هاتووە.

Av/wabûn ئاڤ (و) ا بوون، واتە: وندابوون wundabûn (← هاڤی Havî).

Aware ئاوارە > ئا a + وار war + ە e. ئا a، کورتەی ئاوی awî/هاڤی havî یە (← هاڤی havî). وار war (← هەوار

hewar) مانای نیشتمان و جێی ژیانە. ئاوارە aware ئاوی/هاڤی awî/havî bû le بوو لە هەوار .hewar

Awarte ئاوارتە/ Ewarte ئەوارتە/ هەوارتە hewarte، بە کەسێك، یان بە شتێك دەگوترێ کە لە جێی خۆی نەمابێ، دوورخرابێتەوە. < ئەوار ewar + تە te < ← (هە)وار (he)war مانای جێی ژینگە و دانیشتنی مروڤە. تە te کورتکراوەی تەرە tere (← تاراوگە tarawge) یە، کە مانای دوورکەوتنەوەیە لە شوێنی خۆ.

Awat ئاوات، لە ئارمانج armanc ە وە هاتووە کە بە مانای نیشانە nîshane و مەبەست mebest دێ. ئارمانج armanc < ئامانج amanc < ئاماج amac < ئاواج awac < ئاوات awat. دیارە، شێوەیەکی دیکە بۆ ئارمانج armanc لە شێوەزاری دزفولیدا هەیە کە ئەوەش: ئاماج amac ە و بە شێوەی amaç بە مانای مەبەست mebest کەوتووەتە زاری ترکییەوە.

Awayî و Avahî ئاوایی، بە مانای جێی دانیشتن و لێژیان و خانی (خانوو) دێ. وشەکە پێوەندی بە ئاو/ ڤ aw/v ەوە هەیە، واتە ئەو شوێنەی ئاو/ ڤ ی لێیە. کورد دەبێژن "ئاو بە ئاوەدانیدا دەڕوا". وشەی ئاڤاهی avahî بە شێوەی ev/ew چووتە ترکییەوە و بە مانای خانی xanî بەکاردێ (← ئاوا awa).

Awaz ئاواز، بە پەهلەوی: ئاڤاچ avachە.

Awbare ئاوبارە، ئەو دارانەیە کە بەسەر کەندالێکدا رادەهێڵرێن بۆ پەڕاندنەوەی ئاو. دیارە وشەی "عبّارة"ی عەرەبی لە

مەوە وەرگیراوە. کە aw بووە بە (عَبْ) وەك چۆن کانی kanî بووە بە کەعنی ke´nî و باشیگە bashige بووە بە بەعشیقە و باگۆڤە bagove بووە بە بەعقووبە. تەنانەت وشەی عَبَر (عبور) یش عەرەبی نییە. سەرنجی وشەی bwar بوار بدرێ.

**Awejû** ئاوەژوو، a ئا نیشانەی پێچەوانە و نە ne یە (← Awiř ئاوڕ). Wejû وەژوو وێنەیەکی دیکەی وەکوو wekû ە، واتە: پێچەوانەی ئەوەی هەیە.

**Awez** ئاوەز، (بەهۆش behosh، ژیر jîr) < ئا a + وەز wez < ها ha + وەز wez < هاو haw + وەز wez. وەز wez وێنەیەکی دیکەی وەج wec ە کە مانای هۆش hosh (عقل) ە. مرۆڤی بێ وەج bêwec واتە: مرۆڤی گەوج gewc. گەوج gewc یش کەوج kewc ە کە لە، کەل ـ وەج kel-wec یان، کالّ ـ وەج -kal’ wec ە وە هاتووە، (سەرنجی: کالّ فام بدە kal’-fam) واتە: کەسێك کە هۆشی ناتەواو و کەل بێ. ئاوەز awez < هاو ـ وەج haw-wec واتە: خاوەن هۆش. بێ وەز bê-wez واتە: بێ وەج bê-wec. وەج wec و مەژ mej (مەژی mejî و مێشك mêshk یەك شتن)(سەرنجی وشەی گەمژە gemje بدە کە گەوجە gewce و کەم مەژ kem meje ە). هاو haw و خاو xaw هاومانان و هەردووکیان بە مانای خاوەن بەش -xawen besh دێن، سەرنجی وشەی هاوڕێ hawřê، هاوولات hawwilat بدە. دەنگی خ x و هـ h جێی یەکدی دەگرنەوە لە

کوردیدا، سەرنجی وشەی وانە wane (درس) بدە کە لە خوانە xwane و خوێندن xwêndin ەوە هاتووە.

**Awêne** ئاوێنە، ئاو aw + وێنە wêne. ئاو aw تایبەتکارێکی هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە پاگژ و بێگەرد بوو وێنەی دەوروبەری خۆی دیاردەخا. "ئاوێنە" ئەو ئامرازەیە کە بە شێوەی (وەك) ئاو وێنە دەردەخا (← نەینك neynek). وشەکە بە شێوەی آیینە ayine لە فارسیدا دەرکەوتووە.

**Awiř** ئاوڕ، ئاوڕدانەوە Awiřdanewe < ئا a + وەر wer + دان dan + ە e + وە we، ئا a نیشانەی نە ne و پێچەوانە pêchewane یە، ئەم نیشانە هێندۆئەوروپاییە کۆنە لە کوردیی ئەورۆودا بە شێوەی هەء he´ هەیە. بۆ وێنە: کەسێك پرسیار بکات لێت و بێژیت: نامەکەت نووسی؟ وەرامت: هەء. واتە: نا. وەر wer و بەر ber یەك مانایان هەیە (سەرنجی "ئەم بەر و ئەو بەر" و "ئەم وەر و ئەو وەر" بدە). ئاوردانەوە واتە چاو دانەبەر بەری پێچەوانە.

**Awrîshim** ئاوریشم، (هەوریشم hewrîshim) بە پەهلەوی ئەپەریشوم eperîshum ە و لە فارسیدا بووە بە آبریشم abrishim.

**Ax** ئاخ (← خاك xak ).

**Axêz** ئاخێز (← رزگاری rizgarî).

**Axha** ئاغا، وشەیەکی مەنگۆلییە.

**Axo** ئاخۆ، داخۆ daxo/ داخوا daxwa لە داخواز daxwaz ەوە هاتووە. داخواز daxwaz بووە بە داخوا daxwa و ئەوجا داخۆ daxo و دوایی بە کەوتنی دەنگی د d بووە بە ئاخوا axwa و ئەوجا ئاخو axo.

Axond ئاخۆند (مەلای شیعە) لە ئاغا خوێند (ە وار)ەوە هاتووە.

Axur ئاخور، جێیەکە بە گڵ و قوڕ و بەرد دروستدەکرێ و ئالیکی تێدەکەن بۆ چوارپێیان. لە پەهلەویدا بە شێوەی axwer ئاخوەر هەیە. ← Ax ئاخ لە کوردیدا مانای گڵ 'gil و خاك xak ە.

Ayin ئاین، کە ئەورۆ لە زمانی کوردیدا بە چەند مانایەك دێ، یەکێك لەوانە مانای دین dîn (← دین dîn)ە، وشەیەکی کۆنی کوردییە. لە پەهلەویدا بە شێوەی ئایێن ayên و ئادڤێن advên دێ، کە بە گەلێك مانا بە کارهاتووە وەك: رەوشی ژیان، خۆڕسك، سروشت، تایبەتکار، رەشتوخوو، جێژن، قانوون، نەرێت (نظام). ( ← مەل mel).

Azئاز، واتە خواردن xwardin، کە بە سانسکریت: ئەس es ە و بە ئەڵمانی essen مانای خواردنە. ئاز az لە وشەی ← ئازوخە azuxe دا دەردەکەوێ، کە بۆ خواردنێك بە کاردەهێنرێ کە لە ماڵدا دانراپێ بۆ ماوەیەك. وشەی ئاز az بە گۆڕێنی دەنگی ز z بە ژ j و ئەوجا بە ش sh بووە بە ئاش ash کە بۆ چێشت بەکاردێ، بۆ وێنە بە چێشتلێنەر دەگوترێ: ئازپیش azpîsh واتە: ئەو کەسەی کە خواردن دەپیشێنێ، لە فارسیدا کراوە بە آشپز ashpez پز pez ی فارسی لە پختن poxten > پیشاندن pîshandin ەوە دێ.

Azad ئازاد، بە ئاڤێستایی ئازاتە azate و بە فارسیی کۆن ئاداتە adate یە و بەپەهلەوی ئازات

azat ە و ئازادی azadî بە پەهلوی ئازاتیهـ azatîh ە، کە ئەو دەنگی ت t یە لە هێندەك شێوەزاری کوردیدا ماوە، بە پێچەوانەی فارسییەوە، بۆ وێنە: نابود nabûd (فارسی)، نابووت nabût (کوردی)، صد sed (فارسی)، سەت set (کوردی) و adate فارسیی کۆن بە azate ی ئاڤێستایی بەراوردبکە (ز z ی ئاڤێستایی و د d ی فارسیی کۆن).

**Azar** ئازار، بە ئاڤێستایی و بە پەهلەوی ئازار azar ە، لە زمانی کوردیدا پاشکۆی ئاژ aj ـ بە مانای شتی زەبر و تیژ بەکاردێ. سەرنجی وشەی دەرزی ـ ئاژن derzî-ajin و ئاژنین ajinîn بدە، کە شتێکی تیژ بکرێ بە شوێنێکدا.

**Azuxe** ئازوخە، > ئاز az + خە xe.
← ئاز az (خواردن)ە، خە xe کورتکراوەی خەو xewە، واتە: خەولێخراو xewlêxraw ، دانراو بۆ کاتی خۆی، کورد دەبێژن پارەی نوستوو parey nustû واتە: پارەی خەوتوو parey xewtû ، پارەیەك کە جارێ دانراوە بۆ کاتی خۆی (تەنگانە)، وشەی ئازوخە azuxe تەنانەت ئەگەر خە xe کورتکراوەی خستە xiste > خستن xistin یش بێ، هەر وەك خۆی کەوتووتە فارسی و ترکییەوە. دووریش نییە وشەی خەوتن xewtin پێوەندیی بە خۆخستن xwexistin ەوە هەبێ. (← خەو(ن) (xew(n)).

**Ba** با، له پەهلەویدا ڤات **vat** و له فارسیدا باد **bad** ە. وشەی ڤیند **wind** ی ئەڵمانی و ویند **wind** ی ئینگلیزی پێوەندییەکی ڕەگەییان هەیە بەمەوە. چۆنکە دەنگی ڤ **v** و **w** و ب **b** دەگۆڕێنەوە بەیەك، هەروەها دەنگی ت **t** و د **d** (⟵ **azad** ئازاد).

**Bac** باج/**baj** باژ. له زمانی ئێرانیی کۆندا باجی **bacî** بووە. گەورەپیاوان پارە و یارمەتییان وەرگرتووە له خەڵك و پێیان گوتووە: باج **bac**.

**Bagirdên** باگردێن، (باگردان **bagirdan**). له بان گردێن **bangirdên** و بان گردان **bangirdan** ەوە هاتووە. بان **ban** سەری سەرەوەی خانوو، یان شوێنێکی دیکەیە، هەروەها شوێنی بەرز. گردێن **girdên** له گرد **gird** و گر **gir** ەوە دێ کە مانای خڕ **xir** ە. واتە: باگردێن ئەو ئامێرە خڕەیە کە بانی پێ دەگێڕدرێ، کە وشەی گێڕان **gêřan** یش پێوەندی بە تایبەتکاری خڕی **xiřî** یەوە هەیە، سەرنجی وشەی بەدەورداگێڕان بدە، کە بە مانای خولپێدان **xulpêdan** دێ.

**Bakgrawind** باکگراوند. واتە: پشت خان **pisht xan** وشەکە **back ground** ی ئینگلیزییە.

**Bal’** باڵ، ئەو ئەندامەی کە ⟵ مەل **mel** پێدەفڕێ. له ئاڤێستاییدا وارە **ware** و له پەهلەویدا بارەك **barek** ە.

**Bal’a** باڵا، وشەیەکی دیکەیە بۆ بەژن **bejin** (بەژن و باڵا **bejin û bal’a**) بە پەهلەوی بەشن **beshn** ە.

**Bal’aban** باڵابان، بارابان ئامێرێکی مۆزیکە. وشەکە ڕووسییە.

**Bangush** بانگوش، بەو کەسە دەڵێن کە بە ← باگردێن **bagirdên** گوشار بخاتە سەر سەربانی بە ← قوڕ **quř** داپۆشراو، بۆ ئەوەی لە کاتی باران باریندا، درزەکانی بێنێتەوەیەك و دڵۆپە نەچێتە نێو ژووری خانوو. بان **ban** رووی سەرەوەی خانووە، ← گوش **gush** لە گوشین **gushîn** و ← گوشار **gushar** ەوە هاتووە، کە لە عەرەبیدا (ضغط)ە.

**Baran** باران/**waran** واران. بە پەهلەوی ڤاران **varan** ە، لە شێوەزارێکی کوردیدا، لە پاڵ وشەی بارین **barin** دا، وشەی ڤارین **varîn** یش هەیە.

**Barwêt** باروێت/ تۆمەتی هەڵبەستراو /**tometî helbestraw**/ بوختان **buxtan**. < بار **bar** (خستنە سەر **xistine ser**) + وێت **wêt**. **wêt** وێت وێنەیەکی دیکەی وێژ **wêj**ە، واتە: گوتن **gutin**/ وتن **witin** (سەرنجی وشەی واتەوات **wate wat** (إشاعة) بدە کە لە وتەوت **wute wut** < گوتە گوت **gute gut** ەوە هاتووە. هەروەها ویت ویتك **wît-wîtik**، کە پەرتۆکێکی پیرۆزی ئێزدییەکان بووە. **wît-yar** ویتیار لە زمانی کوردیدا بە قسەبێژ **qise bêj** دەگوترێ.

**Bash** باش (← وەش **wesh**).

**Bask** باسك، (← بازوو **bazŭ**).

**Batu** باتو، (گون **gun**)، با **ba** لە زمانی کوردیدا بە ئارەزووی سێکسیی مێ بۆ نێر دەگوترێ. ئەمە لە وشەی "دێلە بە با **dêl'e be ba**"دا دیارە، واتە: دێلە سەگێك (سەگێکی مێیینە کە "بەبا" یە، واتە: ئارەزووی سێکسی هەیە). تو **tu** لە تۆ **to** ەوە هاتووە کە تۆ **to** هاوماناى ← تۆو **tow** ە.

# B ب

**Baw** باو، لە باما **bama** ی ئاڤێستاییەوە هاتووە کە بە مانای رۆناکی و دیار و درەخشانە. دەگوترێ ئەو شتە باوە. هەروەها بە شتێك دەگوترێ کە رەنگی لە شتێکی دیکە بچێ (شین باو **shîn baw**).

**Bawesh** باوەش، < با **ba** + وەش **wesh**. وەش **wesh** لە وەشاندن **weshandin** و وشین **wishîn** و گوشین **gushîn** ەوە هاتووە. واتە: با **ba** < بە **be** (خۆ) وە **(xo) we** گوشین. ئەم وشەیە لە شێوەی آغوش (آگوش) دا کەوتووەتە فارسییەوە. دیارە گوشین و گوش فارسی نین. بەلکو فشاردن و فشار فارسین.

**Bax** باخ، شوێنێکە کە دار و درەخت و گوڵ و رووەکی دیکەی تێدابێ و بە پەرژینێك دەورە درابێ. باخ **bax** لە پەهلەویدا باگ **bag** ە کە لە فارسیدا بووە بە باغ **baxh**. باخچە **baxche** (باخی بچووك) < باخ **bax** + چە **che**. زاری ترکی وشەی باغچە **baxche** ی یەکسەر لە کوردییەوە وەرگرتووە و، بەم جۆرە: **bahce** دەینووسێ و لە فارسییەوە وەرینەگرتووە، ئەگەنا وای دەنووسێ: باغچە **bağçe**. هەروەها وشەی باخچڤان **baxchivan** (باخچەوان **baxchewan**)ی لە کوردییەوە وەرگرتووە، نەك لە فارسییەوە، چۆنکە زاری ترکی ئەستەموولی خ **x** بە هـ **h** دەنووسێ و، بەم جۆرە دەینووسێ **bahçivan** بەڵام لە فارسیدا باغبان **baxhban** ە. کەچی لە فەرهەنگی ئیتمولۆجیای زاری ترکییدا (**I.Z.Eyuboğlu: Türk Dilinin Etimologi sözlüğü, Istanbul 1988**) وا دەستنیشانکراوە کە لە فارسییەوە وەرگیرابێ (ل 34) کە

ئەمە راست نییە و هەر بۆ ئەوەیە نێوی زمانی کوردی نەبرێ.

baxel' باخەڵ، باخەڵ baxel' > با ba + خەڵ xel'. با ba واتە: لا la (لای من lay min)، کن kin (لە کن من le kin min)، نك nik (لە نك من le nik min)، ئالی alî (ئالیا من aliya min). با ba و بە be یەك präposition ن، بۆ وێنە: کلیلەکە بە من نییە kilîleke be min niye واتە: لای من نییە lay min niye، نە با منە ne ba mine، نە جەم منە ne cem mine. خەڵ xel' (خەل xel) وێنەیەکی دیکەی کەل kel ە، کە لە کن ئەل kin el و کن ئال kin al ەوە هاتووە، واتە: تەنیشت لا tenîshit la، نێزیك لا nêzîk la. وشەی نك nik لە نێزیك nêzîk ەوە هاتووە. وشەی کن ئال kin al > کن ئەل kin el بووە بە کێل kêl (کێلی گۆڕ kêlî gor) و کێلەك kêl-ek (کە لە کوردیی باکووردا بۆ "تەنیشت tenîsht بەکاردەبرێ). وشەی باخەل baxel لەمەوە دێ کە بە مانای لە نزیکەوە، لە کنەوە، لە لاوە، دێ. دیارە مانای دیکەشی وەرگرتووە و، لە فارسیدا شێوەی "بغل"ی وەرگرتووە، هەروەها وشەی پاڵ pal' (لە پاڵ مندا، واتە: لە تەنیشت ولای من) (پاڵدانەوە pal'danewe)، لە باخەڵ baxel ەوە کورتکراوەتەوە. دیارە präposition ی با ba (بە be) (ب b) دەبێتە پ p وەك: بە منە be mine دەبێتە: پێمە pême. کاتێك بچێتە پاڵ جێنێو.

باز Baz، مەلێکە بۆ راو بەکاردەهێندرێ. لە وشەی ئاڤێستایی vez ڤەزەوە وەرگێراوە کە مانای فڕین fiřîn ە. وشەی باز baz لە

پەهلەویدا بە شێوەی باژ **baj** و
باچ **bach** هەیە. وشەکە لە
پێش سەردەمی ئیسلامەتیدا
کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە.
وشەی واشە **washe** ش کە لە
عەرەبیدا بووە بە "باشق"،
هەرلەم بنەڕەتەوەیە.

**Bazdan** بازدان/ **Wazdan** وازدان.
مانای بزووتن **bizûtin**/ بزاڤ
**bizav** و جوولان **cûl’an** ە.
واتە: لە شوێنی خۆوە بۆ
شوێنێکی دی. وازی **wazî** مانای
یاری **yarî** یە واتە: جوولان
**cûl’an** (← **Bezîn** بەزین).

**Bazû** بازوو، باسك **bask**، لە ئاڤێستادا
بازەڤ **bazev** ە.

**Bed** بەد، واتە: خراپ **xrap**، بە
پەهلەوی ڤەت **vet** و لە فارسیدا
بووە بە بد **bed** و لە
ئینگلیزیدا **bad** ە.

**Bedew** بەدەو، بە کەسێکی جوان و
خۆشیك دەبێژن. وشەی بەتەو
**betew** یش هەر بەو مانایە
بەکاردێ. لێرەدا بەتەو **betew**
< بە **be** + تەو **tew**. تەو **tew**
کورتکراوەی تەوز **tewz** ە، کە
مانای خشڵ **xishl’** و رازانەوە و
جوانییە. بەتەو **betew** واتە:
کەسێکی رازاوە و جوان و
بەرچاوکەوتوو. لێرەدا سەرنجی
وشەی **beutiful** و **beuty** ی
ئنگلیزی بدرێ کە مانای جوانی
**cwanî** و خۆشیکی **xoshîkî** یە.
هەوەها وشەی **boutique** ی
فەرەنسی، کە بەو دوکانە
دەگوترێ کە شتی مۆدە و جوان
دەفرۆشێ، وشەی (بدیع) ی
عەرەبی، لە مەوە سەرچاوەی
گرتووە.

**Befir** بەفر/ وەفر **wefir**، بەرف
**berf**. وشەکە ئاڤێستاییە.
ڤەفرە **vefre** یە و بە پەهلەوی
وەفر **wefr** ە.

**Beg** بەگ، وشەیەکی کوردیی کۆنە کە
بە مانای ← مەزن **mezin** و
← گەورە **gewre** و ← خۆدێ

xodê (← خوا xwa) دێ. بە سانسکریت خۆدێ xodê (خوا xwa) بهەگە bhege یە. هەر لە کوردیدا وشەی باخوێ -ba-xwê هەیە بۆ خوا. وشەی بەگ beg بە شێوەی bey کەوتووەتە زاری ترکییەوە و، وشەی büyük ی ترکی لەمەوە وەرگیراوە. وشەی big ی ئینگلیزی، هاوڕەگی وشەی بەگە. لە زاری رووسیدا وشەی بۆگ бог بە مانای خودێ دێ. هەروەها وشەی بێگم bêgim کە هێندییەکان بۆ پایەبەرزان بەکاری دێنن و، لە میسر کراوە بە "بیجوم" لە مەوە هاتووە. تەنانەت وشەی فەخفوری fexfûrî لە بەگ پووری beg pûrî یەوە هاتووە، واتە: کوڕی خودێ ← kurî xudê، ئەمەش نازنێوی پاشا کۆنەکانی چین بووە و، فەخفووری بە وەوە نێونراوە. وشەی بەگ beg کەوتووەتە عەرەبی و فارسیشەوە.

Begudate بەگوداتە. نێوی کۆنی بەغدا Bexhda یە کە مانای خودێ داو ە (← Beg بەگ).

bel بەل، بە مانای درێژ dirêj و شۆڕبووەوە و بەرزوبارێك دێ. بەل bel لە بالاّ bala وە هاتووە کە بالا bala ش لە بەرز berz وە هاتووە (← بەرز berz).

Belge بەلگە، بە مانای هۆیەك، یان دەستاوێژێك، یان ئامێرێك بەکاردەبرێ بۆ سەلماندنی قسەیەك، یان بانگەشەیەك کە بە عەرەبی (دلیل)ە. بەلگە > بەل bel + گە ge. بەل bel لە پەل pel وە وەرگیراوە کە پەل لە کوردیدا مانای پارچە کاخەز (← کاخەز kaxez) parche و گەلاّ gela یە و، لە بنەڕەتدا لە ← پەڕ per وە هاتووە. بەلگە لە پەهلەویدا ڤەلگ velg ە و لە فارسیدا بووە بە برگ berg (بەرگ). وشەی گەلاّ gel'a ش

هەر لە ڤەلك velg ەوە هاتووە، وەك وشەی پەل pel. بە کوردیی باکوور بە پارچە کاخەز kaxez دەگوترێ پەل pel واتە: گەڵا gel'a. وشەی ورق (وەرق) ی عەرەبی، ئەویش هەر لە ڤەلگ velg ەوە هاتووە بەم شێوەیە: ڤەلگ velg > وەلگ welg > وەلەگ weleg > وەرەگ wereg > وەرەق wereq (ورق). وشەیەکی ترکی هەیە بەرامبەر بەلگە belge ی کوردی، کە نێزیکە لێی و، ئەوەش بیلگی bilgi یە کە ئەمەیان لەگەڵ بەلگە belge ی کوردی هاوڕەچەلەك نین. بیلگی bilgi ترکی لە بیلمەك bilmek واتە: زانین zanîn ەوە وەرگیراوە.

**pel** پەل، (گەڵا gel'a) (← بەلگە belge).

**Benc** بەنج، بەنج و پەنج penc واتە: سڕکردنی شوێنێکی لەش. بەنج benc لەگەڵ بەنگ beng و بەند bend (بەستن bestin، گرتن girtin) هاوڕەگە. بەنگ beng جۆرە گیایەکە، کە هێزی بێهۆشکەری هەیە. (بەنگ - کێشان beng-kêshan، بەنگ - کێش beng-kêsh)، بەنگ لە زمانی عەرەبیدا کراوە بە بنج (بەنج). بەنج لە وشەی سانسکریتی بهەنگا bhenga وە هاتووە، کە لە پەهلەویدا بووە بە مەنگ meng، مەنگ meng و مەند mend کە لە زمانی کوردیی ئەوڕۆدا بە مانای لەسەرخۆ leserxwe و کەم دوو kem-dû و کەم جووڵە kem cûl'e یە، هەر لەم ڕەگەوە دێ.

**Bender** بەندەر، (شوێنی کەناری زەریا کە کەشتی لێی دەوەستێ). > بەند bend + ـەر er، ـەر er کورتەی زەر zer/زەریا zerya

یە، واتە: ئەو شوێنەی کە زەریا **zerya** لەوێدا بەند **bend** دەبێ.

**Benexwên** بەنەخوێن، بەندەخوێن (**bendexwên** ← دۆخێن **doxên**).

**Beng** بەنگ، (← بەنج **benc**/ پەنج **penc**).

**beng-kêsh** بەنگ ـ کێش، بەنگ ـ کێشان **beng-kêshan** (← بەنج **benc**/ پەنج **penc**).

**Benzîn** بەنزین، وشەکە بە فەڕەنسی **benzène** و بە ئەڵمانی **Benzin** و بە رووسی **бензйн**، وشەکە کەوتووەتە عەرەبی و فارسی و ترکییەوە، هەر بە شێوەی بەنزین.

**Ber** بەر، (ئەگەر بۆ بەری مێوە وشتی دی بێ) بە پەهلەوی: بەر **ber**ە. خۆ ئەگەر بە مانای، لا **la** و پێش **pêsh** و بەردەم **berdem** بێ، ئەوا بە پەهلەوی: ڤەر **ver**ە، لە کوردیشدا وشەی ڤەر **ver** (وەك پەهلەوی) بە مانای لا **la** هەیە. ئەگەر بەمانای شوێنی شەرمی لەش بێ، بۆ وێنە "تووکی بەر" ئەوا لە ئاڤێستادا ڤەرە **vere** یە.

**Beraz** بەراز/ **Wiraz** وراز، لە ئاڤێستاییدا ڤەرازە **veraze** و لە پەهلەویدا وراز **wiraz** ە.

**Berel'l'a** بەرەڵڵا، لە: بەر هەڵدا **berhel'da** وە هاتووە، واتە: بەرەکەی (کە داپۆشیوە) هەڵدراوەتەوە و هیچ شتێك بەرینەگرتووە پێی.

**Berewpêrî** بەرەوپێری، (چوونەپێشەوە لە شتێك، یان لە کەسێك، واتە: پێشوازیکردن). بەرەوپێری **berewpêrî** (نەك بەرەوپیری **berewpîrî**). پێر **pêr** مانای پێش **pêsh** ە. دەنگی ش **sh** و دەنگی ر **r** زۆر جار جێیەك دەگرنەوە، وەك وشەی پاششێو **pashshêw** دەبێتە پارشێو **parshêw**.

**Berk** بەرك (← **Berq** بەرق).

**Bermal'** بەرماڵ، < بەر **ber** + ماڵ **mal'**. بەر **ber** واتە: پێش **pêsh**، ماڵ **mal'** لە ماڵین **mal'în** ەوە هاتووە. ماڵین **mal'în** واتە: پێداهێنان **pêdahênan** و پێدادان **pêdadan**. ماڵین **mal'în** بۆ پاككردنەوەش دێ.. ئەوەش هەر دەسپێداهێنانە. بەرماڵ ئەو پارچە قوماشەیە كە نوێژ دەكرێ لە سەری و بە ڕوو دەماڵرێ.

**Berq** بەرق، بروسك (ە) **brusk(e)** یە. بەرق **berq** كورتەی وشەی بروسك **birusk** ە. بروسك **brusk** < بروس **brus** + ك **k**، (ك **k** ـ بۆ كورتكردنەوەی شرینییە). وشەكە خۆی بروس **brus** ە كە بە ئەڵمانی **Blitz** ە. لێرەدا سەرنجی وشەی بڵێسە **bil'êse** ی كوردی و وشەی **blaze** ی ئینگیلیزی بدرێ كە مانای "گڕ **gir**" ە. لە زمانی كوردیدا وشەی بەرك **berk** هەیە كە نێوی ئەستێرەی گەلاوێژ **gelawêj** ە، گەلاوێژ **gelawêj** لە گڕ ـ هاوێژ **giř-hawêj** ەوە هاتووە، واتە: كە گڕ و تیشك دەهاوێژێ و بە عەرەبی "الشعری" و فارسی "شعری" یە. وشەی بەرق **berq** كەوتووەتە عەرەبی و فارسییەوە بە شێوەی "برق"، كە لە وشەی بەرك **berk**ی كوردییەوە هاتووە.

**Bersîle** بەرسیلە، لە بەرشیلە **bershîle** و بەرشیرە **bershîre** ەوە هاتووە. واتە: ترێ بەرلەوەی شیرینی تێبپەڕێ.

**Bertîl** بەرتیل، < بەر **ber** + تیل **tîl**. بەر **ber** واتە: پێش **pêsh**. تیلكردن **tîlkirdin** واتە:

خلۆركردن xlorkirdin، خواركردنەوە xwarkirdinewe ی شتێك، وەك لە یاری هەڵماتێندا باوە. وشەی بەرتیل bertîl یش هەیە، كە بەو برە پارەیە، یان، بەو میچە دەبێژدرێ كە لە كایەی هەڵماتێندا دادەنرێ. كەواتە: بەرتیل bertîl پارەیەكە، یان، شتێكە كە لە بەر تلی (پەنجە)ی كەسێكدا دادەنرێ بۆ تیلكردن (خواركردنەوەی) كارێك، واتە: لە رێی راست لادانی كارێك (← تلی tilî، ← پەنجە pence).

**Berz** بەرز، بە ئاڤێستایی بەرەزە bereze و بەرزا berza یە، بە دەنگگۆڕكێی ر r بۆ ل l بووە بە بلند bilind و، بەم شێوەیە چووەتە فارسی و تركییەوە. لە فارسیدا بووە بە بولەند (بلند) و لە تركییدا bülent. لە ئاڤێستادا وشەیەكی دیكەش هەیە كە بۆ بەرزایی berzayî (واتە: بەرزێتی berzêtî) بەكاردێ، ئەو وشەیەش: بەرەزایتی berezaytî یە. وشەی Burg ی ئەڵمانی كە لە بنەڕەتدا لاتینییە و، بەمانای شوێنی بەرز بەكاردێ و "برج" لە زمانی عەرەبیدا، لەم بنەڕەتەوەیە.

**Bes** بەس، لە ئاڤێستادا ڤەس ves ە.

**Betal’** بەتاڵ (← ڤالا vala).

**Bezat** بەزات/ بوێر biwêr (← داك Dak).

**Bezîn** بەزین، سەرنجی وشەی لەبەزچوون le bez chûn بدە كە بە مانای: تەزینی لنگە لە ماندووتییدا ونەتوانینی بۆ بزووتن. بەز bez و بز biz لە بزووتن bizûtin و بزاڤ bizav (حركة) ەوە هاتوون، كە وشەیەكی هێند ۆ ئێرانیی كۆنە. سەرنجی وشەی faire bouger ی فەرەنسی و Bewegung ی

ئەڵمانی بدە، کە هەردووکیان مانای بزووتن دەگەیەنن. بەزین bezîn، مانای شکان shikan ە لە شەڕدا، بەڵام لە بنەڕەتدا مانای راکردن و کەوتنە جووڵە و بازدان bazdan ە و، لە وشەی ئاڤێستایی ڤەز vez ەوە هاتووە کە مانای فرین firîn ە (← باز baz). بازدان لە شێوەی کوردیی باکووردا مانای راکردن و هەڵاتن و رەڤین revîn ە. ← نەبەز nebez کەسێکە کە راناکا و هەڵنایەت.

**Bê** بێ، نیشانەی نەبوونی شتێکە کە لە پەهلەویشدا هەر بێ bê یە و لە فارسیدا بووە بە بی bî.

**Bê awez** بێ ئاوەز، (گەوج gewc، گێل gêl) (← ئاوەز awez).

**Bêgane** بێگانە، (← بیانی biyanî).

**Bêshke** بێشکە، ئامێرێکە کە کورد، جاران، منداڵی خۆیان تێدا پاڵدە خست و دەنواند و رایاندەژەند، پاش ئەوەی منداڵەکەیان بە دەسترازە destraze دەبەستەوە. بێشکە bêshke لە بێچگەهـ bêchge(h) ەوە هاتووە، بێچکە bêchke واتە: منداڵ، بچووکی مرۆڤ، یان هی ئاژەڵ و مەل. گەهـ ge(h) پاشگرە بۆ شوێن، واتە: جێی بێچکە (شوێنی منداڵ). ئەم وشەیە چووەتە زاری ترکییەوە و بووە بە beşik. لە هێندەك شێوەزاری کوردیدا بە بێشکە دەگوترێ ← دەرگوش dergush، وشەی دەرگوش dergush لە دارگوش dargush ەوە هاتووە، واتە تەختە و دارێك کە بێچکە (زارۆك، منداڵ) بگوشێ بە خۆیەوە، بۆ بێشکە bêshke وشەی لانك lanik یش هەیە کە لانە lane یەکی گچکەیە.

**Bêwer** بێوەر، واتە: بێ ئەنجام bê encam. وشەکە بەرامبەر بێبەر bêber ە، کە لە ئاڤێستاییدا بە ئەڤەرێ be everê یە.

## B ب

**Bêwez** بێوەز، (← ئاوەز **awez**).

**Bêz** بێز (← **qêz** قێز).

**Bêzar** بێزار. بێ **bê** + زار **zar** (زار مانای **deng**ە ← **zar** زار). **Bêzar**بێزار واتە: بێ دەنگ و بێتاقەت **bêtaqet** و **bêdeng** لە چالاکیکەوتوو.

**Bêzat** بێزات، واتە: بێورە **bêwire**. وشەی بێزات **bêzat** لە بێ زەرت **bê zert**ەوە هاتووە، "زەرت" **zert** مانای دڵ **dil'** ە. وشەی زەرت **zert** لە زمانی کوردیدا لە وشەی دڵ **dil'** کۆنترە. (دەنگی ز **z** لە دەنگی د **d** کۆنترە، سەرنجی وشەی زەریا **zerya** و دەریا **derya** بدە) لە کوردیدا دەگوترێ زاڤا **zava**، لە فارسیدا دەگوترێ داماد **damad** و نموونەش بۆ ئەمە زۆرە. **Bêzat** کەسێکە کە دڵی بەهێز نەبێ، واتە ترسنۆك **tirsonek**/ترسۆنەك **tirsinok** بێ.

**Bêzŭ** بێزوو (← **qêz** قێز).

**Bijar(tin)** بژار(تن) (← **bizûtin** بزووتن).

**Bijîshk** بژیشك، دوکتۆر (← چازان **chazan**) بژیشك **bijîshk** لە بژی **bijî** + شك **shk** ەوە هاتووە. ـ شك **shk** ـ وێنەیەکی دیکەی چك **chik** و کورتکراوەی چێك **chêk** و چێکردن **chêkirdin**. (ددان چێکەر **didan chêker** = واتە: دان چاکەرەوە، دانساز **dansaz**). لە زمانی کوردیدا وشەی بژیك **bijîk** هەیە و، بە کەسێك دەگوترێ کە بتوانێ خۆی خۆی بژێنێ. بژیشك **bijîshk** بەم جۆرە ئەو کەسەیە کە دەسەڵاتی ژیاندنی هەیە، کە ئەوەش بۆ دوکتۆر بە کاردەبرێ. ئەم وشەیە لە فارسیدا پزیشك **pizîshk**ە، کە ئەم وشەیە پێوەندیی بە وشەی بژیشك

**bijîshk** ی کوردییەوە نییە. پزیشك **pizîshk** لە وشەی ئینگلیزی **physician** (فیزیشن) ەوە هاتووە. دوور نییە ئەم بژیشك **bijîshk** ی کوردییە، وێنەیەکی کوردیی ئەو وشە لاتینییە کۆنەبێ کە پێوەندیی بە وشەی فیزیۆ وە هەیە، کە ئەندامی لەشە، ئەگەرچی بژیشك، لە پەهلەویدا بچەشك **bicheshk**ە و، زۆر نێزیکە لە بژیشك **bijîshk** ەوە.

**Bil'êse** بلێسە، بریتیە لە بەرزبوونەوەی گڕ و تیشکی ئاگر. وشەکە لە بنەڕەتدا برێسە **birêse** و برێس **birês** ە، کە هەردووکیان لە کوردیدا هەن، هەروەها لەگەڵ وشەی ئەڵمانی **Blitz** (هەورە تریشقە) و ئینگلیزی **blase** (گڕی ئاگر)، یەك ڕەگیان هەیە. وشەی **Berq** برق ی عەرەبی کە بە مانای هەورە تریشقە و بریسکەدانە لە مە وەگیراوە (⟵ بروسك **birusk**).

**Bilûr** بلوور، جۆرە شووشەیەکی بە نرخە لە **beryllus** ی لاتینیەوە هاتووە کە بەمانای درەوشان و تیشکهاویشتن و بەردی بە نرخە دێ.

**Bilûz** بلووز، لە وشەی فەڕەنسی **blouse**ەوە هاتووە.

**Bilwêr** بلوێر/ **Bilûr** بلوور، وشەیەکی کوردی زۆر کۆنە لە بـ **bi** و لوێر **liwêr** ەوە هاتووە، واتە: بەو شتە دەلوێرێندرێ. سەرنجی وشەی لاتینی **lyra** بدرێ کە لە وشەی یۆنانیی کۆن λϋρα ەوە هاتووە و ئێستە لە ئەڵمانیدا بە شێوەی **lyra** بە کاردێ. هەروەها سەرنجی وشەی **lyrik** ی ئەڵمانی بدرێ کە لە فەرەنسییەوە وەرگیراوە و، بۆ هونراوەی لیریکی **poèsie lyriaque** بە کاردێ، کە

ئەمەش لە وشەی لاتینی lyricus و یۆنانی lyrikos (λυρικός)ەوە هاتووە.

**Bilxur** بلخور، بلهور bilhur، بلخور bilxur، بە ساوەرێك، یان شتێك دەگوترێ کە کوترابێ. بلخور bilxur = > بل bil + خور xur، بل bil شتێکە کە نەرم بووبێ (تەماتەکە بڵە tematеke bil'e). خور xur وێنەیەکی دیکەی هور hur ە واتە: هورد hurd (ورد wird). بلخور bilxur کراوە بە بلغور bilxhur و کەوتووتە زاری ترکییەوە بە شێوەی burgul بورگول و، بە گۆڕینی شوێنی دەنگەکانی بووە بە (برغل) burxhul و، بەو شێوەیە کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە.

**Bin** بن، لە بوونە bûne ی ئاڤێستاییەوە هاتووە.

**Binaxe** بناخە، > بن bin + ئاخ ax + ـە e. ← ئاخ ax مانای ← گڵ gil' و ← خاك xak ← زەوی zewî یە. بناخە binaxe واتە: بن ئاخ bin ax و بن زەوی bin zewî ، ئاخ و خاك هەریەك وشەن، بە جێگۆڕینی دەنگەکان بەو دوو جۆرە دەرهاتوون.

**Binc** بنج، و بنچ binch، بنچینە binchîne > بنجینە bincîne واتە: لە بن bin و جێهێن cêhên ەوە هاتووە. واتە: (بنی جێ)، ئەو جێیەی کە بنی شتەکەی تێدایە.

**Binch** بنچ، (← بنج Binc).

**Bineche** بنەچە، لە بنە جەه bineceh ەوە هاتووە، واتە: جهێی (شوێنی) بنك bink و رەگەکەی.

**bineřet** بنەڕەت لە بنەڕەگ binereg ەوە هاتووە. (←بنیات biniyat).

**Binyat** بنیات، بە مانای بنچینە **binawan** و بناوان **binchîne** دێ. بە پەهلەوی: بون ـ دات **bun-dat** ە و، لە فارسیدا بووە بە بنیاد **bonyad**. لە عەرەبیدا بووە بە بنیان. بنیان **bunyan** لە بن **bin** + نیان **niyan** ەوە هاتووە. نان **nan** لە کوردیدا مانای دانان **danan** ە (ئەو سەرینە بنێ ژێر سەرت، واتە: دایبنێ ژێر سەرت).

**Bira** برا، بە پەهلەوی: براتەر **birater**ە وبە فارسی برادر **berader** و بە ئینگلیزی **brother** و بە ئەڵمانی **Bruder**، وشەیەکی هیندۆئەوروپاییی کۆنە و، کەوتووتە زاری ترکییەوە بە شێوەی **birader**.

**Birde** بردە، بە شتێ براو و دزراو دەگوترێ (کردەی من و بردەی تۆ). بە کوێلە **koyle** ش دەگوترێ: بردە. لە پەهلەویدا وشەی ڤەرتەك **vertek** هەیە، کە لە فارسیدا بووە بە "بُردە".

**Biringî** برنگی (⟵ قەیچی **qeychî**).

**Birk** برك (⟵ ئەستێرك **estêrk**) لە برگە **birge** ەوە هاتووە، کە بەو شوێنە دەگوترێ کە لە زەویدا دەبڕدرێ بۆ جۆگەلە دروستکردن. وشەی "برکە"ی عەرەبی بە مانای حەوز **hewz** لەمەوە هاتووە.

**Bist** بست، (مست **mist**)ە. هەردووکیان بنچینەیان یەکە، دوو وشەی هێندۆئەوروپاییی کۆنن. بە ئینگلیزی **fist** و بە ئەڵمانیی و **Faust** و بە ئەڵمانی پەتیی کۆن **füst** ە. کە **Faust** بە ئەڵمانی مستە کۆڵەیە.

**Biste** بستە، (پستە **piste**) کە لە زمانە ئەوروپاییەکانیشدا هەیە. بە ئەڵمانی **pistazie** و بە

ئینگلیزی **pistachio** و به فەرەنسی **pistache**. له عەرەبیدا بووه به فستق به گۆڕینی دەنگی پ **p** بۆ ف **f**. وشەیەکی کۆنی کوردیی ـ ئێرانییە. که به یۆنانی **fistákè** (φιστίκι) و به لاتینیی نوێ **pistacia** یە.

**Biyanî** بیانی، له شێوەزاری کوردیی باکووردا بۆ بێگانه **bêgane** بەکاردێ. بیانی < بـ **bi** + یانی **yanî** < بێ **bê** + یانی **yanî**. بـ **bi** کورتکراو و گوشراوی بێ **bê** یە. یانی **yanî** و خانی **xanî** (خانوو **xanû**) یەکمانان. تەنانەت وشەی یانه **yane**، دەمێکه له نێو کوردی باشووری کوردستاندا بۆ نادی ی عەرەبی و **club** ی ئینگلیزی بەکاردێ (نموونە: "یانەی سەرکەوتن" له بەغدا). کەواته "بیانی **biyanî**" مانای "بێ خانی **bê xanî**" یە. واته: کەسێك که نیشتەجێی شوێنێك نەبێ و بێ ماڵ بێ. هەروەها وشەی "بێگانه **bêgane**" ش له بێ **bê** و گانه **gane** ەوە هاتووە. گانه **gane** وێنەیەکی دیکەی خانه **xane** (خانی **xanî**، خانوو **xanû**) ە. که له زمانی عەرەبیدا بووه به "حانه **ĥane**" و بۆ ئەو دوکانه بەکاردەبرێ که مەی و خواردنەوەی ئەلکۆلی تێدا دەخورێتەوە. هەروەها وشەی حانوت **ĥanût** که له زمانی عەرەبیدا بۆ دوکانی گچکه بەکاردەبرێ، له خانووتك **xanûtk** ەوە وەرگیراوە، واته: خانه (خانوو) یەکی گچکه. وشەی بیانی **biyanî** به جێگۆڕکێی شوێنی دەنگەکانی، بووه به **yebanî** و بەو جۆره

چووەتە زاری تركییەوە، كە وشەی yabanci (یەبانجی) بۆ "بیانی biyanî" بەكاردەبرێ.

**Biyanû** بیانوو، واتە: بەڵگەی نابەجێ. لە بێ bê + هاندۆ hando (مقدار) ەوە هاتووە. واتە: قسەیەك كە هەند hendی نەبێ.

**Biyawan** بیاوان، بە شوێنێ بێ ئاو و بێ سەوزە دەگوترێ. لە پەهلەویدا ڤیابان viyaban و ڤیاڤان viyavan هەیە كە هەردوو بە یەك مانا دێن. دیارە ئاب ab و ئاڤ av لە پەهلەویدا مانای ئاو/ڤ aw/v (← ئاو/ڤ aw/v)ە.

**Bizav** بزاڤ (← bizûtin بزووتن).

**Bizin** بزن، بە پەهلەوی: بەچەك bechekە. دەنگی چ دەگۆڕێ بو ژ j و ز z، بۆ وێنە رۆچ roch > رۆژ roj > رۆز roz (فارسی: رۇز rûz).

**Bizŭtin** بزووتن، بزاڤ bizav، بزۆك bizok، بزۆز bizoz كە بە مانای جووڵە cul’e و جووڵان cûl’an و فرەجووڵ firecûl’ دێن. دەبێ بنچینەیەكی زۆر كۆنی هێندۆئەوروپاییان هەبێ. لە زمانی فەرەنسیدا وشەی boujet هەیە بە مانای جوولە و بزووتن و، لە ئەڵمانیدا وشەی Bewegung هەیە هەر بەو مانایەیە. دیارە، وشەی بژار bijar و بژارتن bijartin یش پێوەندییان بەم بنەچەیەوە هەیە. چۆنكە بژارتن bijartin بزواندنی هێندەك شتە لە شوێنی خۆیان بۆ شوێنێكی دی. (← بەزین bezîn).

**Bîber** بیبەر، بە سانسكریت pîppelî پیپەلی یە كە لە عەرەبی و فارسیدا بووە بە فلفل. لە ئەڵمانیدا paprika یە.

**Bîmar** بیمار (نەخۆش nexosh) بە پەهلەوی: ڤێمار vêmar ە. ڤێه weh بە ئەڵمانی ئازار azar ە.

**Bîr** بیر/Vîr ڤیر. بە پەهلەوی ڤیر vîrە.

**Bogen** بۆگەن، (← گەماڵ gemal’).

**Bosh** بۆش، (ڤالا vala، والا wala) لە بووش bûsh < پووش pûsh < پووچ pûch ەوە هاتووە، کە وشەی pŭt پووت یش هەر هاوڕەگی وانە.

**Bokwê** بۆکوێ، (کوێوە kwêwe)، بە کوردیی باکوور کیڤە kîve و کووڤە kŭve یە، لە ئاڤێستادا کڤە kve یە و لە فارسیدا بووە بە کَجا koca.

**Boyimbax** بۆیمباخ، وشەیەکی ترکییە، لە بوین باغ ەوە هاتووە، boyun بۆیون، لە زاری ترکیدا بە mil مل دەگوترێ و باغ bağ مانای بەندە. (← قەروێت qerewêt ← ملبەند milbend).

**Brusk** بروسك (بروسکە bruske) (← Berq بەرق).

**Butil’** بوتڵ، بە شووشەیەك دەگوترێ کە گاز، یان شلاییەکی تێدەکرێ. لە وشەی لاتینی ـ فەڕەنسی یەوە هاتووە کە بە فەڕەنسی bouteille یە.

**Bûdel’e** بوودەلە < Bûd بوود + ـەڵە el’e (نیشانەی گچکەکردنەوەیە). بود Bûd لە پووت put ەوە هاتووە کە هاومانای پووچ pûchە. بوودەڵە کەسێکە هیچی لەباردا نەبێ و بێدەسەڵات بێ، واتە: نێوەرۆکی پووچ و پووت بێ.

**Bûk** بووك، بە کچێك، یان ژنێك دەگوترێ کە ببرێ بۆ زاوا، یان، ماوەیەکی کورت بێ کە برابێ بۆی. لە سانسکریتدا وشەی ڤەدوو vedû هەیە بو مێیینە mêyîne. لە کوردیدا وشەیەکی دی هەیە بۆ بووك bûk ئەوەش وەوی wewî یە کە وشەی hewê هەوێ/ hevî هەڤی کە

# B ب

hev-vî/haw-wê هاو ـ وێ
haw هەڤ ـ ڤی یە واتە: هاو مێ
mê/ هاو ژن haw jin لە مەوە
هاتووە. wê وێ لە زمانی
کوردیدا ئامرازی مێیینەیە، بۆ
وێنە: wê gut وێ گوت، واتە:
wê .jineke gutî ژنەکە گوتی
وێ و mê مێ یەك بنەڕەتن.
هەروەها لە ئاڤێستادا وشەی
یوپە ـ ڤەد yupe-ved هەیە بۆ
شووکردن، وشەی بووك bûk لە
فارسیدا بووە بە بیوگ beyûg.

Bûm بووم (← ئێران Êran).

Bŭt بووت (← تات tat).

**Cadû** جادوو، (سیحر) بە ئاڤێستایی یاتوو yatû ە. پەهلەوی یاتووك yatûk.

**Cam** جام، دەفری بچووك بۆ ئاو خواردنەوە. بە پەهلەوی جام cam و یام yam ە.

**Camane** جامانە، (جۆرە مێزەرێکە پیاوانی کورد لە سەری دەنێن)، لە پەهلەویدا جامەك camek و یامەك yamek هەیە بە مانای پارچە کالآیەك کە هێشتا نە دوورابێ. وشەی جاو caw کە جۆرە شالێکە لە داوە لۆکە چێدەکرێ، لە مەوە هاتووە. جامانە camane و جاوانە cawane هەر یەکشتن. دەنگی م m و، و w جێییەکان گرتووەتەوە. هەروەها لە کوردیدا وشەی جام cam بۆ کالآی لە بەرکردن بەکارهاتووە. بۆ وێنە: جامەمەرگ camemerg (کفن)، dêwcame دێوجامە، واتە: جلکی دێو cilkî dêw.

**Cambaz** جامباز، (دەلاڵ) لە کوردیدا وشەی جامبازە cambaze، یان جەمبازە cenbaze هەیە بۆ دەست و پێ بزووتن و هەتڕینی بەرزە ولآخ. کە ئەم وشەیە لە جەم cem (جم و جووڵ cim û cûl' واتە: بزووتن bizûtin) ە وە هاتووە. باز baz (بازدان bazdan، واتە: جوولآن cûl'an). بەو کەسەی کە دەبێتە هۆی کرین و فرۆشتنی بەرزە ولآخ دەگوترێ جامباز cambaz، هەروەها بە مرۆڤی فێلباز fêlbaz یش (←fêl' فێڵ).

**Camemerg** جامەمەرگ (← جامانە camane).

**Can** جان، لە پەهلەویدا هەروەك کوردیی ئەورۆ گیان gyan ە و

له فارسیدا به شێوەی جان can بەکاردێ، کە لە کوردیی باکووریشدا هەر بەو جۆرەیە، وشەکە بە شێوەی جان can کەوتووەتە زاری ترکییەوە.

**Cash** جاش، جاش cash کەسێکە کە کارێك بگرێتە دەست کە کاری، یان پیشەی خۆی نەبێ. جاش پۆلیس cash polîs کەسێکە کە پۆلیس نەبێ، بەڵام کاری پۆلیس بکات. جاش کەوش cash kewsh، پێلاوێکە کە جێی کەوش بگرێتەوە، بەڵام کەوش نەبێ. جاش cash لە "لە جیاتی شت le ciyatî shit"ەوە هاتووە. پێوەندیی نییە بە جاشەکەر casheker ەوە کە لە بنەڕەتدا جاشك cashk ەو، هاوڕەگی ← جووچك cûçik ە.

**Caw** جاو (← camane جامانە).

**Cecal'** جەجاڵ/ دەجاڵ decal' < دەج dec + ئاڵ al'. دەج dec لە دژ dij ەوە هاتووە کە مانای پێچەوانەیە. ئاڵ al' لە ئەفسانەی کوردیدا نێوی دێوێکە کە منداڵ دەکوژێ، بەڵام لە بنەڕتدا نێوی "خۆدێ" بووە. دوورنییە ئاڵ al' لە بنەڕەتدا ئار ar (ئاگر agir) بووبێ. دژئاڵ dijal' < دەجاڵ decal' مانای دوژمنی خۆدێ. بێجگە لە مەش، ئاڵ al' نێوی دایکی رۆستەمی زاڵ بووە. دەجاڵ decal' وەك دَجّال کە بە "دَجّال الاعور" واتە: "جەجاڵە کۆر cecal'e kor" بەنێوبانگە، کەوتووەتە زاری عەرەبی و فارسییەوە. وشەی "دَجَلْ" لە زاری عەرەبی و "دَغَلْ باز" لە زاری فارسیدا، هەروەها دەخەڵی

dexelî (فێڵکردن fêl'kirdin)ی کوردی، لەمەوە هاتووە.

Cefeng جەفەنگ/ زەڤەنگ zeveng، زەڤ zev لە کوردیدا وێنەیەکی دیکەی دەڤ dev ە. کە دەم dem ە. دەم/ڤ dem/v بە ئاڤێستایی zefenە. ئەنگ eng لە ئاهەنگ aheng ەوە هاتووە. جەڤەنگ cefeng واتە: ئاهەنگی دەم ahengî dem.

Cehenem جەهەنەم، (← دۆژە doje/ دۆژەخ dojex/ دۆزەخ dozex) کە گوایە وشەیەکی ئارامییە بە مانای "جێی نزم cêy nizim". راستیەکەی وشەکە ئارامی نییە، کوردییە. جەهەنەم cehenem لە جەهـ ceh (واتە: cê(h) جێ) و نم nim کە لە نزم nizim ەوە هاتووە، واتە: جێی نزم cihêy nizim کە لە قورئاندا بە "أسفل ألسافلین" نێوی رۆیوە. جەهەنەم cehenem کوردییەکی پەتییە کەوتووتە فارسی و عەرەبییەوە.

Cemxane جەمخانە، شوێنی کۆبوونەوەی کوردە عەلەوییەکانە (← عەلەوی Elewî) بۆ کاروباری ئایینی خۆیان. جەمخانە cemxane لە "جمع خانە" ەوە نەهاتووە، بەلکو جەم cem لە کۆم kom و کۆمەڵ komel' ەوە هاتووە (← کۆمار komar). دەنگی ك k لە زمانی کوردیدا هێندەك جار بە دەنگی گ g دەگۆڕێ، سەرنجی وشەی گۆماو gomaw بدە کە کۆم ـ ئاو kom-aw ە، هەروەها وشەی باوگ bawig لە جیاتی باوك bawik لە شێوەزاری کوردیی فەیلیدا. هێندەك جار، دەنگی g گ دەبێ

به c ج (giyan گیان دەبێ به can جان).

Cengel' جەنگەڵ، به سانسکریت جەنگەلە cengele یه و به ئەڵمانی Jungel ە.

Ceř جەڕ، ئەو برخووەیە کە بۆ قایمکرن و پێکەوەبەستنی دوو پارچە دار، یان، دوو پارچە ئاسن بە کاردەبرێ، لە کاتێکدا بەهۆی ئامیرێکەوە بادەدرێ کە پێیدەگوترێ جەڕبادەر ceřbader. هێندەك جاریش پێدەگوترێ ← دەرنەفیس dernefîs. جەڕ ceř لە گەڕ geř ەوەهاتووە. چۆنکە جەڕ ceř بەجەڕبادەر cerbadeř بادەدرێ و خولدەدرێ و دەهێنرێتە گەڕاندن geřandin (جەڕاندن ceřandin) واتە: بادان و گەڕاندن و خولدان و جووڵاندن. لە کوردیدا دەگوترێ: بیجەڕێنە bîceřêne واتە: بیگەڕێنە bîgeřêne. وشەی جَرّ و جریان ی عەرەبی لەمەوە هاتووە. (← خەڕەك xeřek) هەروەها وشەی جەیران ceyran کە کوردیی باکوور بۆ تەوژمی ← کارەبا kareba/ kariva بەکاریدەبەن لە ← گەریان geryan ەوە هاتووە.

Ceste جەستە، (لەش lesh) ← هێژا hêja.

Cewal' جەواڵ/ Ciwal' جواڵ. تووروەکێکی دەم پەل و کەم قووڵ. لە ce جە، واتە: cê جێ و wal' واڵ، واتە: کە دەم کراوە و کەم قووڵ. لە ترکیدا بووە بە çuval و لە عەرەبیدا بووە بە جولق.

cê جێ، بە پەهلەوی گیاك giyakە، بە فارسی جا ca یە. پاشگری گا ga (گە ge، گەهـ geh) کە بۆ جێگە cêge بەکاردێت، لە مەوە هاتووە.

**Cêjin** جێژن/ جەژن **cejin**، کە گێژن **gêjin** یشی پێدەڵێن، لە گێژ **gêj** و گێز **gêz** و گێزان **gêzan**/ گێژان **gêjan** ەوە هاتووە، کە بە مانای جووڵان **cûl'an** و گێزان **gêzan** (راتلەکان **ratlekan**)ە. وشەی جۆش **cosh** بە مانای جووڵان **cûl'an** و گەرم بوون **gerimbûn** یش هەر لەم بنچینەیەوە دێ. دەگوترێ: سەماوەرەکە کەوتووەتە گیزە، واتە: کەوتووەتە گەلاربوون و جۆش خواردن. گێژاو/ڤ **gêjaw/v** واتە: جووڵانی ئاو **cûl'anî aw/v** جۆشی ئاو/ڤ **coshî aw/v**. جێژن **cêjin** بە پەهلەوی جەشن **ceshin** ە.

**Ciger** جگەر، جەرگ **cerg** بە پەهلەوی جکەر **ciker** ە.

**Cil'fiř** جلفڕ، مرۆڤی شێتۆکە **mirovî shetoke** (← جلخوار **cilxwar**)

**Cilxwar** جلخوار، وشەیەکە لەسەر دەمی شانشینی کوردستان شێخ مەحموودا پەیدابوو بۆ نێونانی ئەو کەسانەی کە کورد بوون، بەڵام دەیانویست حکومەتی عوسمانی و دەسەڵاتی ترک بهێننەوە کوردستان و، بە زۆریش بە ترکی قسەیان دەکرد. وەك لە ئەفسەر جەمال عارف کەرکووکیم بیست لە بەغدا لە پەنجاکاندا، ئەم وشەیە لە لایەن جەمالی عیرفانەوە داهێنراوە. جەمال عارف لە کاتی فەرمانرەوایی شێخ مەحموودا، لە لەشکری کوردستاندا ئەفسەر بووە، وەك جەمالی عیرفان و کامیلی حەسەن ئەفەندی و قالەی ئایشەخان و ئەحمەد بەهجەت و، چەند کەسێکی دی. جلخوار **cilxwar** لە جلی خوار **cilî xwar** ەوە نە هاتووە، بەلکو لە "جر **cir**" ی خوارەوە هاتووە. جر **cir** لە کوردیی باکووردا بە مانای خووڕەوشت دێ. دەگوترێ: جرێ وی خراپە **cirê wî xirape** واتە: ڕەوشتی

وی خراپە. لە کوردیدا بە مرۆڤی شێتوکە و کەسێك کە قسەی هەلەق و مەلەق بکا دەگوترێ ← جلفڕ **cil’fiř**، کە ئەوەش لە جلّ **cil’** (جر **cir**) و فڕ (لە فرین **fiřîn** ەوە) هاتووە. واتە: جرفڕ **ciřfiř** ە ڕەوشتوخووی وایە کە قسەی بێسەروبەری وا دەکا، هەر قسەیەکی بە لایەکدا دەفڕێ.

**Cinêw** جنێو، (جوێن **ciwên**، سخێف **sixêf**، دژوون **dijûn**). جنێو **cinêw** > دژنێو **dijnêw** (ژ **j** وێنەیەکی دیکەی دەنگی چ **c** یە). لە کوردیدا بۆ جنێو **cinêw** وشەی دژون **dijûn** و دژوێن **dijwên** یش هەیە. نێو **nêw** (ناو/ڤ **naw/v**) ە. دژ **dij** لە دژایەتی **dijayetî** یەوە هاتووە، واتە: دژی شتێك گوتن. بە فارسی "دشنام" **dishnam**ە.

**Ciwên** جوێن (← **cinêw** جنێو، ← دژوێن **dijwên**/ دژنێو **dijnêw**).

**Ciya** جیا/ جودا **cuda**، بە پەهلەوی یوتاك **yutak** و جوتاك **cutak**ە.

**Ciyawaz** جیاواز. مانای لەیەك نەچوو **leyeknechû** ە. وشەکە لە جێ **cê** (واتە: شوێن) و واز **waz** ەوە دێ. جیاواز **ciyawaz** بەم جۆرە، جێ واز **cêwaz** ە، واتە: لە جێ جوولاوە و لە جێیەکی دیکەیە. وشەی **ciyawaz** لە زاری عەرەبیدا بە شێوەی: جاوَزَ، یتجاوز، تجاوزاً دەرچووە، بەمانای لە جێ و سنووری خۆ دەرچوون.

**Cîř** جیڕ، بە شتێك دەبێژن کە سفت بێ و باش نە جووڕێ. هاومانایەکی دیکەشی هەیە

# C چ

ئەوەش چیڕ chîř ە. چیڕ chîř و
جیڕ cîř لە چڕ çiř ەوە هاتوون.
Co جۆ/ yew یەو/ yeve یەڤە. بە
پەهلەوی یەو yew ە.
Col'a جۆلا ، لە جوولان cûl'an
(بزووتن bizûtin) ەوە دێ.
سەرنجی وشەی جم و جۆل cim
û col' بدرێ، کە جۆل col'
وێنەیەکی دیکەی گۆل gol'
(گوڕ guř = خێرایی xêrayî
یە). (سەرنجی جووتەوانەی:
گورج و گۆل gurc û gul' بدە،
← Gurc گورج).
cumhûr جومهوور، بە عەرەبیکراوی
وشەی کۆمار و گۆمارە (←
کۆمار komar).
Cûchik جووجك بێچووی مریشك،
یان مەلێکی (← mel مەل)
دیکەیە، بە پەهلەوی ژووزەك
jûzek ە. جووجك لە چووچك
chûchik ەوە هاتووە بە مانای
"پچووك pichûk" . دەنگی چ
c و دەنگی چ ch زۆر جار
جێییەك دەگرن. بۆ وێنە جووت
cût کە لە شێوەزاری کوردیی
ناڤیندا بە دوانە diwane
دەبێژرێ، لە شێوەزاری
کرمانجکی (زازاکی) دا دەبێتە
چوت chut. وشەی چووچك
chûchik ی کوردی بە وێنەی
چۆجوق/ك çocuk چووەتە
زاری ترکییەوە، بۆ ←
زارۆ/ك zarok (← منداڵ
mindal') بە کاردەبرێ.
جووجك cûchik بە فارسی
جوجەیە. وشەی جوو cû ی
کوردی، پێوەندی بە وشەی
Jung ی ئەڵمانی و Jong ی
ئینگلیزی و Jeune ی
فەرەنسییەوە هەیە کە بە مانای
← گەنج genc بە کاردەبرێن.
لە زمانی کوردیدا، گەلێك وشە
هەن کە پێوەندییان بە ←
گەنج genc ەوە هەیە، وەك

جوان ciwan، جوانوو cwanû
(بێچووی ئەسب، ئەسپی گەنج).

**Cûn** جوون، جوون و جاوین cawîn
هاومانان. وشەکە بنەڕەتێکی
هێندۆئەوروپاییی کۆنی هەیە.
بە ئەڵمانی kauen و بە
ئینگلیزی chewing وبە فارسی
جاویدن. بنەچە و ڕەچەڵەکی
جاوین cawîn کاوین kawîn ە
(← قاوت qawit). هەر لە
ئەڵمانیدا وشەی kauern هەیە
بۆ کاوێژکردن kawêjkirdin.

**Cût** جووت (جۆت cot)، لە جوو cû +
ت t ەوە هاتووە. جۆ cû
وێنەیەکی دیکەی دوو dû ە و ت
t ش لە تا ta/تێ tê هاتووە،
واتە: دووتاکردن dûtakirdin
دووتێکردن dûtêkirdin.

**Cûtkirdin** جووتکردن/ جۆتکردن
cotkirdin، جۆتکار cotkar/
جۆتیار cotyar واتە: دوو گا
بهێنرێن بۆ زەوی کێلان. جوو
cû وێنەیەکی دیکەی دوو dû ە.
ت t لە تا ta/ تێ tê وە هاتووە
واتە: دوو گا بکرێنە یەك (←
جووت cût، ← جۆت cot).

# CH چ

**Chadir** چادر، لە وشەی سانسکریتی چەتەر **cheter**ەوە هاتووە. کە وشەی ← چەتر **chetir** (← سەیوان **seywan**) یش هەر لە مەوە هاتووە. فارسی ئەم وشەیەی وەرگرتووە و بەکاری دەهێنێ بۆ ئەو سەرپۆشە ژنانەیەی کە هەموو سەر و چاو دادەپۆشێ، کە بە کوردی ← چارشێو **charshêw** ە.

**Chak** چاك (← **chûk** چووك).

**Chaket** چاکەت لە **Jaket** ئینگلیزی و **jaquette**ی فەرەنسییەوە هاتووە، کە بە ئەڵمانی **Jacke** یە.

**Chap** چاپ/ **chapxane** چاپخانە. چاپ **chap** بە نەخشبوونی هێڵێك، یان وێنەیەك دەگوترێ لەسەر شتێکی دیکە. لە سانسکریت و هێندیی کۆندا چهاپ **chhap** بە نەخشکێش دەگوترێ.

**Charchî** چارچی، لە هێندەك شێوەزاری باکووردا بە دوو شەقام دەگوترێ کە یەکتریان گردە بڕ بڕیبێ و، چوار رێیان لەمە دروستکردبێ. چارچی **charchî** لە چوار جی **chwar cî** (چوار جێ **(chwar cê (h**) وە هاتووە.

**Charshêw** چارشێو/چارشەو **charshew**/ چارشۆ **charsho**. چارشێو **charshêw** > چار **char** + شێو **shêw**، چار **char** کورتراوەی ← چادر **chadir** ە. شێو **shêw**/ شێڤ **shêw** تاریکایی شەو/ ڤ، واتە: چادرێك کە تاریکایی و نەبینراوییەك پەیدا بکا، وەك تاریکاییی شەو. چارشێو **charshêw** لای کورد بەو جاجمەش دەگوترێ کە نوێنی شەوی تێدەخرێ.

## CH چ

**Chay** چای/ چایی **chayî**. وشەیەکی چینییە کەوتووتە نێو زمانی کوردی و، گەلێك زمانانی دیکەی جیهانەوە. خەڵکی چین 3200 ساڵ بەر لە دایکبوونی عیسا، چاییان ناسیوە و، لە چینەوە چایی بەرەو هێندستان و سریلانکا و شوێنانی دیکە چووە.

**Chazan** چازان، ئەم وشەیە لە چیرۆکی فۆلکلۆریی کوردییدا بە مانای ← بژیشك **bijîshk** (دوکتۆری نەخۆشی) دێ. چازان **chazan** لە چارەزان **charezan** ەوە هاتووە. ئەم وشەیە "چار **char**" (چار چییە **char chiye?**) لە گەڵ وشەی **cure** ی ئینگلیزی و وشەی **kur** ی **to** ئەڵمانی، کە بە مانای پرۆسەی چاکبوونەوە لە نەخۆشی دێ، رەگیان یەکە. وشەی **kur** ی ئەڵمانی لە وشەی **cura** ی لاتینییەوە دێ، کە بە "مشوور خواردن بۆ چاککردنەوەی نەخۆشی و خزمەتکردنی نەخۆش" دێ. وشەی **cure** ی ئینگلیزی، کە بە مانای "چاککبوونەوە" دێ، ئەمەش هەر لەو رەگەزە لاتینییە یە. وشەی چار **char**ی کوردی بە پەهلەوی: چەر **cher**ە.

**Chek** چەك (← چووك **chûk**)

**Chekush** چەکوش، لە چەك **chek** + کوت **kut** ەوە هاتووە. واتە: ئامێرێك، چەکێك کە بۆ شت کوتاندن بەکاردێ. لە ئاڤێستاییدا چەکووشە **chekûshe** یە. وشەکە چووەتە فارسی و زاری عەرەبیی خەلکی عێراقەوە.

**Chemche** چەمچە، بچووککراوەی وشەی چەم **chem** ە. چەم **chem** وێنەیەکی دیکەی ← جام **cam** ە، واتە: جامچە **camche** (جامێکی بچووك **camêkî bichûk**).

**Chena** چەنا (← کچ **kich**).

# CH چ

**Chend** چەند، بڕێکی نادیار لە شتێك. بە پەهلەوی: چەند **chend**، و لە فارسیشدا چند **chend** ە، وشەی چەند **chend** لە چ **chi** و هەند **hend** (مقدار) ەوە هاتووە. واتە: چ هەند؟ **chi hend**، چ بڕ؟ **chi biř**.

**Chepřaz** چەپڕاز، لە چەپڕاست **chepřast** ەوە هاتووە. نیشانەی **X**. هەروەك خۆی بە شێوەی **çapraz** کەوتووەتە زاری ترکی.

**Cheqo** چەقۆ (← چووك **chûk**).

**Cheres** چەرەس (جۆرە خواردنێکە بریتییە لە ← مێوژ **mêwij** و ← پستە **piste** و وشکەمەنی **wishkemenî** ی دیکە کە بە شەوان، لەگەڵ چایی، دەخورێن و، پێیدەگوترێ شەوچەرە **shewchere**، چەرە **chere** لە چەورە **chewre** ەوە هاتووە (← چەور **chewir**). چڕان **chiřan** (خواردن/ بۆ ئاژەڵ بەکاردەبرێ) واتە: لەوەڕین **leweřîn**. چڕان **chiřan** وێنەیەکی دیکەی تڕان **tiřan** ە، (سەرنجی وشەی تێتڕاندن **têtřandin** بدە، کە بۆ ئاژەڵ بەکاردەبرێ، کاتێك بخوات و، بە مرۆڤی زۆر خۆریش دەگوترێ). چەرەس **cheres** لە: چەورە ـ ئاسا **chewre-asa** ەوە هاتووە، واتە: وەك خواردنی چەور، لە بابەتی خواردنی چەور.

**Cherim** چەرم، بە ئاڤێستایی چەرمەن **chermen** ە و بە فارسی چرم **cherm**.

**Cherx** چەرخ، لە بنەڕەتدا خەرچ **xerch** و خەرچك **xerchik** بووە و، بە گۆڕینی شوێنی دەنگەکان، بووە بە چەرخ **cherx**. چەرخین **cherxîn** واتە: سووڕاندن **sûřandin** و جووڵانەوە **cûl’anewe**. لە

زمانی کوردیدا وشەی خەرچەك xerchek هەیە، کە بریتییە لە دارێك دەزوو هەڵدەپێچن لێی. چەرخەك cherxek لە خەرچەك xerchek ەوە هاتووە، واتە: چەکی خڕاندن (گەڕاندن و خولدان)، کە دووایی بووە بە ← خەڕەك xeřek. خەڕەك xeřek و ← هەڕەك heřek هەر یەك شتن و هەر لەو وشەیەوە وشەی خول xul (خولدان xuldan خولخواردن xulxwardin و خلبوونەوە xilbûnewe و خلۆربوون xulorbûn و گلۆربوون gilorbûn هاتوون. وشەی "حركة" ی عەرەبی لە خەڕەك xeřek و هەڕەك heřek ەوە هاتووە.

Chetir چەتر، (← سەیوان seywan) لە وشەی سانسکریتی چەتترە chettire ەوە هاتووە، کە وشەی کەپر kepir یش هەر لە مەوە هاتووە، بە گۆڕینی دەنگی چ ch بۆ k و هـ h بو پ p و کەوتنی دەنگی ت t (← چادر chadir).

Chewir چەور، لە بنەڕەتدا شەورshewir ە کە شەو shew وێنەیەکی دیکەی ← شەم shem (واتە: مۆم mom) ە و، مۆم mom یش، وێنەیەکی دیکەی رووناوی rûnawî یە. وشەی شاورمە schawirme کە بریتییە لە بابۆڵە babol’e نانێکی پڕکراو لە گۆشتی سۆرەوەکراو و پیاز و تەماتە و سەوزی و، لوبنانیەکان دەیفرۆشن و ترکەکان Dönerی پێدەڵێن، مانای چەورمە chewirme یە، واتە: چەورەمەنی chewremenî. وشەی قاورمە qawirme کە ترکەکان بە کاریدەبەن بۆ گۆشتی سۆرەوەکراو و خوێکراو، هەر وشەی شاورمە shawirme

و چەورمە chewirme یە. قەور qewir وێنەیەکی دیکەی وشەی چەور chewir ە. قەوراندن qewrandin واتە: چەوراندن chewrandin سۆرکردنەوە لە رووندا. وشەی کەرە kere/ کەرۆ kero ئەوەش هەر لە چەور chewir ەوە هاتووە.

**Chêj** چێژ (⟵ مەزە meze).

**Chêw** چێو (چینکە chînke، پارچەدار parchedar، شڤ shiv) بە پەهلەوی چۆپ chop و لە فارسیدا بووە بە چوب chûb (⟵ شیپ shîp).

**Chilchira** چلچرا، لە چل چرا chil chira ەوە نەهاتووە، بەلکو لە چڕچرا chiřchira وە هاتووە، چڕ chiř وێنەیەکی دیکەی پر pir و فرە fire یە کە بە مانای زۆر zor ێك دێ کە لە نێزیك یەکەوە دانرابن. چلچرا chilchira (چڕەچرا chirechira) واتە: چرای زۆر (⟵ فرە fire).

**Chilêpa** چلێپا. نیشانەی + واتە "صلیب". وشەی سەلێب selîb بووە بە چەلیب chelîb ئەوجا چلێپ chilêp. وشەی چەلەبی chelebî واتە: صلیبي لەم گۆڕینەی وشەی "صلیب" ەوە هاتووە.

**Chil'kin** چلکن، لە چرکن chirkin ەوە هاتووە > چرك chirk + ـن in. چرك chirk لە چەورك chewrik ەوە هاتووە. ـك ik نیشانەی بچووکردنەوەیە. چرکن chirkin واتە: شتێك، یان کەسێك کە چەورییەکی کەمی پێوەبێ. (⟵ چەور chewir، ⟵ چەرەس cheres، ⟵ کەرە kere/کەرۆ kero).

**Ching** چنگ، بە هەموو پەنجەکانی دەست پێکەوە دەگوترێ چنگ ching، هی مرۆڤ بێ، یان هی

گیانەوەرێکی دی، وەك یەکە. وشەی چنگاڵ chingal' کە بۆ خواردن بەکاردێ، لە بنەڕەتدا چنگار chingar و چنگدار chingdarە و، لە مەوە هاتووە. بنەڕەتی چنگ ching وشەی ئاڤێستایی chinghe یە. وشەی چنگاڵ chingal لە زاری ترکییدا کراوە بە چەتال çatal.

**Chingal'** چنگاڵ (← ching چنگ).

**Chiř** چڕ، بە ئاڤێستایی چەریتەو cherîtewە.

**Chira** چرا، بە پەهلەوی چەراگ cherag و چراگ chirag ە و لە فارسیدا بووە بە چراغ.

**Chish** چش، وشەیەکە بۆ ئەوە دەگوترێ کە شتێك بەلای یەکێکەوە گرنگ نەبێ، رووەدەدا یان نا. چش chish < چ ch + تشت tisht، تشت tisht (شت shit) واتە: چ شتێك، هەرچی تشتێك دەبێ، با ببێ.

**Chîmento** چیمەنتۆ/ چەمەنتۆ لە وشەی chemento Zement ی ئەڵمانییەوە هاتووە، بە ئینگلیزی cement ە، کە لە فارسیدا بووە بە سیمان sîman.

**Chîp** چیپ (← شیپ shîp).

**Chok** چۆك (← Ejno ئەژنۆ).

**Chon** چۆن، لە چ chi و، وێنە wêne ەوە هاتووە (چ وێنە؟ chi wêne?).

**Chom** چۆم/ چەم chem (← شەم shem).

**Chûk** چووك، بە زۆری، بە کێری ← منداڵ mindal' دەگوترێ: چووك chûk. بە داوێنێ لای خوارەوەی لەشی پیاویش دەگوترێ: چاك chak (چاکی لێبکە بەلادا، واتە: داوێنێ لێبکە بەلادا و ئازایانە و چالاکانە وەرە پێش). هەر لە کوردیدا، وشەی چاقۆ chaqo هەیە، بە مانای کێر kêr (ئەندامی سێکسی

پیاو) بە چاقۆ chaqo ی گەورەش، دەگوترێ: کێرد kêrd. کێرد kêrd و کارد kard هەر یەك مانایان هەیە لە زمانی کوردیدا، کە وشەی عێر Êr‘ی عەرەبی و کیر skîr‌ی فارسی لە مەوە هاتووە. کەواتە وشەی چەقۆ cheqo (چەکۆ cheko) و چووك chûk و کێر kêr هەموو بە مانای ← چەك chek دێن. بە هەموو ئامێرێکی کاریش، لە کوردیدا دەگوترێ چەك chek، نەك هەر بە کێر kêr. بێجگە لەوەش بە مرۆڤی رووت و قووت و "کێر بەدەرەوە" ش هەر دەگوترێ چەك chek. "چەککردن chekkidin" واتە، رووتکردنەوە لە چەك (ئامێری کار لێسەندن). لە زاری ترکییدا بە کێر kêr دەگوترێ سیك sîk کە سیك sîk لە سیخ sîx ی کوردییەوە وەگیراوە، سیخ sîx بە زەرگی دەرویشەکان و شیش shîsh یش دەگوترێ، کە ئەمەش هەر وەك چەك chek بەکاردەبرێ.

**Chwar** چوار/ چار char لە ئاڤێستادا چەتور chetur، و چەدوەر chedwer ە. لە فارسیدا بووە بە چهار chehar. وشەی چەدوەر chedwer ی ئاڤێستایی لە چوار chwar ی کوردییەوە نێزیکترە وەك لە چار char و چهار chehar ی فارسییەوە.

Dad داد (عەدالەت) بە ئاڤێستایی داتە date و بە پەهلەوی: دات dat.ە

Dahênan داهێنان (أختراع، أبداع)، داهێنان dahênan > دا da + هێنان hênan، دا da پێشگرێکە بۆ "هێنانەخوارێ، هێنانەپێش"، داهێنان dahênan لە پەهلەویدا: دائینا da-îna یە.

Dak داك/ دایك dayik. لە هزوارشن دا بە شێوەی داکیا dakya دێ. کە بنەچەی ئەمەش دەبێ زایك zayik بێ، واتە: بووەیەك کە بزێ. دوور نییە وشەی ← داد dad (عەدالەت) یش کە بە پەهلەوی: دات dat ە، هەر لە زاد zad > ← زات zat ەوە هاتبێ کە بە مانای پیرۆزی pîrozî و بەرزی berzî و بوێری bwêrî دێ. وەك دەگوترێ: ئەم زاتە em zate. بە زاتی خۆدێ be zatî xodê مرۆڤێکی بە زاتە mirovêkî be zate. زاتی نەکرد zatî nekird (نەوێرا newêra).

Dal’aho دالآهو، چیایەکە لە نێوچەی کرماشان بەپێی رامانی یارسانییەکان نهێنیی ئێزدانی لەسەر ئەو چیایە گەیەندراوە بە لایەنگرانی "ئەهلی هەق". دالّ dal’ مانای جێگە cêg یە (سەرنجی وشەی دالآن dal’an و کەندالّ kendal’ و دالّدە dal’de بدە) هۆ ho کورتکراوەی هۆما homa، واتە: خودێ یە.

Danewan دانەوان (← نەوال newal).

Dar دار (درەخت dirext/ دار dar) بە ئاڤێستایی دار ـ ئو uw ـ dar و، پەهلەوی دار dar ە.

Dargush دارگوش (← Dergush دەرگوش).

**Dashpûl’** داشپوول، سندوقی کچکەی نێو ئوتۆمبیل لە ئینگلیزییەوە هاتووە. لە **dish** (قاپ، دەفر) و **pull** (راکێشان).

**Dawa** داوا، لە داخواز **daxwaz** ەوە هاتووە. داخواز **daxwaz** > داخوا **daxwa** > داوا **dawa**. وشەکە پێوەندیی بە "دعوی" ی عەرەبییەوە نییە. هەریەکەیان رەگێکی جیاوازی هەیە لەوەی دییان. (دۆز **Doz**).

**Dax** داخ، جۆرە گەرمییەکە کە بسووتێنێ. لە ئاڤێستادا داگ **dag** و دەژە **deje** یە.

**Dayik** دایك/ دیا **diya**/دا **da**/جا **ca**. دایك **dayik** > دا **da** + یك **ik** (نیشانەی بچووککردنەوەیە بۆ خۆشەویستی). دا **da** وێنەیەکی دیکەی زا **za** یە کەلە زایین **zayîn** (مندالبوون **mindalbûn**، زارِۆ **za-řo** بوون) ەوە دێ.

(← داك **dak**، ← ماك **mak**).

**Defter** دەفتەر، لە **dipî** (نووسین) ەوە هاتووە کە دپیر **dpîr** بە پەهلەوی مانای نووسەر **nûser**/نڤیسکار **nivîskar**/بنووس **binûs** ە. هەر لەم وشەیەشەوە دەبستان **debistan** (قوتابخانە) وەرگیراوە. زاری فارسی وشەی دبیر **debîr** ی سازکردووە بۆ سکرتێر **skirtêr** و مامۆستای قوتابخانە نێوەندییەکان.

**Dehol’** دەهۆڵ، دەهۆڵ **dehol’** لە دەوێڵ **dewêl’** ەوە وەرگیراوە کە ئەویش لە زەویڵ **zewîl’** ەوە وەرگیراوە. دەوێڵ بە پارچە چەرمێکی باریك دەگوترێ، کە بۆ دروستکردنی دەهۆڵ بەکاردەبرێ.

**Del’emê** دەڵەمێ، بە شتێك دەبێژن (بەتایبەتی هێلکە) کە نێوەکوڵاو

بێ، یان پەنیرێك کە نە گوشرابێ، واتە: نە شل بێ و نە توند بێ. دەڵەمێ del’emê < دەڵ del’ + ـە e + مێ mê. دەڵ del’ تەڕایی دەرکەوتنە لە شتێك. (ئەو دیوارە، یان ئەو مەشکەیە دەیدەڵێنێ) واتە: ئاو دەردەچێ لێی. دەڵ del’/ لە زەل zel ەوە دێ، کە مانای تەڕ و شلە. دەگوترێ زەلان zelan واتە: خلیسکان بەهۆی تەڕی زەوییەوە. دەنگی ز z کۆنترە لە دەنگی د d. مێ mê لە مەیین meyîn ەوە دێ. مەیین meyîn توندبوونەوەی شلاییەکە واتە دەڵمێ del’emê شلاییەکە کە مەییبێ. دیارە لە زمانی کوردیدا دۆڵەمێ dol’emê و دەڵەمە del’eme ش هەیە هەر بەو مانایە. زەل zel بەو مانایەی سەرەوە کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە، سەرنجی ( زلَّ، زلق، زلاقة، زلوج/ لزوج... تزحلق...هتد) بدە.

**Demarekul’** دەمارەکوڵ، (⟵ دوپشك Dupishk).

**Deng** دەنگ، وێنەیەکی نوێی وشەی کۆنی کوردیی زەنگ zeng ە، کە دەنگی ز z بووە بە د d. دەنگ deng مانای هاتنە زمان و قسەکردنە. (سەرنجی وشەی زەنا zena واتە: دەنگ هەڵبڕین و هاوارکردن بدە). کورد دەبێژن: "کابرا دانیشتبوو، خەڵك هەموو قسەیاندەکرد، ئەو دەنگی نەکرد" واتە: نەهاتە زمان (⟵ زمان ziman و زوان ziwan یەك شتن) کەواتە: وشەی زەنگ zeng لە زوان ziwan ەوە هاتووە. سەرنجی وشەی Zunge ی ئەڵمانی و tongue ی ئینگلیزی بدەن کە بە مانای

# D د

زمان ziman دێن. هەروەها سەرنجی وشەی دوان dwan (قسەکردن qisekirdin) بدەن کە ئەوەش هەر لە زوان ziwan (زمان ziman) ەوە هاتووە.

**Derd** دەرد، لە پەهلەویدا دەرت dert ە و لە فارسیدا بە مانای ← ئێش êsh بەکاردێ. بەڵام لە کوردیدا بۆ نەخۆشی nexoshî بەکاردێ. هێندەك جار، دەرد و ئازار derd û azar (← Azar ئازار) پێکەوە بەکاردەبرێن، واتە: نەخۆشی و ئێش.

**Derfet** دەرفەت. لە دەرڤەز dervez/ دەروەز derwez ەوە هاتووە، بەمانای جێی دەربازبوون. وشەی دەروازە derwaze لەمەوە هاتووە.

**Dergush** دەرگوش/ گەرگوش gergush (← بێشکە bêshke). گەرگوش gergush بە پەهلەوی گەهڤارەك gehvarek ە، لە گەڕ geř (گەڕاندن geřandin، پێچپێدان pêchpêdan، سووڕاندن sûřandin و گوش gush کە لە گوشین gushîn ەوە دێ). گەرگوش gergush ئەو دەزگەیەیە کە زارۆ (منداڵ) تێیدا، دێتە سووڕاندن (راژەندن rajendin) و بە دەسترازە، تێیدا دەگوشرێ. دەرگوش dergush لە دار ـ گوش dar-gush ەوە هاتووە، ئەو دار (تەختە) یەی زارۆکی تێدا دەگوشرێ.

**Derjen** دەرژەن (← دەرزی derzî).

**Derwaze** دەروازە (← دەرفەت derfet).

**Derzen** دەرزەن، زۆر، یان دوانزە دانە لە شتێك. وشەیەکی ئەوروپاییە.

به ئینگلیزی: dozenth به فەرەنسی: douzaine و به ئەلمانی: Dutzend.

**Derzî** دەرزیی، لە بنەڕەتدا دەرژەن derjenە کە ئەم وشەیە لە کوردیدا هەیە و بۆ دەرزیی دروومان بەکاردەبرێ. دەر der مانای کون kunە. دەرژەن derjen واتە: کونکەر kunker، کونلێدەر kunlêder. (← Dirz درز).

**Derzû** دەرزوو/ derzî دەرزی. سەرنجی وشەی ئاڤێستایی derezu دەرەزو بدرێ کە مانای پڕکردنەوەی درزە..

**Desel’at** دەسەڵات (دەستەڵات destel’at). دەسەلات desel’at لە دەست dest و هەڵهات hel’hat ەوە هاتووە. واتە: دەست ـ هەڵ ـ هاتن بۆ کردنی کارێك. وشەی "تسلط" ی عەرەبی لە "دەسەڵات" ەوە هاتووە بەم شێوەیەی خوارەوە: دەسەلات > تەسەلەت > تەسەلت > تەسەلوت > تسلّط، دوایی وشەی "سلطة" داتاشراوە لێی.

**Desht** دەشت، بە پەهلەویش هەر deshtە.

**Dest** دەست، بە پەهلەوی: دەست destە، بەڵام لە ئاڤێستادا زەست zestە. کە دەنگی ز z لە دەنگی د d کۆنترە. بۆ وێنە زاوا/زاڤا zawa/zava ی کوردی لە گەڵ: داماد damad ی فارسی و، زانین zanîn و زانست zanist ی کوردی لەگەڵ دانش danish ی فارسی و دەریا derya ی فارسی لە گەل زەریا zerya ی کوردی بەراورد بکە.

**Destař** دەستاڕ، لە دەست dest + هاڕ hař ەوە هاتووە. واتە: بە دەست شت دەهاڕێ.

**Destemo** دەستەمۆ (← نامۆ **namo**).

**Destewa** دەستەوا، پارەیەکە کە بە دەستی بە قەرزبدرێ. لە: دەستە - واو **deste-waw** ەوە هاتووە. واو **waw** قەرز **qerz** ە و شێوەیەکی کۆنی کوردیی وام **wam** ە کە لە فارسیدا بۆ قەرز بەکاردەبرێ.

**Destûr** دەستوور (قانوون)، وشەیەکی کوردیی کۆنە کە بە پەهلەوی: دەستڤەر **dest-ver** ە. لە زمانی کوردیدا وشەی "دەستەبەر **desteber**" و "دەستەوەر **destewer**" هەن، کە هەردووکیان بە یەك مانان، کە بۆ "گرتنە ملخۆی کارێك" بەکاردێن. وشەی دەستوور **destûr**، وەك وشەیەکی بیانی، کەوتووتە زاری عەرەبییەوە و، فارسیش بەکاریدەبەن بەمانای "فەرمانپێدان". لەکاتێکدا کە وشەی "دەستەبەر **desteber**" و "دەستەوەر **destewer**" لە فارسیدا نین.

**Dewît** دەویت (بێخیرەت **bêxîret**، بێوورە **bêwire**) < دەو **dew** + یت **yît**، دەو **dew** راکردن و هەڵاتنە. دەویت **dewît** کەسێکە کە لە تەنگانەدا خۆی ناگرێ و رادەکا و هەڵدێ.

**Dêl'ebeba** دێڵەبەبا (← **Batu** باتو).

**Dêmografî(ya)** دێمۆگرافی(یا) ی δημογραφικός یۆنانییە.

**Dêwane** دێوانە (← دین **dîn**).

**Dêwcame** دێوجامە (← **camane** جامانە).

**Dij** دژ، وێنەیەکی دیکەی دوش **dush**ە، کە دوش **dush** بە پەهلەوی مانای بەد **bed** و خراپ **xirap** دەگەیەنێ. دژ لە کوردیی ئەورۆدا نیشانەی بەرامبەر **beramber** و

پێچەوانە pêchewane
دەگەیەنێ. و لە ئاڤێستاییشدا
هەر دژ dij ە.

**Dij** دژ بە مانای ← قەڵا qel'a، لە
ئاڤێستاییدا deize دەیزە یە
(سەرنجی وشەی قەڵادزێ
qel'adizê بدە بە مانای قەڵای
قەڵایان).

**Dijnêw** دژنێو (← Dijwên دژوێن).

**Dijwar** دژوار (← Dish دش).

**Dijwên** دژوێن، دژنێو dijnêw ←
جنێو cinêw ← جوێن cwên،
واتە: پێچەوانەی نێو (ناو)،
واتە: قسەی خراپ.

**Dihok** دهۆك. لە: دە de/ دێ dê
(گوند gund) + ـوك –ok
(نیشانەی گچکەکردنەوە). واتە:
گوندێکی گچکە gundêkî
gichke/ دێی گچکە dêy
gichke.

**Diraw/v** دراو/ڤ (پارە pare) لە
دراخمێ draxmê (δραχμή)
ی یۆنانییەوە هاتووە و، لە
فارسی و عەرەبیدا بووە بە
درهم. کورد دەبێژن: "بە زێڕ و
دراوم سەندی".

**Dirawsê** دراوسێ (هاوسێ hawsê)
دراوسێ dirawsê > در dir +
ئاو aw > هاو haw + سێ sê.
سێ sê مانای سێبەر sêber ە.
دەرهاوسێبەر derhawsêber
کە دەر (دەرگە derge) کەیان
هاوسێبەری یەکن. وشەی سێ sê
لە سایە saye ەوە هاتووە کە بە
مانای سێبەر و پەنا pena دێ و
لە پەهلەویدا: سایەك sayek ە.
بە گۆڕینی دەنگی ئا (a) بۆ ێ
(ê)، سایە saye بووە بە سێ sê.

**Direw** درەو (← Diro درۆ).

**Dirêj** درێژ، بە ئاڤێستایی دراجە
dirace و بە پەهلەوی دراج
dirac ە و لە فارسیدا بووە بە
دراز deraz.

**Dirinc** درنج (← درۆ diro).

**Diřkezî** دڕکەزی (← گەسك **gesk**).

**Diro** دڕۆ/ درەو **direw**/دەرەو **derew**. درۆ **diro**، واتە: قسەی ناڕاست کە بە هۆشیاری بکرێ. درۆ **diro** لە ئاڤێستاییدا درەوگە **direwge** و درووج **dirûc** ە و لە پەهلەویدا درۆگ **drog** ە و لە فارسیدا بووە بە دروغ **drûxh**. واتە: بزوێنی (ە) ی پەهلەوی لە کوردیدا ماوە و لە فارسیدا نەماوە و، بووە بە بزوێنێ درێژ: وو **û**. وشەی درنج **dirinc** یش هەر درووج **dirûc** ی ئاڤێستاییە. لە زمانی کوردیدا وشەی درنج **dirinc** لە گەڵ دێو **dêw** بەکاردەبرێ، دەگوترێ: دێو و درنج **dêw û dirinc**.

**Dirz** درز، لە وشەی ئاڤێستایی **dirize** یان **dereza** ەوە هاتووە کە مانای پڕکردنەوەی کەلێنێك، یان برینداریيەکی باریك لە شتێکدا، واتە: (← قلیش **qilîsh**) ێك. لە ئەڵمانیدا وشەی **Druse** هەیە کە بە کۆمەڵە بەردێکی هێلکەیی نێوبۆش، واتە: درزدار، دەگوترێ. وشەی **dirz** لە گەڵ ← دەرزی **derzî** هاوڕەگن و بە شێوەی تەرزی **terzî** بۆ بەرگدروو **bergdirû** کەوتووەتە زاری ترکییەوە. دەرزی **derzî** نێویێکی دیکەی هەیە لە کوردیدا کە ئەوەش ← دەرژەن **derjen** ە، کە لە درز ژەن **dirz jen** ەوە هاتووە، واتە: درز لێدەدا **dirzlêdeda**.

**Dish** دش (خوشکی مێرد ـ بۆژن و خوشکی ژن ـ بۆ مێرد). دش **dish** لە کوردیدا، بە مانای خراپ **xirap** و بەد **bed** و گەمار **gemar** دێ. لە کوردیی ئەردەڵاندا "دشە **dishe**" بە

ماناى خراپ xirap و گەمار gemar دێ. دش dish، وێنەیەكى دیكەى وشەى دژ dij ە،كە بە ماناى بەرامبەر beramber و پێچەوانە pêchewane و نەیار neyar دێ و، لە پەهلەویدا دژ dij دوش dush ە. سەرنجى وشەى ← دژوێن dijwên (← جوێن cwên) و دژوار dijwar (گران giran، ← تیژ tîj سەختیدار sextîdar ← سەخت sext) بدە.

**Diyan** دیان، لە زمانى كوردیدا بە لایەنگرانى ئاینى عیسا دەگوترێ. عیسایى Îsayî بە زمانى ئەلمانى christ ە و بە ئینگلیزى christian ە (كە هێندەك كردوویانە بە خرستیان xristyan). وشەى "كرستیان krstyan" لە كوردیدا تیان tyan ە كەى وەرگیراوە و كراوە بە دیان dyan.

**Dîcle** دیجلە (رۆبارى دیجلە) لە تیگلە tîgle و تیگرە tîgre وە هاتووە. بە یۆنانى Τίγρης و بە ئەلمانى Tigris كە Tig وێنەیەكى دیكەى تیژ tîj ە (وەك tîx تیخ). Rîs ریس لە رێژ rêj ەوە هاتووە. واتە: تیژرێژ tîjrêj لە (خێرارێژ xêra ro) وە هاتووە.

**Dîlmace** دیلماجە (← Terceman تەرجەمان).

**Dîmen** دیمەن (چاوهەنداز، منظرة) > دى dî + مەن men. dî لە دیتن dîtin (بینین bînîn) ەوە هاتووە. مەن men > مان man. مان man (شوێن shwên، جێ cê) واتە: ئەو شوێنەى كە دێتە دیتن، سەرنجى وشەى دارەمان dareman بدە (ئەو شوێنەى دارى لێیە

هەروەها وشەی نیشتمان nîshtiman شوێنی لێدانیشتن، لە عەرەبیدا بووە بە "دِمَنْ" هۆنراوە: أربعٌ بالأمسِ کانتْ دِمَناً) بدە. (← man مان).

**Dîn** دین، وشەیەکی زۆر کۆنە، لە ئاڤێستادا بە شێوەی دائێنە daêne/ دەئێنا deêna و لە پەهلەویدا بە شێوەی دین dîn هەیە. هەروەها لە زمانە سامییە کۆنەکانیشدا هەیە. بۆ وێنە: لە زمانی ئەکەدیدا بە شێوەی دینوو dinû و دێنوو dênû هەیە کە بە مانای ویژدان، ← قانوون و ماف و دادپەروەری دێ. لە زمانی عەرەبیدا لە جیاتی ئاین ayin بەکاردێ. دین dîn لە قورئاندا بە مانای رۆژی دادپەروەری (رۆژی پەسلان ـ قیامەت) (مالكِ یومِ الدینِ) واتە: "خاوەنی رۆژی دادگەیی و لێپرسینەوە"یە. وشەکە بەم مانایە، وشەیەکی عەرەبی نییە، بەلکو کوردییەکی کۆنە و لە وشەی دیوان dîwan ەوە هاتووە. کوردی کۆن ئەم وشەیە (دیوان) یان بۆ ئەو فەرمانگەیە بەکارهێناوە، کە خەڵك روویان تێکردووە بۆ راییکردنی کاروباری خۆیان. وشەکە بە شێوەی دێوان dêwan بووە و لە کوردیی کۆن dîpî pane ەوە هاتووە کە شوێنی دەفتەرداری defterdarî (نووسینگەی میری nûsîngey mîrî) لە وێ بووە. وشەی دەفتەر defter لە دیپیر dîpîr ەوە هاتووە، بە گۆرینی دەنگی پ p بو ف f. فارسەکان لە سەتەی رابوردوودا وشەی دبیر debîr واتە: سکرتێریان بۆ مامۆستای قۆتابخانە نێوەندییەکان بەکارهێناوە، کە

لە وشەی دیپیر dîpîr وەریانگرتووە. وشەی دیوەخان dîwexan یش کە شوێنی مێوانانە، هەر لەم وشەیەوە هاتووە، کە دیوان dîw ی خانی/ خانوو xanî/û دەگەیەنێ.

**Dîn** دین، بە مانای شێت shêt لە کوردیی باکوردا بەکاردێ. ئەم وشەیە لە وشەی دێوانە dêwane واتە: شێتۆکەوە هاتووە، واتە: وەك دێو wek dêw.

**Dînar** دینار، لە وشەی لاتینی denarius ەوە دێ، کە بە یۆنانی دیناریۆ δηνάριο یە.

**Dîrek** دیرەك/ دیرەگ dîreg (کۆڵەکە kol’eke). وشەی دیرەك dîrek لە دارەك dar-ek ەوە هاتووە. بابا تایەری هەمەدانی ئەم وشەیەی بەکارهێناوە لە هونراوەکانیدا. وشەکە لە سلێمانی وەك دیرەك dîrek و لە گەرمیان وەك دیرەگ dîreg بەکاردێ. دەنگی ك k وەك گ g لە شێوەزاری کوردیی ناڤین و کوردیی ژێرین دا، لە جێیەك بەکاردەبرێن. (سەرنجی: باوك bawk و باوگ bawig بدە).

**Dîshleme** دیشلەمە/ دیشلامە dîshlame (چایی خواردنەوە، بەوەی کلۆیەك شەکر بخرێتە دەمەوە). دیش dîsh وێنەیەکی دیکەی دۆش dosh ە (← دۆشاو doshaw/دیشاڤ dîshav) دیشلەمە dîshleme < دیش (ئاڤ) (av) dîsh لە دەمە le deme < دیشلەمە dîshleme لە (دیش + لەمە) ی ترکییەوە نەهاتوە. شتێکی رێکەوتە کە ددان didan/دران diran بە ترکی دیش dîsh ە و، وا دادەنێن کە کلۆ شەکرە کە

به ددان دەگیرێ و چایەکە دەکرێ بە سەریدا. کارەکە پێوەندیی راستەوخۆی بە شرینییەکەوە هەیە، کە دیشاڤ dîshav ە، نەك راستەوخۆ بە ددانەوە.

**Dîtin** دیتن، واتە: بینین bînîn. لە پەهلەویدا (دیتەن dîten ە و لە فارسیدا بووە بە دیدن).

**Dîwan** دیوان (← Dîn دین).

**Dîwexan** دیوەخان (← Dîn دین).

**Doje** دۆژە (← جەهەنەم cehenem). و دۆژەخ dojex کە لە فارسیدا بووە بە دوزخ dûzex. دۆژە doje لە دۆزە doze ەوە وەرگێراوە کە لە بنەرەتدا ← دۆز doz ە و، ← دۆز doz یش لە داخوازەوە وەرگیراوە. وشەی دۆز doz لە کوردیدا بە مانای مەسەلە mesele، کێشە kêshe و بە مانای تۆڵە tole (انتقام) یش دێ. لە زمانی کوردیدا وشەی دۆساخ dosax (دۆز doz + ← ئاخ ax) و دۆساخ خاز dosax xaz هەیە بۆ زیندان zîndan و گرتووخانە girtûxane و شوێنی تۆڵەسەندن shwênî tol’esendin، کە دیارە لێرەدا دەنگی س s و ز z جێیییەکان گرتووە. ← ئاخ ـ ax لێرەدا مانای زەوی و شوێنە.

**Dol’ab** دۆڵاب، لە: دوو لەپ dû-lep ەوە هاتووە. لەپ lep لە کوردیدا بە مانای "دوو پارچە dû parche و دوو بەش dû besh" بەکاردێ. لا la لە لەپ lep ەوە هاتووە. دۆڵاب dolab لە عەرەبیدا بووە دولاب.

**Doshaw** دۆشاو/ دیشاڤ dîshav > دۆش dosh + ئاو aw، ئاو aw لێرەدا بە مانای شلاییە. دۆش

**dosh** وێنەیەکی دیکەی دۆخ dox ە کە لە کوردیدا بە مانای "توندوتێژ tundutêj" دێ. هەروەها: مانای تراو tiraw (مائع) واتە: شلاییەك كە كەمێك توندبووبێتەوە. لە كوردیدا دەگوترێ "دۆشاوی تەماتە doshawî temate" واتە: ئاوی تەماتە پاش ئەوەی كەمێك توندبووبێتەوە. كەواتە: دۆشاو doshaw/ دۆخاو doxaw ە، واتە: شلاییەکی توندەوەبوو. وشەی تۆخ tox (واتە: رەنگی تێر rengî têr و توند tund) بنەرەتی وشەی دۆخ dox ە.

**Dost** دۆست، لە پەهلەویشدا هەر دۆست dost ە. لە فارسیدا بووە بە دوست dûst.

**Doxên** دۆخێن/ /بەندەخوێن /bendexwên ← هۆجەنە hocene. دۆخێن doxên > دۆخ dox + ێن ên، دۆخ dox مانای بار bar و چۆنییێتی chonêtî ی شتێکە. دۆخێن بۆ ئەوەیە کە بار و چۆنێتی شتێك دیاریبکا. واتە: شوێنێك كە پێشاننادرێ بە خەلك، بخاتە دۆخیکی تایبەتییەوە و "بیدۆخێنێ bîdoxenê". بەندەخوێن bendexwên یش لە "بەن ben" ی دۆخاندن doxandin ەوە هاتووە. وشەکە پێوەندیی بە خوێن xwên ەوە نییە.

**Doz** دۆز، وشەیەکی کوردییە لە شێوەی کوردیی باکووردا بەکاردەبرێ، مانای "مەسەلە mesele" و کێشە kêshe و تۆڵە tol'e" یە. وشەی دۆز doz لە داخواز daxwaz ەوە هاتووە، بەم شێوەیە: داخواز daxwaz

< دۆخۆز doxoz < دۆز doz. یەکێك لە تایبەتکارەکانی کوردیی باکوور ئەوەیە بزوێنی درێژی ئا a پاش هێندەك دەنگ وەك د d و ڤ v گێڕدەکرێتەوە. بۆ وێنە: بە قادر qadir دەگوترێ قۆدر qodir بە بەقال beqal دەگوترێ بەقۆل beqol.

**Drêl** درێل. مەکینەی شت کونکردن. بە ئینگلیزی **drill** و بە ئەلمانی **Drell** ە.

**Dujmin** دوژمن < دوژ **duj** + من **min**. دوژ **duj** مانای ڤاژی **vaji**، پێچەوانە **pêchewane**. من **min** لە منیك **minîk** ەوە هاتووە کە مانای بیرلێکردنەوە **bîrlêkirdinewe** یە. دوژمن **dujmin** واتە: پێچەوانە بیرلێکردنەوە، واتە: خراپبیرکردنەوەی کەسێك بەرامبەر کەسێکی دی. وشەی منیك **minîk** پێوەندییەکی ڕەگیی هەیە بە **to mean** ی ئینگلیزی و **meinen** ی ئەڵمانی یەوە. دوژمن **dujmin** بە پەهلەوی دوشمەن **dushmen** ە و بە فارسی دوشمان **doshman** ە.

**Duktor** دوکتۆر، وشەیەکی لاتینیە **doctor** مانای فێرکەر **fêrker** ە، وشەی لاتینی **docere** مانای فێرکردن **fêrkirdin** ە کە وشەی فێرکەر **dozent, docent** لەمەوە هاتووە. بەڵام لە کوردەواریدا بە زۆری بۆ ← بژیشك **bijîshk** (طبیب) بەکاردێ.

**Dup** دوپ (← دوپشك **dupishk**).

**Dupishk** دو/پشك (کلاش دوم **kilash dum**). وشەیەکی دیکەش هەیە، بۆ دوپشك،

# D د

ئەوەش زوشك zushk ە. دوپ dup و زوپ zup هەردووكیان وێنەی كۆنی دوڤ duv واتە: ← كلك kilk ن، دوپشك dupishk واتە: جانەوەرێك كە كلكێكی پێوەیە. هەر لە كوردیدا وشەیەكی دیكەش هەیە بۆ دوپشك dupishk ئەوەش دەمارە كوڵ demare kul’ ە. ← كلاش دوم kil’ashdum یش هەر دوپشك dupishk ە. دوم dum لێرەدا، وێنەیەكی دیكەی دوڤ duvە كە دووگ dûg یش هەر وێنەیەكی دیكەی دوڤ duv، واتە: كلك kilk ە. دەنگی ز z و د d لە زمانی كوردیدا جێیی یەكدەگرنەوە، بەڵام ز z لە د d كۆنترە. سەرنجی وشەی زەریا zerya (زێ z ê بە مانای رۆبار (robar و دەریا derya، هەروەها زرت zirt و دل dil، زاو/ڤا zaw/va و داماد (لە فارسیدا) بدە. دوپشك < دوڤ duv (كلك kilk) + شك shk (چك chik = پچووك pichûk). واتە: جانەوەرێك كە كلكێكی پچووك (كوڵ kul’)ی پێوەیە واتە: دەمارە (دەم/ دوم ـ دار dem/dum ـ dar)ە كوڵ demare kul’ ە.

Duv دوڤ (← دوپشك dupishk).

Dûg دووگ (← دوپشك dupishk).

Dûkel’ دووكەڵ، كورد دەبێژن: ئاگر و دوو agir û dû واتە: ئاگر و دووكەڵ. دوو dû دووكەڵ dukel’ ە و، بە پەهلەوی دووت dût ە. كەڵ kel’، كەل kel ە كە بە مانای بەرزایی دێ، واتە: دوویەك كە لە ئاگرێك هەستێ و بەرزبێتەوە. دەگوترێ: دوكەڵی لێهەلدەستێ. وشەی "دُخان" ی

عەرەبی لەمەوە هاتووە. وشەی
تووتن tûtin لە دوودن dûdin
(واتە دووکەڵکەر) ەوە هاتووە.

**Dûst** دووست، بە شێوەزاری کوردیی دەوروبەری ئورفە Urfe بە شوێنی تەختانی دەگوترێ دووست dûst کە وێنەیەکی دیکەی دەشت desht ە. دووست dûst بە گۆڕینی دەنگی ست st بە ز z بووە بە دووز dûz و چووەتە زاری تركییەوە بە مانای رێك، ریکوراست. وەك چۆن چەپڕاست chepřast ی کوردی، بە وێنەی چەپراز çepraz چووەتە زاری تركییەوە، بە گۆڕینی دەنگی ست st بۆ ز z.

**Dwêt** دوێت، بە کچ kich دەگوترێ لە کاتێکدا کە بگوترێ کچی فیسارەکەسە. دوێت dwêt وشەیەکی کۆنی هێندۆئەوروپاییە، لە پەهلەویدا دوخت duxt ە و بە ئینگلیزی دوتەر daughter ە و بە ئەڵمانی توختەر Tochter ە. لە فارسیدا بووە بە دختر (دۆختەر) doxter.

# E ئە

Efendî ئەفەندی، وشەیەکی یۆنانییە کەوتووەتە کوردی و ترکی و هێندەك شێوەزاری عەرەبییەوە. بە یۆنانی: ئەفەنتیس Efentis (αφέντης).

Ejno ئەژنۆ/ ژنۆ jino بە ئاڤێستایی زانوو zanû، پەهلەوی: زانووك zanûk و ژنوو jnû، بە فەرەنسی jenon و بە ئەڵمانی Knie و لە فارسیدا بووە بە زانو zanû.

Ekzoz ئەکزوز، بە دووکەلکێشی ئۆتۆموبێل دەگوترێ. لە وشەی exhaust ی ئینگلیزییە وە هاتووە کە بە مانای پاککردنەوەیە، لێرەدا مەبەست لە پاککردنەوەیە لە ← دووکەڵ dûkel’ و ← گاز gaz.

El’mas ئەڵماس، لە وشەی یۆنانیی ασημής ەوە هاتووە.

Elwend ئەلوەند (رۆباری ئەلوەند)، بە سانسکریت: ئاور ڤەنت awrvent ە و بە پەهلەوی ervend، واتە: خێرا و بە گوڕ.

Elmode ئەلمۆدە، بە ژنێك دەگوترێ کە جل و بەرگی ئەوروپایی، بە تایبەتی کراسی کورتی لە بەردابێ. وشەکە لە وشەی فەرەنسی a la mode واتە "بە پێی مۆدە" وە هاتووە.

Erdel’an ئەردەڵان، پێدەچی ئەردەڵان erdel’an لە ئار ar + داڵ dal’ + ان an ەوە هاتبێ. ئار ar ئاگر agir، داڵ dal’ جێ و شوێن cê û shwen ە. واتە: جێی ئاگر cěy agir.

Erz ئەرز، یان erd و هێندەك جاریش "عەرد erd". لە زمانی کوردیدا بە مانای " ← ئاخ ax ← خاك xak و ← زەوی zew/vî

و خڕەی زەوی "xiřey zew/vî" یش بەکاردێ. وشەکە لە بنەڕەتدا عیبرییە، کە لە تەوراتدا بە شێوەی هائارێتز הָאָרֶץ هاتووە. ئەم وشەیە کەوتووەتە زمانە ئەوروپاییەکانەوە. بۆ وێنە: لە ئینگلیزیدا بووە بە earth و لە ئەڵمانیدا Erde. هەروەها لە زاری عەرەبیدا بە شێوەی "ألارض" هاتووە.

Eshkêl' ئەشکێڵ. لە ast-kêl ئاست ـ کێل، واتە: ئاستی تەنیشت astî tenîsht (← kêl کێل). بە عەرەبی "قطر"ە.

Eskemil(î) ئەسکەمل (ی). کورسی یەککەسی. لە وشەی رووسی скэме́йка وە هاتووە.

Esker ئەسکەر. شێوەیەکی دیکەیە بۆ وشەی Leshker /Leshkir لەشکر/ لەشکەر. لەشکەر leshker بووە بە ئەشکەر eshker و ئەوجا ئەسکەر esker و لە عەرەبیدا بووە بە عسکر.

Espswar ئەسپسوار، لە سەردەمی ساسانییەکاندا، ئەوانەی سواری ئەسپ دەبوون پێیاندەگوتن ئەسڤاران esvaran، کە ئەمە لە ئەسپ سڤاران esp svaran ەوە هاتووە. وشەی عەرەبی "اسوار" (گەل: أساورة) و سفر (گەل: أسفار) یش هەر لەمەوە هاتووە (← سەفەر sefer).

Estê ئەستێ، جورە بەردێکە کاتێك لە پارچە هاسنێك دەدرێ، یان لێیدەخرێ، پزیسکی ئاگر دەردەچێ لێی. لە ئاڤێستادا دوو وشە هەیە ئەسمەن esmen و ئەسەن esen کە بە مانای بەرد و سەنگ دێن. دیارە وشەی هەسان hesan، کە ئەویش جۆرە بەردێکە بۆ تیژکردنەوەی

← کێرد kêrd و ← چەقۆ cheqo بەکاردەبرێ، پێوەندیی بەم وشەیەوە هەیە.

Estêrk ئەستێرک/ ئەستێڵك estêl'k/ ستێرك stêrk شوێنێکە ئاوی تێدا گیردرابێ و بۆ مەلەکردن بەکاربێ. واتە: بەنداوێکی بچووك. ئەم وشەیە لە رێی فارسییەوە بووە بە استخر و بە شێوەی اصطخر چووەتە زاری عەرەبییەوە.

Estran ئەستران، وشەیەکی دیکەیە لە کوردیدا بۆ ← ستران stran (← گۆرانی goranî) کە پێوەندیی بنەرەتیی هەیە بە وشەی لاتینی historie ەوە کە بۆ مێژوو، یان ← چیرۆك chîrok بەکاردەبرێ. لە ئاڤێستاییدا وشەی تاورونا tawruna هەیە بۆ ئەمە، کە لە فارسیدا بووە بە ترانە.

Estûr ئەستوور (هەستوور hestûr و ستوور stûr و ستر stir) بە شتێك دەبێژن کە تەنك و زراڤ وباریك نەبێ. لە پەهلەویدا وشەی ئەستۆبار estobar و هۆستوبار hostubar هەیە، هەر بە مانای ئەستوور. لە کوردیدا هەستوو hestû و هەستی hestî و ئێسك êsk و هێسك hêsk هەن، بە مانای ئێسقان êsqan. بار bar وەك وار war پاشکۆیەکە هەبوونی شتێك، یان تایبەتکارێك پێشاندەدا، وەك دەبێژیت: خوێندەوار xwêndewar (کەسێك کە خوێندنی هەیە)، بەندیوار bendîwar (کەسێك کە بە یەکێکەوە، یان بە شتێکەوە بەندە)، شوێنەوار shwênewar (شتێك کە شوێنی هەیە) (← هەوار hewar).

کەواتە: ئەستوور estûr لە بنەرەتدا بۆ شتێك بەکارهێنراوە کە وەك هەستوو hestû (ئێسقان êsqan) بووبێ، رەك و پتەو بووبێ و زوو نەشکابێ، واتە: هەستوو ـ وار hestû-war بووبێ. ئەم وشەیە لە فارسیدا بووە بە استوار ostuvar. لە ئەڵمانیدا وشەی stur هەیە بۆ کەسێك کە رەق و تەق بێ ونەرمبوو نەبێ، کە بەرامبەر وشەی کوردی: سور siwir و وشەی ئینگلیزی stubborn ە. ئەستوور estûr لە فارسیدا شێوەی قطور qotûr ی وەگرتووە کە ئەم "قطور" ە لە کۆتەرە kotere ە دارەوە سەری هەڵداوە و لە عەرەبیدا وشەی قطر ← Eshkêl ئەشکێڵ لەم وشە کوردییەوە وەرگیراوە بە گۆڕینی دەنگی ك k بە ق q. کە کۆتەرە kotere جاروبار لە کوردیدا بۆ ئەستووریی مل، گێپەڕەی مل gêpeřey mil بەکاردەبرێ.

**Etles** ئەتلەس. وشەیەکی یۆنانییە άτλαντας، لە بنەڕەتدا نێوی دێوێکی ئەفسانەیی بووە. وشەکە کەوتووەتە گەلێك زمانی ئەورووپایی و رۆژهەڵاتییەوە. لە عەرەبی و فارسیدا بە شێوەی أطلس دەنووسرێ و، هەروەك کوردی بۆ پەرتۆکێك بەکاردەبرێ کە نەخشەی ولاتانی تێدابێ.

**Etresh** ئەترەش (← تاس Tas/ تاسبردنەوە Tasbirdinewe).

**Ez** ئەز، پرۆنێوی تاك لە دۆخی بکەریدا (ألحالة الفاعلية) کە زۆر کەڤنارە. بەرامبەر بە ئەد ed ی فارسیی کۆن (سەرنجی: ئەدەم دارەیوش ـ ئەزم داریۆش) بدە، کە وێنەیەکی دیکەی ئەز ez ی

## E ئه

کوردییه. ئەز ez خزماتییەکی زمانەوانی لەگەڵ ich ی ئەڵمانیدا هەیە کە ich یش لە دۆخی بکەرییدا nominal causus بەکاردەبرێ.

**Élewî** عەلەوی، ئاینێکی ← سینکرێتیستی **sînkrêtîstî** کوردییە، کە بە هەڵە بە لایەنگرانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەدرێنە قەلەم. راستییەکەی وشەکە ئارەوی **ar-e-wi** یە، کە **ar** ئار، ← ئاگر **agir** ە و بنچینەی دەگەڕێتەوە بۆ میترایزم (کولتووری خۆر **xor**).

**Émbar** عەمبار/عەمار **/émar** هەمبار **/hembar** هەمار **hemar** بۆ شوێنی شتومەك تێدا هەڵگرتن بەکاردێ، کە لە عەرەبیدا بۆ ئەمە "مخزن" بەکاردێ کە لە ← خەزێنە **xezêne** وە وەرگیراوە. هەمبار **hembar** لە پەهلەویدا هەنبار **henbar** ە و لە فارسیدا بووە بە: أنبار **enbar**.

**Émbe** عەمبە، جۆرە گیایەکی ترشە، ترشیاتی زەرد دروستدەکرێ لێی. وشەکە هیندییە ئەنب **enb** یان ئام **am** ە.

**Éqar** عەقار/ئەقار **eqar**، وشەیەکی زۆر کۆنی هێندۆئەورووپاییە بە مانای پارچە زەوی دێ کە بۆ خانوو دروستکردن بەکاردێ. لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی **Aker** (ئاکەر) هەیە بۆ نێونانی زەوییەك کە بە گاسن کێڵکرابێ و بۆ تۆو چاندن ئامادەکرابێ، کە لە زمانی ئەلمانیی کۆندا ئاکار **Ackar** ە. وشەی ئاك **ak** ی ئەڵمانی و ← ئاخ **ax** ی کوردیی هەردووکیان بە مانای زەوی **zewî/vî** دێن، وشەی "عقار" ی عەرەبی لە ئاکارە **akar** وەرگیراوە کە لە بنەڕەتدا ئاخ ـ کار **ax-kar**ە واتە:

زەوییەك كە كاركراوە، یان، دەكرێ لەسەری.

**Érd** عەرد (← **Erz** ئەرز).

**Éter** عەتەر/ **Étr** عەتر، لە زمانی عەرەبیدا بووە بە عطر. لە **odeur** ی فەرەنسییەوە هاتووە كە مانای بۆن **bon** ە.

**Éynek** عەینەك، دەنگی "ع" لە زمانی كوردیدا نەبووە، بەڵام لە رێی فێربوونی زمانی عەرەبی و وەرگرتنی هێندەك وشەی عەرەبی كە ئەم دەنگەیان تێدایە وەك: "عەرەب **Éreb**"، "عەیب **éyb**" یان، لە تەنگكردنەوەی دەنگی بزوێنی درێژ پەیدا بووە. وەك وشەی كانی **kanî** كراوە بە كەعنی **ke'nî** و تاڵ **tal'** كراوە بە تەعل **te'l** و ئاسمان **asman** كراوە بە عەسمان **ésman**، لە هێندەك شێوەزاردا. "عەینەك" **Éynek** وشەیەكە لەم بابەتە.

عەینەك **Éynek** لە بنەڕتدا ئاووێنەك **awwênek** (← ئاوێنە **awêne**) بووە و بووە بە عەوێنەك **Éwênek** و ئەوجا بە عەینەك **Éynek**، ـەك **ek** پاشۆیەكە بۆ بچووكردنەوە. وشەی عەینەك **Éynek** لە گەڵ "عوینە" ی عەرەبی (گەل: عوینات) بنەڕتیان یەك نییە. "عوینە" ی عەرەبی بەڕێكەوت وشەی "چاویلكە **chawîlke**/ بەرچاڤك **berchavk**" ی كوردی دەگرێتەوە.

# Ê ئێ

**Ême (w) manan** ئێمه (و) مانان > ئێمه **ême** + مان **man** + ئان **an**. مان **man** کورتکراوەی مینا **mîna** (وەك **wek**، وەکو **weku**، وەکی **wekî**) + ئان **an** (نیشانەی گەل). ئێمه و مانان، واتە: ئێمه و، ئەوانەی وەکی ئێمەن.

**Ênsîklopîdya** ئێنسیکلۆپیدیا. یۆنانییە: **εγκνκλοπαίδεία**.

**Êran** ئێران، لە وشەی ئێرانیی کۆن: "بووم ـ ی ـ ئاریان ـ ام" **bûm-î-aryan-am** ەوە هاتووە، واتە: زەوی ئارییەکان. (← ئاریا **arya**). وشەی بووم **bûm** هەتا ئەورۆش لە زمانی کوردییدا بۆ زەوی **zewî** بەکاردەبرێ. سەرنجی وشەی بوومەلەرزە **bûm-elerze** بدە، کە مانای زەوی لەرزە **zewî-lerze** یە.

**Êsh** ئێش، مانای ئازار و زەحمەتکێشانە بەدەست شتێکەوە، لە بنەڕەتدا لە کێش **kêsh** ەوە هاتووە. ئەم وشەیە لە ئینگلیزیدا بەشێوەی ئێیك **ache** هەیە. ئێش **êsh**، بە شێوەی ئیش **îsh** چووەتە زاری ترکییەوە و بۆ کار **kar** بەکاردەبرێ، چۆنکە کارکردن، مانای زەحمەتکێشان و ئێش لە خۆ گرتنە.

**Êshk** ئێشك/ **Kêshk** کێشك. ئێشك **êshk** کورتکراوەی کێشك **kêshk** ە واتە: مانەوە بۆ پارێزگاریی کەسێك یان شتێك، بەتایبەتی بەشەو. وشەکە پێوەندیی هەیە بە کێش **kêsh** و کێشکردن **kêshkirdin**، بار و قورسایی هەڵگرتنی شتێك. وشەی ئێش **êsh** و ئیش **îsh**

یش هەر لەمەوە هاتووە. (← ئێش **êsh**، ← ئیش **îsh**).

**Êsqan** ئێسقان/ هێسک **Hêsk**.
ئێسقان **êsqan** < ئێسق **êsq** + ـان **an** < ئێسک **êsk** + ـان **an** < هێسک **hêsk** + ـان **an**. ـان **an** کورتکراوەی دان **dan** ە کە مانای جێ **cê**/ شوێن **shwên** ە. ئێسقان **êsqan** واتە: شوێنی هێسک.

**Êtîmolojya** ئێتیمۆلۆژیا، بنەچە و رەچڵەکی وشەی زمان. لە **ετνμολογία** ی یۆنانییەوە هاتووە، کە لە لاتینیدا **etymologia** یە و، لە ئینگلیزیدا بووە بە **etymology** .

**Êwet** ئێوەت/ حێوەت **ĥêwet**. سەرپەرشتی **serperishtî**، بەخێوکردن **bexêwkirdin**، خاوەنداری **xawendarî**. بڕگەی یەکەمی وشەکە ئێو **êw**، یان حێو **ĥêw** ە، کە خێو **xêw** ە واتە: بەخێوکردن و سەرپەرشتیکردن و پەروەردەکردن **perwerdekirdin** ە.

**Êzidî** ئێزدی. بە لایەنگرانی کێشی تاوسێ مەلەک **Tawisê melek** دەگوترێ کە ئەم ئاینە ئاینێکی کوردیی سینکرێتیستیە. هەر لەسەردەمی کۆنەوە، بەتایبەتی لەسەردەمی عوسمانییەکانیەوە ترک و عەرەب و فارسە موسلمانە تەنگەتیلکەکان هەوڵیان داوە بەدرۆ و بوختان، ئێزدییەکان، لەلایەکەوە بەلایەنگرانی یەزیدی کوڕی معاویە و، لە لایەکی دیکەوە بە شەیتان (← **Sheytan**) پەرست بدەنە قەلەم. جارێ وشەکە یەزیدی **yezîdî** نییە، بەلکو ئێزدی **Êzdî** یە، پاشان ئێزدییەکان ناتوانن لایەنگری یەزید بن، چۆنکە یەزید موسلمان بووە و ئێزدییەکان

## Ê ئێ

موسلمان نین. دوای ئەمەش وشەی ← Sheytan شەیتان ی عەرەبی کە "شیطان" ە لەگەل شاتەن Shaten ی کوردی تێکەلکراوە. ئەگەنا ئێزدییەکان خواپەرستن و، وشەی ← Tawis تاوسیش، پێوەندیی بە مەلی (← مەل mel) تاوسەوە (← تاوس Tawis) نییە، بەلکو پێوەندیی بە گیانی ئێزدانییەوە هەیە.

# F ف

**Fanîle** فانیلە (ژێرکراس **jêrkiras**)، فانیلە **fanîle** لە **flanelle** ی فەرەنسییەوە هاتووە و بووە بە فانیلە **fanîle**، لە ئەڵمانیدا بە شێوەی **Flanell** و لە یۆنانیدا "فانیلە φανέλα" دەنووسرێ.

**Fanos** فانۆس/ فانۆز **fanoz** چرایەکی تایبەتییە. لە **phanos** (φανός) ی یۆنانییەوە هاتووە، کەوتووەتە عەرەبی و فارسییەوە بە شێوەی فانوُس.

**Ferengî** فەرەنگی. کوردی کۆن بە خەلکی ئەورووپایان گوتووە: فەرەنگی و بە ئەورووپاش فەرەنگستان **ferengistan**. وادیارە ئەم وشەیە لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبیدا پەیدابووە، کاتێك کورد ئەورووپاییان لە ڕێی فرانکەکانەوە **Franken** ناسکرد.

**Ferheng** فەرهەنگ، بە مانای وشەنامە **wishename** (⟵ قاموس **qamûs**) و کولتوور **kultûr** یش بەکاردەبرێ. لە فارسیدا هەر فرهنگ **ferheng**ە. بەڵام لە پەهلەویدا فرههنگ **freheng**ە. فره **fre** لە کوردیدا بە مانای زۆر و جۆر جۆر دێ (ئەو زەوییە فرە بەشە، واتە: بەشی گەلێك کەسی تێدایە). هەنگ **heng** لە کوردیدا گەلێك مانای هەیە، یەکێك لەوانە بە کۆمەڵێك شتی جۆر جۆر دەگوترێ هەنگ. کەواتە فرەهەنگ **freheng** کۆمەڵێك هەڵسوکەوت و خوورەوشت و نرخ و نەریتە کە مرۆڤ پێڕەوی دەکا و کۆمەڵگە ڕێزیلێدەگرێ، واتە: کولتوور **kultûr**. بەکارهێنانی فەرهەنگ

بۆ (قاموس) ڕەنگە پڕ بە پری خۆی نەبێ بەلکو ← وشەنامە wishename ڕاستتربێ.

Ferhûd فەرهوود، ئەم وشەیە بە زۆری لە نێو عەرەبی عێراقدا بەکاردەبرێ، بەڵام لە بنچینەدا کوردییە. فەر fer لە فڕ fiř (فڕاندن fiřandin) و، هوود hûd بە مانای فەرمان hukim kirdin /ferman (حوکم) بەزۆرداری دێ. واتە: فەرماندان بە شت فڕاندن، ← تاڵان tal'an و بڕۆیی.

Ferîk فەریك، بە شتێك دەگوترێ کە جارێ تازەبێ و تەواو پێنەگەیشتبێ، وەك فەریکە گوێز ferîke gwêz، فەریکە نۆك ferîke nok. فەریك ferîk پێوەندیی هەیە بە وشەی ئەڵمانی frisch (تەڕ و تازە) و fresh ی ئینگلیزی، کە هەر بەو مانایەیە. هەروەها وشەی fraisی فەرەنسی.

Ferman فەرمان، بە پەهلەوی هەر فەرمان ferman ە، کە چووەتە نیو عەرەبی و ترکی و فارسییەوە.

Fermeson فەرمەسۆن، بەلایەنگرانی "ماڵی ئازاد" دەگوترێ. لە وشەی ئینگلیزی Freemason ەوە هاتووە کە free مانای ← ئازاد azad ە و mason مانای بەردتاش berdtash ە.

حیزبێکە لەگەلێك وڵاتی جیهاندا بەنهێنی کاردەکات، ئامانجی دەستبەسەرداگرتنی ئابووری و فەرمانڕەواییە، بەنێوی دامەزراندنی "خانووی ئازاد" ەوە. حیزبەکە بە شێوەی شانەشانە ڕێکخراوە کەبەو شانانە دەگوترێ "لۆج". لە ئێران و کوردستاندا بەو لۆجانە دەگوترێ "فەرامۆشخانە".

# F ف

Fermûn فەرموون، واتە: قسەکردن
بە شێوەی ڕێزلێنان لە قسەکەر.
فەرموون fermûn > فەر fer
+ موون mûn بە پەهلەوی
فرەمووتەن fremûten. فەر
fer لە ئاڤێستا و پەهلەویدا بە
شێوەی فرە fire دێ کە
دەکەوێتە بەردەمی کار (فعل) و
بە مانای پێش pêsh، بەر ber
دێ. Muten کە لە کوردیدا
موون mûn ە و بە مانای هۆنین
honîn ە. مووتەن mûten ی
پەهلەوی لە فارسیدا بووە بە:
مودن. فەر fer بە وێنەی پەر
per (بەر ber) ە. کە دەنگی ف
f و پ p جێگۆڕکێ دەکەن.
سەرنجی وشەی پەرپووت
peřpût واتە: پێش پووت
(بوون) pêsh pût bûn واتە:
پێش پووچ بوون و تونەبوون
pêsh pûchbûn û tunebûn
و سەرنجی وشەی راپەرموون
ra-per-mûn بدرێ، دەگوترێ
وا را ـ دە ـ پەر ـ مووم -wa
ra-de-per-mûm پێش ئەوەی
کارەکە بکرێ، پێموایە وادەبێ،
چاوەڕوانی ئەوە دەکەم.

Fexfûrî فەخفوری ← بەگ Beg.

Fêl' فێڵ/ ← تەڵەکە tel'eke. فێڵ
fêl' لە پیلە pîle ەوە هاتووە کە
مانای گەڕوگێچەڵ و بیانوو
گرتنە. وشەی "حیلة" ی
عەرەبیش لەمەوە هاتووە.

Fêrbûn فێربوون/ فێرکردن
fêrkirdin. فێر fêr لە وشەی
ئاڤێستایی فرا fira وە هاتووە،
کە مانای چوونە بەرەو شتێك.
لە فارسیدا بووە بە فرا fera
(سەرنجی وشەی فارسی:
فراگرفتن ـ واتە: فێربوون
fêrbûn بدرێ).

Fêstîval فێستیڤال. لە لاتینیدا
festivus ە بە مانای جێژن
کردن cêjin kirdin لە زمانە

ئەورووپاییەکاندا هەیە. لە فەڕەنسیی و ئینگلیزیدا festival ە، کە بە مانای یارییەکانی جێژن دێ.

Finish فنش/ فنشکردن finishkirdin لە وشەی ئینگلیزی finish ەوە هاتووە، واتە: تەواوکردنی کارێك، لە کوردیدا بووە بە لەسەرکارلابردن، دەرکردن. فنشیانکرد finishyan kird. ئەم وشەیە لە پاش یەکەمین جەنگی جیهانی، کاتێك ئینگلیزەکان هاتنە باشووری کوردستانەوە، کەوتە زمانی کوردییەوە.

Firat (ڕۆباری فرات). دوور نییە وشەکە یۆنانی بێ و لە -παρα ποταμία ("پارا ـ پۆتامیا") وە هاتبێ کە مانای "دەوروبەری ڕۆبار"ە، کە زرێبار zirêbar یش شتێکە لەو بابەتە.

Fire فرە، بە مانای ← زۆر zor دێ. فرە fire لە پرە pire ەوە هاتووە، کە مانای زۆرە (← پر pir).

Firezana فرەزانا. بە پەهلەوی فرەزانەك firezanek ەو لە فارسیدا بووە بە فرزانە ferzane.

Firîshte فریشتە (مەلایکەت) لە پەریشتە perîshte ەوە هاتووە > پەری perî + یشتە îshte (← پەری perî). وشەی ferry ئینگلیزی پێوەندیی ڕەگی بە فریشتەوە هەیە.

Firîw فریو (← پروپووچ pir û pûch، ← وڕێنە wiřêne).

Firîwdan فریودان/ فرێودان firêwdan لە ئاڤێستادا فرە ـ ئیدیڤە fire-îdîve یە و لە پەهلەویدا فرێفتەن firêften ە.

Fiřnî فڕنی، لە فڕو fiřo وە هاتووە. فڕو fiřo و فریشك firîshk،

# F ف

هەردووکیان به مانای ← ژەك jek دێن، که ژەك jek له ژەندن jendin ەوه دێ (مەشکه ژەندن). (← jan ژان).

**Firoshtin** فرۆشتن/ فرۆتن **Firotin**، له پەهلەویدا به شێوەی فرۆختەن **firoxten** دێ.

**Firseng** فرسەنگ، یەکەیەکه بۆ پێوانی دووریی بەکاردێ، که به پەهلەوی: فرەسەنگ **freseng** ە و له عەرەبیدا بووه به فرسخ (گەل: فراسخ).

**Firya** فریا/ فریاکەوتن **firyakewtin**، مانای به دەنگ و هاواری کەسێکەوه چوون. فریا **firya** له فڕێ **fiřê** وه هاتووه. له کوردیدا دەگوترێ پاره بۆ مه فڕێ که **pare bo me fiřêke** واته: پاره بخەڕێ بۆ مه. فڕێ کرن **fiřêkirin** و فڕێ خستن **fiřê xistin** له ڤه (وه) ڕێ کر(د)ن **ve(we)rê kir(d)n** و ڤه (وه) ڕێ خستن **ve(we) rê xistin** ەوه هاتووه. واته: شتێك خستنەڕێ، یان کەوتنەڕێ بۆ یارمەتیدان. جاروبار له جیاتی: ڤه (وه) ڕێ کر (د) ن، دەگوترێ: بەڕێ کردن، به ڕێخستن **beřêkirdin, beřêxistin**. له پەهلەویدا وشەی فرەیات **fireyat** هەیه به مانای چوون بەدەنگ هاواری کەسێکەوه.

**Fîřo** فیڕۆ(به خۆڕایی له دەست چوون). فیڕۆ > ڤی **fî** + ڕۆ **ro**، ڤی **fî** له فیت **fît** ەوه هاتووه که فیت **fît** وێنەیەکی دیکەی پیت **pît** ە، که پیت خێر و بەرەکەته. کەواته: فیڕۆ **fîro** فیت ڕۆ **fîtro** و پیت ڕۆ **pîtro** واته: خێر پێوه نەماو.

**Fîter** فیتەر. ترومبێل چاکەرەوه، له **fitter** ی ئینگلیزییەوه هاتووه که به مەکینه چاکەرەوه، مەکینه دامەزرێنەر، دەگوترێ.

# ف F

**Fûl فوول/ فوولكردن fûlkirdin بۆ پڕكردنی تانكی (← تانكی tankî) ی ئۆتۆمۆبێل به ← بەنزین benzîn، یان بۆ ← سەر خۆشبوون serxoshbûnی تەواو بەكاردەبرێ. هەردووكیان له وشەی ئینگلیزی full (← پڕ pir) ەوە هاتووە. هەر ئەم وشەیە به شێوەی Voll (پڕ pir) و füllen پڕكردن pirkirdin له ئەڵمانیدا هەیە.**

# G گ

Ga گا/ گاڤ gav بە پەهلەوی گاڤ gav و بە فارسیش هەر گاو gaw و نیشانەشە بۆ زلی zilî.

Galiske گالیسکە عەرەبانەیە. وشەکە وشەیەکی سلاڤییە. لە رووسی و پۆلۆنیدا هەیە. بە رووسی коляска (کالیسکا) یە و لە ئەڵمانیدا بە شێوەی kalesche هاتووە بە زمانی چیکی kolesa (کۆلیسا) یە بە زمانی پۆلۆنی kolaska (کۆلاسکا) یە.

Galon گاڵۆن، پێوانەیەکە بۆ قەوارەی شلایی، بە تایبەتی بەنزین. گاڵون 3.78 لیترە. وشەکە فەڕەنسییە gallon.

Galor گالۆر (← قالۆر qalor).

Gamêsh گامێش/ گاموش gamûsh بە پەهلەوی گاڤمێش gavmêsh ە. لە وشەی گا ga + مووش mûsh/ ← مێش mêsh (واتە: ← مەڕ meř). گامێش، واتە: مەڕێك کە هێندەی گایەك زل بێ. لە زمانی کوردیدا بۆ زلکردنی شتێك پاشکۆی گا دەخرێتە پاڵی، وەك گاکۆتر gakotir کۆترێکی زل. گابەرد gaberd بەردێکی زل. وشەی گامووش gamûsh بە شێوەی جامووس camûs کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە.

Gav گاڤ، مانای کات kat دەگەیەنێ. ئەم گاڤ gav ە، لە کوردیی کرمانجیی ناڤینیش (سۆرانی) دا هەیە. کورد دەبێژن: "لە قاڤ خۆیدا قسە دەکا" واتە: لە کاتی خۆیدا (لە گاڤی خۆیدا) قسە دەکا. دەنگی گ g ڕەقبووەتەوە و بووە بە ق q. دەنگی ڤ v یش لە نیوەلێویی halblabial ەوە

بووه بە لێویی **labial** واتە: بووه بە ف **f**.

**Gaz** گاز. بنچینەی وشەکە وشەی **xaos** (χάος) ی یۆنانییە کە مانای شوێنێکی بۆشە (←**Bosh** بۆش). مەنییەکە، زوو دەسووتێ و گڕ دەگرێ. لە عەرەبیدا بووه بە غاز.

**Gawir** گاور (← **Gewre**).

**Gech** گەچ، بە پەهلەوی و پازەند هەر گەچ **gech** ە، لە زاری عەرەبیدا کراوە بە جص.

**Geda** گەدا (← **Gede** گەدە).

**Gede** گەدە (ورگ **wirg**). بە شوێنی ریخۆڵەکانی مروڤ دەبێژن گەدە **gede**، کە وشەی **gedev** "گەدەڤ" یش هەیە، کە دیارە "گەدەك"ە. وشەی گەدە **gede** بووه بە مەدە **mede** و میدە **mîde**، کە لە عەرەبیدا بووه بە "معدة". هەروەها کەوتووەتە ترکییەوە وەك **mîde** وهەر لەم وشەیەشەوە (گەدە **gede**) وشەی "غذاء" ی عەرەبی و **gide** ی ترکی وەرگیراوە، کە بە مانای خواردەمەنی **xwardemenî** بەکاریدەهێنن. بێجگە لەوەش، وشەی "گەدا **geda**" واتە: ← دەرۆزەکەر **derozeker**/ پارسکەر **parsker** یش لەمەوە هاتووە، کەسێك کە بۆ تێرکردنی گەدە (ورگ) ی خۆی، دەست لە خەلك پاندەکەتەوە.

**Gel’a** گەلا، لە ← کالا **kal’a** ەوە هاتووە. لە کوردیدا وشەی کاڵ کوت **kal’ kut** هەیە بۆ ئەو ئامێرەی کە گەلا و جلکی پێدەکوتن (← کالا **kal’a**).

**Gelawej** گەلاوێژ (← **Berq** بەرق).

**Gemal’** گەماڵ، بە سەگی گەورە دەبێژن گەماڵ **gemal’**. لە

هێندەك شوێنی كوردستاندا دەنگی ڵ l’ بە شێوە كۆنەكەی كە ر r یە دەردەبردرێ و دەبێتە "گەمار gemar". وشەی گەماڵ gemal’ لە گەمار gemar ەوە هاتووە. گەمار gemar بە كوردیی باكوور مانای ← پیس pîs واتە: شتێك كە ← خاوێن xawên نەبێ. وشەی گەمار gemar لە گەنار genar ەوە هاتووە. گەن gen مانای چڵكن و پیس و ناخاوێنە. كە گەنین بە رووسی гнить; ە، وشەی بۆگەن bogen كە لە بۆن گەن bongen ەوە هاتووە، مانای بۆنی پیس دەگەیەنێ.

**Gemar** گەمار، ← گەماڵ gemal’.

**Gemje** گەمژە، وێنەیەكی دیكەی وشەی گەوجە gewce یە، بە گۆڕینی دەنگی م m و، و w و، ج c و، ژ j بۆ یەكدی. گەم gem و گەو gew یەك شتن و ج c و ژ j یەك شتن. (← ئاوز awiz ← وەزیر wezîr، ← وەج wec).

**Genc** گەنج. وشەیەكی كۆنی هێندۆئەورووپاییە. كە بە ئینگلیزی young ە و بنەچەكەی دەگەڕێتەوە بۆ geong و giung و geng . بە ئەڵمانی یونگ Jung ە. (← xezêne خەزینە).

**Genîn** گەنین. لە گەن gen (بۆن پیسی) ەوە دێ كە بە پەهلەوی گەن (د) gen(d) ە و بە رووسی بە گەنین دەگوترێ гнить;

**Genc** گەنج، واتە: تشتی بە نرخ. بە پەهلەویش هەر گەنج genc ە. ئەم وشەیە لە عەرەبیدا بووە بە كنز. گەنجینە gencîne ئەو ژوورە، یان ئەو شوێنەیە كە شتی بە نرخی تێدا دادەنرێ. وشەی "خزن" ی عەرەبیش هەر

لەم وشەیەوە وەگێراوە، بە گۆڕینی شوێنێ دەنگەکانی وشەی "کنز" بۆ "کزن" و ئەوجا گۆڕینی دەنگی ك k بۆ خ x و کردنی بە "خزن" و "خزانة" کە "خزانة" (خزینة) xezêne یە.

**Gencefe** گەنجەفە، قسەیەك کە گاڵتەکردن بێ بە خەڵك. گەنجەفە gencefe لە گەنگ ـ گەڤ ـ ە geng-gef-e وە هاتووە. گەنگ geng مانای گەن gen، واتە: بۆگەن bogen و ← گەمار gemar ە. گەنگ geng و گەند gend یش هاومانان. گەڤ gev و ← گەپ gep هاومانان و بە مانای دەم dem دێن. (گاڵتە و گەپ gal’te û gep). گەنجەفە واتە: دەم خستنەکار بە شێوەیەکی بۆگەن.

**Gencîne** گەنجینە، (← خەزێنە xezêne، ← گەنج genc).

**Gend** گەند (← گەنجەفە gencefe).

**Gep** گەپ، لە کوردیدا گەلێك مانای هەیە. جارێك بە مانای دەم dem دێ. دەگوترێ گەپیکە gepîke (واتە لە دەمتەوە قووتی بدە). وشەی قەپ qep (قەپلێدان qeplêdan واتە: گازلێگرتن gazlêgirtin). دەم و قەپاڵ qepal’ شێوەیەکی دیکەی گەپ gep ە. هەروەها وشەی گووپ gûp یش هەر لەم بنچینەوە هاتووە. هەروەها قاپ qap و کووپە Kûpe (کە دەفرێکی خڕە) و Cup ی ئینگلیزی پێوەندیی بەمەوە هەیە.

**Geř** گەڕ (گەڕی geřî) نەخۆشییەکە بە پەهلەویش هەر ger یان گەرەنوو gerenû ە و لە عەرەبیدا بووە بە جَرَب.

# G گ

**Gerac** گەراج وشەیەکە لە فەڕەنسیدا گەراژ garage، لە ئینگلیزیدا گەراج garage و لە ئەڵمانیدا گەراج garage ە. لە بنەڕەتدا بەمانای بردنی شتێك بۆ شوێنێکی ئەمین.

**Geřek** گەڕەك/ Tax تاخ، نێوچەیەکی گچکە لە شار، یان گوندێك. گەڕ geř + ـەك ek–. واتە: شوێنی پێداگەڕان. ڕەنگە وشەی کەرکووك kerkûk لە گەڕەکۆك geřekok، گەڕەکێکی گچکەوە هاتبێ.

**Gerentî** گەرەنتی. زامنکردنی کارێك یان شتێك. وشەکە ئەوروپاییە. بە فەڕەنسی و ئەڵمانی Garantie و ئیتالیی Garanzia.

**Gergush** گەرگوش (دارگوش dargush).

**Gerim** گەرم، بە پەهلەویش هەر گەرم gerim و لە فارسیشدا هەر گرم germ. وشەیەکی هیندۆئەوروپاییی کۆنە، بە ئینگلیزی ووۆرم warm و بە ئەڵمانی ڤارم warmە. وشەکە بنەچەیەکی سانسکریتی هەیە کە گەهرمە gehirme یە.

**Geřnas** گەڕناس، لە کوردیی باکووردا بە مانای پاڵەوان دێ. گەڕ geř مانای شەڕ sheř و زۆرانبازی zoranbazî یە لە کوردیدا (بڕوانە: شەڕ و گەڕ sheř û geř و، سەرنجی وشەی فەڕەنسی la guerre و ئینگلیزی war بدە کە، مانای جەنگ ceng ە، شەڕ ی کوردی لە "شرّ"ی عەرەبییەوە نەهاتووە، بەلکو وێنەیەکی دیکەی geř ە.). گەڕناس geřnas کەسێکە کە لە شەڕ و گەڕ بزانێ. ئەم وشەیە بە شێوەی فرناس firnas کەوتووەتە فارسییەوە و بۆ شێری ئازا و گەردن ئەستوور، بەکاردێ. شایانی باسە ناس

# G گ

nas ی کوردی لە فارسیدا شناس shenas ە نەك ناس nas. "گرَ و فرَ" ی عەرەبیش لەم بنچینەیەوە دێ.

Gerû گەروو، قورگ qurg/ قوڕوو qurû/ گەوری gewrî. هەموویان هاومانای یەکن. گەروو gerû وشەیەکی هیندۆئەورووپایی کۆنە، بە پەهلەوی: gerûk، بە فەرەنسی gorge و، بە ئەڵمانی gurgeln بە ئاو لە دەم و گەروو وەردان و خەرخەرە دەگوترێ. بە فارسی بووە بە گلو gelû.

Geřyan گەڕیان، یان گەڕان geřan. رەگی گەڕیان geřyan ← گەڕ geř ە. گەڕ geř و هەڕ heř (← هەڕە heře/ مشار mishar) و خەڕ xeř (← خەڕەك xeřek) بە مانای جووڵان و بزووتن دێ. وشەی عەرەبی "جریان" لە وشەی کوردی گەڕیان geryan ەوە دێ، بە گۆڕینی دەنگی گ g بو ج g. "جریان" بە شێوە عەرەبییەکەی کەوتووەتە زاری ترکییەوە cereyan و بۆ تەوژمی ← کارڤا kariva (کارەبا) بەکاردەبرێ. کە لە هێندەك شێوەزاری کوردیی باکووردا بووە بە جەیران ceyran. وشەی گەڕیان geryan لە فارسیدا گردان gerdan و لە فەرەنسیدا courantە.

gesk گەسك/ گزیك gizîk/ گۆسك gosk. لە کەزی kezî یەوە هاتووە. کەزی kezî پرچ pirch و زولفی ژنە. گزیك نێوی جۆرە گیایەکی ریشودارە. گەسك gesk خۆی لە بنەڕەتدا لە تاڵی و شکەوە بوو، و جۆرە دەوەنێك

دروستدەکرا. وشەی دڕکەزی diřkezî یش، لە دڕك کەزی diřk-kezî وە هاتووە.

Gev گەڤ (گەف gef) (← گەنجەفە gencefe).

Gewc گەوج (← ئاوەز awez).

Gewre گەورە، یان وشەیەکی هیندۆئەورووپاییە کە بە لاتینی grossus و بە ئەڵمانی groß و بە فەرەنسی gros و بە ئینگلیزی great، یان ئەم وشەیە لە وشەی کاورا kawra ەوە هاتووە کە شێوەیەکی دیکەی کابرا kabra یە > کاك برا kakbira. کە کاك kak بۆ برا گەورە بەکاردێ. ئەو دەمە، کاورا kawra بووە بە گاورا gawra و دوایی گەورە gewre. (سەرنجی وشەی کافر kafir بدە کە بووە بە گاور gawir).

Gez گەز، ئامێرێکە کە هەر لە کۆنەوە لە لای کورد بۆ پێوانەی درێژی و پانی و قووڵی بەکاربراوە و، هەر بەو شێوەیە کەوتووەتە فارسییەوە (ئەوە گەز و ئەوە ئەرز، ئەگەر یەز دوورە، گەز نێزیکە). وشەی عەرەبی "قیاس" کە لە رەگی "قس" ەوە وەرگیراوە، لە "گەز" ەوە هاتووە. هەروەها وشەی قاس qas (هەندازە hendaze) لە کوردیی باکووردا هەر لەم بنچینەیەوە دێ. سەرنجی وشەی Maß ی ئەڵمانی بدرێ کە مانای قاس qas ی کوردی دەدا.

Gezare گەزارە (zimandrêj زماندرێژ). لە Ga-zare گازارەوە هاتووە. Ga← گا لە کوردیدا بە مانای زل دێ و ← Zar زار واتە زمان. (← زمان ziman).

Gêlas گێلاس (← Goyîj گۆیژ).

Gêpeře گێپەڕە (گێپەڕەی مل gêpeřey mil). گێ gê لە گوێ

gwê وه هاتووه. پەڕە peře واتە: ئەستووریی مل (← ئەستوور estûr).

**Gêzer** گێزەر/ گوێزەر gwêzer. گێ gê و گوێ gwê هەردووکیان یەکمانا دەگەیەنن لە کوردیدا. زەر zer ڕەنگی زەرد zerd ە. گێزەر gêzer بە ڕەنگەکەیدا بە گوێیەکی زەرد دەچوێنرێ. بەڵگە بۆ ئەمەش ئەوەیە بە پشتی مل لە کوردیدا دەگوترێ گێزەرە gêzere واتە: ئەو شوێنەی ئەستۆ esto، کە پێوەندیی بە گێ gê (گوێ gwê) وە هەیە. هەروەها دەگوترێ بە گازەرا gazera ی پشتدا کەوت.

**Gil’** گڵ (گل gil) خۆڵی تێکەڵکراو بە ئاو. بە پەهلەویش هەر گل gilە.

**Gil’aw** گڵاو، جاران کە دەمی سەگ بەر شتێك بکەوتایە، ئەو شتەیان بە گڵ و ئاو دەششت و دەیانگوت: گڵاویی دەردەکەن، لەوەوە بە شتی پیس دەگوترێ گڵاو، واتە: دەبێ بە گڵ و ئاو بشۆردرێ.

**Gil’bêne** گڵبێنە (← Qur قوڕ/ Ĥerî حەری).

**Gil’op** گڵۆپ (چرای ئەلەکتریکی) وشەکە ئینگلیزییە (globe).

**Glorbûnewe** گلۆر بوونەوە (← چەرخ cherx).

**Girawe** گراوە، گراڤ girav دوورگە dûrge (جزيرة) < گر gir + ئاو/ڤ aw/v + ە e. گر gir (گڵ gil’)ە خاك xak. واتە: خاکێك کە لە نێو ئاودایە.

**Girinc** گرنج، گر gir لە زمانی کوردیدا بە مانای شتی زبر وکنجڕ کنجڕ دێ. وشەی گرنج girnic (گرنج گرنج girnc girnc) و گرژ girj و گڕ giř

(دانی گرِ danî giř) یش هەر لەمەوە دێن. گر gir شتێکە کە لووس lûs نەبێ.

**Girîs** گریس (← نەگریس negrîs).

**Gîpe** گیپە، خواردنێکە لە گۆشتی هوورکراو و ← کشمیش kishmîsh و بادام (باوی bawî) و بەهارات دروستدەکرێ و دەخرێتە نێو پارچە ورگێکی مەڕەوە، شێوەیەکی ← خڕ xir ی هەیە. گیپ gîp لە زمانی کوردیدا وێنەیەکی دیکەی گووپ gûp ە. هەر لە کوردیدا گیپاڵ gîpal' هەیە (گەد و گیپاڵ ged û gîpal') کە گیپاڵ، بەو بەشە لە زگ دەبێژن کە دەکەوێتە سەر ← ریخۆڵە rîxol'e وە. هەروەها وشەی گیپن gîpin هەیە بە مانای گووپن gûpin. گیپ gîp لە کوردیدا گیپار gîpar و گیپا gîpa شی پێدەبێژن، واتە: گووپێکی پڕ gûpêkî pir. ئەم وشەیە کەوتووەتە زاری فارسییەوە بە شێوەی گیپا و کیپا، کە دیارە لە فارسیدا بە گووپ gûp نایەژن گیپ gîp، بەلکو لُپ lop. بە مەدا دەردەکەوێ کە ئەمە خواردنێکە لە بنەڕەتدا کوردییە.

**Gîrfan** گیرفان (بەریک berîk) بە پەهلەوی گریف ـ پان -grîv pan ە، کە لە فارسیدا بووە بە گریبان. وشەی گیر gîr و گر gir (بەرگر bergir) لە کوردیدا بۆشتێك بەکاردێ کە دەست، یان شتێکی دی پێوە بەندبکرێ، یان بە شوێنێکەوە بەندکرابێ. گیرفان gîrfan لە گیرڤان gîrvan (گیروان gîrwan)ەوە دێ. لە زمانی ئەڵمانیدا بۆ دەسکی شتێك

# G گ

(دەستگر destgir) یان، دەسکی دەرگەیەك وشەی Griff بەکاردەبرێ کە لە کاری greifen بەدەست گرتن be destgirtin ەوە دێ.

**Gîrsandin** گیرساندن (← نەگریس negrîs).

**Go** گۆ (← komar کۆمار).

**Goc** گۆج (← کەچ kech).

**Gonye** گۆنیە، (ئامیرێکە لە کاروباری ← هەندەسە hendese دا بەکاردەبرێ بۆ پێوانی گۆشە پێی. وشەکە لە بنەڕەتدا یۆنانییە γωνιομετρία و لە ئینگلیزیدا بووە بە goniometer و لە فەرەنسیدا gonométr و لە ئەڵمانیدا gonometer. وشەی گوێنی/ گۆنی /gonî gwênî لەمەوە هاتووە.

**Goř** گۆڕ، Gořê گۆڕێ. کورد دەبێژن: ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ. Gořê لێرەدا کۆڕێ kořê یە بە گۆرینی دەنگی ك k بۆ گ g.

**Goshe** گۆشە (← قاش qash).

**Gotbûn** گۆت بوون، واتە: نەتوانین (بۆ رۆیشتن بە پێ). گۆت got وێنەیەکی دیکەی کۆت kot ە، واتە: بەندبوون bend bûn بە زنجیر zincîr، یان بە سنگ sing ەوە.

**Gotre** گۆترە/ gûtere گووتەرە/ Gotirme گۆترمە. خەملاندنی شتێك بە بێ پێوان و ژماردن. لە گۆتن gotin ەوە سەرچاوە دەگرێ. واتە هەر قسەی دەمییە.

**Gotin** گۆتن/ wutin وتن. بە ئاڤێستایی ڤەش vesh ە.

**Govan** گۆڤان (شایەت، گەواهـ) < گۆ go + ڤان van < گۆت got + ڤان van. گۆت got لە گۆتن gotin ەوە هاتووە. واتە: کەسێك کە دێتە گۆ. ڤان/وان

v/wan ئامرازی کارای کاره (nomen agentis).

Govend گۆڤەند، وێنەیەکی دیکەی کۆ ko + وەند wend (کۆوەند kowend)ە.

Goyîj گۆیژ (گەویژ gewîj < گۆیش goyîsh < گۆیشك goyîshk < گۆیچك goyichk (واتە: گۆ go یەکی بچووك). هەروەها لە کوردیدا، گۆهیشك gohîshk و گڤیشك givîshk یش هەر بۆ گۆیژ goyîj بەکاردەبرێن. وادیارە هێندەك میوە هەن وەك گێلاس gêlas و گێراز gêraz (کە ئەوەش لە بنەماڵەی گێلاس gêlas ە) پێوەندییان بە گۆ go وە هەیە. لە کاتێکدا لاس las (لاز laz راز raz) لە کوردیدا بۆ جوانی و شەنگی بەکاردێ. سەرنجی وشەی رازاندنەوە، رازانەوە razanewe لێرەدا بدرێ کە مانای جوانکردن cwankirdin ە.

Gul’ گوڵ، لە وشەی ئاڤێستایی ڤاردها vardiha وە هاتووە کە لە پەهلەویدا بووە بە verda ڤەردا/ ڤەرتا verta و لە عەرەبیدا بووە بە "وَرْدْ" werd.

Gul’bêne گوڵبێنە < گوڵ gul’ + بێنە bêne. گوڵ gul’ لە جێگۆرکیی دەنگەکانی وشەکەوە هاتووە کە گەڵو gel’û < گەروو gerû بووە بە گوڵ gul’، بێنە bêne واتە: هەناسە henase. بێندان bêndan واتە: هەناسەدان henasedan. سەرنجی وشەی بین خواردنەوە bîn xwardinewe بدە واتە: هەناسەگرتن henasegirtin و هەناسەنەدان henasenedan بۆ لە سەررۆیشتنی کارێك. بینی

بگرە bînî bigre واتە: بۆری هەناسەی بگرە. کەواتە: گوڵ بێنە gul'bêne گەرووبێنە gerû bêne یە، واتە: گەرووی هەناسەدانی تەندوور.

**Guman** گومان، بە پەهلەویش هەر گومان guman ە. بە فارسی گمان geman ە.

**Gun** گون/← xaye خایە. گون Gun ی مرۆڤ و گوان Gwan ی ئاژەڵ پێوەندییان بە یەکەوە هەیە (گەڵ و گوان gel' û gwan واتە: نێولنگ و گون) گوان > لە گۆ go + دان dan ەوە هاتووە. سەرنجی گۆی مەمك goy memik بدە کە گۆ go بەو نووکە خڕە دەگوترێ کە بە سەری مەمکەوەیە. گۆدان godan واتە: جێی گۆ cêy go. گوان gwan و گون gun هەردووکیان دوو ئەندامی خڕن. هێندەك جار بە مەمکی ژنیش دەگوترێ گوان gwan.

**Gurc** گورج، بە مانای خێرا xêra. کورد دەبێژن گورج و گوڵ gurc û gol' کە رەنگە لە بنەڕەتدا گورج و گۆڕ gurc û goř بووبێ. گۆڕ goř وەك شێوەیەکی دیکەی گوڕ guř (خێرایی xêrayî) رەنگە وشەی گرد ی فارسی کە بە مانای ئازا aza یە لە وشەی گورج gurc ەوە هاتبێ بە گۆڕینی دەنگی ج c بۆ د d.

**Gurge zê** گورگە زێ (← زاو و زێ zav û زاڤ و زێ /zaw û zê zê).

**Gurîs** گوریس، لە گوش gush ڕێس rês ەوە هاتووە، واتە: گوشی ڕێسراو gushî rêsraw. لە هێندەك شێوەزاری کوردیی باکووردا بە گوریس gurîs (گورێس gurês) دەبێژن

ڤەریس verîs. ئەم وشەیە، لە ڤەش ڕێس ەوە هاتووە، کە ڤەشاندن/ وەشاندن veshandin/weshandin و گوشین gushîn، یەك مانایان هەیە. وشەی گوش gush خۆی لە گوشین gushîn ەوە دێ.

**Gush** گوش (← گوریس gurês/گورێس gurîs).

**Gushar** گوشار، واتە: قورسایی خستنە سەر شتێك. گوشار gushar لە گوشین gushîn ەوە دێ. کە وێنەیەکی دیکەی وشین wishîn ە و لە فارسیدا بووە بە فشار (← بانگوش bangush).

**Gûmerz** گوومەرز/ گوومەز gûmez، بە پەهلەوی: گومبەت gombetە و، لە فارسیدا بووە بە گنبد gonbed.

**Gûmirg** گوومرگ. وشەکە بنەڕتێکی لاتینی هەیە کە Commercium ە کە لە فەرەنسیدا بووە بە Comerce و لە ئیتالیاییدا Commercio و لە ئەڵمانیدا Kommerz و لە ئینگلیزیدا Commerce. لەسەر دەمی کۆندا بۆ بازرگانی و کڕین و فرۆشتن و هاتوچوو بەکاردەبرا. لەسەر دەمی عوسمانیەکاندا ئەم وشەیە لە ئەوروپاوە گەیشتووەتە ئەوێ و بە شێوەی gümrük کەوتووەتە زاری ترکی عوسمانی و بە شێوی گوومرگ gûmrig کوردی و بە شێوەی گەل کمارك کەوتووەتە عەرەبی و، بۆ وەرگرتنی مزی تێپەڕینی کاڵایەك دەگوترێ بە سنووری دەڤەرێك، یان وڵاتێکدا.

**Gûp** گووپ (← گەپ gep).

**Gwan** گوان (← گون Gun).

**Gware** گوارە، لە وشەی ئاڤێستایی گەئۆشڤارە gaosh-vare ەوە

هاتووە، لە فارسیدا بووە بە گوشوارە. گەوش gewsh بە ئاڤێستایی مانای گوێ، کە لە فارسیدا بووە بە گوُش gûsh.

Gwênî گوێنی/ Gonî گۆنی (← Gonye گۆنیە).

Gwêz گوێز و گوز goz، بە پەهلەوی گۆز goz و لە فارسیدا بووە: گوز gewz و لە شێوەی "جوز" دا کراوە بە عەرەبی.

Gyan گیان (رۆح) کە بە ئاڤێستایی گەییە geîye یە و بە پەهلەوی هەر گیان gyan ە، لە فارسی و هێندەك شێوەزاری کوردیدا بووە بە جان can و هەر وەك جان can و هەر بەو مانایە، چووەتە نێو ترکییەوە.

# H ه

**Hacas** هاجاس /نێوبژی
**nêwbijî**/ناڤجی **navcî** (←
هار **har**).
**Hag** هاگ /هێلکه **hêlke**/← هێگ
**hêg** (← خۆ **xo**).
**Haka** هاکا (بەم زووانە) < ها **ha** +
کا **ka**. ها **ha** لە زمانی کوردیدا
فرەمانایە. یەکێك لەوانە:
کورتەی هات **hat**، کا **ka**
کورتەی کات **kat**. هاکا **haka**
واتە: هات کاتی **hat katî** ئەوا
کاتی هات **ewa katî hat**، وا
ئێستە دەگات **wa êste degat**.
(← **Akam** ئاکام).
**Halaw/v** هالاو/ڤ < هاڵ **hal'** + ئاو/ڤ
**aw/v**. هاڵ **hal'** و هەڵ **hel'**
هاومانان و پێشگرێکن کە ئاماژە
بۆ بەرەوژووربونەوە و
سەرکەوتن دەکەن (سەرنجی:
هەڵچوون **hel'chûn**، هەڵسان
**hel'san**، هەڵدان **hel'dan**
بدە). هەڵ **hel'** لێرەدا
کورتکراوەی هەڵم **hel'm**ە، کە
هەڵم **hel'm** لە هەڵمی دەم
**hel'mî dem**ەوە دێ، واتە:
سەرکردنی هەڵمی دەمی مرۆڤ،
یان دەمی ئاو، یان شتێکی
دیکەی وەك ئاگر **agir** (هالاوی
ئاگر **hal'awî agir**). هەڵمی
دەم **hel'mî dem** بووە بە هەڵم
**hel'm**. هالاو **halaw** لە هەڵم
**hel'm** + ئاو/ ڤ **aw/v** ەوە
(هەڵماو/ڤ **hel'ma/w/v**) دێ.
هالاو/ڤ **hal'aw/v** لە زاری
ترکیدا بووە بە: **alev**.
**Har** هار، هاری **harî** نەخۆشییە کە
تووشی سەگ **seg**/و ← مرۆڤ
**mirov** و هێندەك گیانداری
دیکەی، وەك شەمشەمەکوێرە
**shemsheme kwêre** دەبێ.

هار har وشەیەکی کۆنی کوردییە کە هەر بەو شێوەیە کەوتووتە فارسییەوە (سەرنجی فەرهەنگی فارسی موعین بدرێ). هار har وێنەیەکی دیکەی هاج hac (بزۆز bizoz و جووڵە جووڵکەر cûl'ecûl'ker)ە. (سەرنجی هاج و واج hac û wac و هاژەهاژ hajehaj و هاژ و واژ haj û waj بدە). هەروەها سەرنجی وشەی هاجاس hacas (نێوبژیکردن nêwbijîkirdin/ ناڤچیکرن navcîkirin بدە) کە لە هاج hac + ئاس as (ئاساییکردن asayîkirdin، دامراندن damirandin)ەوە هاتووە.

Hař هاڕ (← هاڕین Hařin).

Hařîn هاڕین، واتە: کردن بە ئارد ard (← ئارد ard)، هاڕ hař بە مانای بەرد berd دێ لە کوردیدا و، وەك پاشکۆی وشە، دەبێتە ئامێرێك کە شت ورد بکا (← دەستاڕ destař).

Harwê هاروێ (← خەیار xeyar).

Havî هاڤی (namo نامۆ، بێگانە bêgane) لە هاڤیتن havîtin/ hawîshtin هاویشتن/ ەوە هاتووە. هاڤی havî واتە: فرێدراو fiřêdiraw/ peřkiraw پەڕکراو. هاڤیبوون havîbûn (derbederbûn دەربەدەربوون/ wundabûn وندابوون).

Hav/wîn هاڤ(و)ین: لە ئاڤێستادا دوو وشە هەیە بۆ ئەمە: هامە hame و هامێن hamên.

Hawlan هاولان، هاولانە hawlane. < هاو/هەڤ haw/hev + لان/ـە lan/e. هاو haw و هەڤ hev مانای پێکەوە pêkewe، بهەڤرا bihevra دەدا. لان lan/e مانای جێ و شوێن. کە لە بنەڕەتدا

دالْ ـ ئان dal’-an ە. دالْ، ماناى جێ و شوێنە (← دالأهۆ dal’aho). هاولان hawlan بە دوو کەس، یان چەند کەسێك دەگوترێ کە پێکەوە بن، یان پێکەوە بژین. وەك evlane (زەواج) کەوتووەتە ترکییەوە.

Hawsê هاوسێ (← دراوسێ dirawsê).

Hesan هەسان (← Estê ئەستێ).

Hetaw/v هەتاو/ڤ، بە پەهلەوى: ئاڤتاب avtab، وشەکە پێوەندیى بە تاو/ڤ taw/v واتە: تین tîn (گەرمى germî) یەوە هەیە. سەرنجى وشەى گرانەتا graneta/گرانەتێ giranetê (تایەکى قورس و گران tayekî qurs û giran) بدە.

Hetwan هەتوان (مەلحەم بۆ برین) > هە he + توان twan. هە he کورتکراوەى هەنوون (پشتی خۆت بەو دەرمانە ب هەنوو، سەرى دلّى خۆى پێهەنوو serî dilî xoy pê henû). توان twan (سوان swan، ساوان sawan) واتە: تێهەلْسوون، لێرەدا دەنگى س s و ت t چوونە جێییەك.

Hegbe هەگبە (چانتاى بچووك). لە سەر دەمى کۆندا جۆرە خورجێك بووە کە لە پشتى ولاخ قایمکراوە بۆ سەفەر. هەگبە hegbe لە هەژگ بار hejgbar ەوە هاتووە کە هەژگ hejg بە چرۆچیلکە chiruchîlke، یان بەو رەشکە reshke یە دەگوترێ کە کا دەکێشرێ پێى. هەژگبار hejgbar بووە بە هەگبار hegbar و ئەوجا بە هەگبە hegbe. وشەى "حقیبة" ى عەرەبى لەم هەگبەیەوە هاتووە، نەك لە

# H ھ

bag ی ئینگلیزییەوە کە بە مانای جانتایە.

**Hej** هەژ (← **Qêz** قێز).

**Hejar** هەژار. هەژ **hej** لە زمانی کوردیدا هاومانای هیشك **hîshk**/ وشك **wushk** ە. هەژگ **hejg** لکەداری وشکەوەبووە. هەژار **hejar** لە بنەڕەتدا هەژدار **hejdar** ە، دارێك کە تەڕایی تێدا نەماوە. هەژار ئەوڕۆ بۆ مرۆڤی دەستکورت **destkurt** و بەلەنگاز **belengaz** بەکاردەبرێ.

**Hejîn** هەژین (بزووتن **bizûtin** و لەرزین **lerzîn**). وشەکە لە دەنگەکەیەوە هاتووە. سەرنجی وشەی هاژەهاژ **hajehaj** ی ئاو و هاژەهاژی ئەسپ بدرێ، وشەی (هزة) ی عەرەبی لە مەوە هاتووە، بە گۆڕینی دەنگی ژ **j** بۆ ز **z** چۆنکە دەنگی ژ **j** لە عەرەبیدا نییە.

**Hejmar** هەژمار (← ئامار **amar**).

**Hel’bet** هەڵبەت. لە أَلْبَتَّة ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، کە بە مانای جەخت کردن **cextkirdin** لەسەر شتێکە، بە دڵنیایی **bedilniyayî**.

**Hel’gurd** هەڵگورد، نێوی چیایەکە لە باشووری کوردستان. هەڵ **hel’** لە هەر **her** و هەرد **herd** ەوە هاتووە کە هەرد **herd** مانای چیا **chiya**، یان لاپاڵی چیا **lapal’î chiya** یە. گورد **gurd** وێنەیەکی دیکەی کورد **kurd**ە. واتە: چیای کورد. چیای دیکەش هەن کە بە نێوی کوردەوە نێونراون، وەك: چیای کورمانج **chiyay** (جبل الاكراد) **kurmanc** لە ڕۆژاوای کوردستان. هەرد **herd** بەشێوەی هار (הר) کەوتووەتە زمانی عیبرییەوە.

# H ه

**Hel'm** هەڵم (← هاڵاو/ڤ **hal'aw/v**).

**Hel'warte** هەڵوارتە /ڕیزبەدەر **rîzbeder**/نێوبەدەر/ هەڵاوارتە **hel'awarte**/ هاوارتە **hawarte**/ ئاوارتە **awarte** (مستثنی) > هەڵاوارتە **hel'awarte** > هەڵ **hel'** + ئاوارتە **awarte**. هەڵ **hel'** پێشگرێکە بۆ لابردن و دەرهێنان و دەرکێشان (هەڵکێشان **hel'kêshan**، هەڵکەندن **hel'kendin**، هەڵبڕین **hel'biřîn**). ئاوارتە > ئاوار **awar** + تە **te**، وار **war** مانای شوێن و جێگەیە. تە **te** کورتەی تەرە **tere** یە. کەواتە هەڵاوارتە ئەو شتەیە کە لە شوێنی خۆی لابرابێ و جیاکرابێتەوە لەو جێیەی تێدا بووە. ← ئاوارتە **awarte** ش بە تەنێ، هەر مانای لە شوێنی خۆی نەماوە.

**Hemane** هەمانە/ **hewane** هەوانە، لە: هەناو ـ وانە **henaw-wane** دەوە هاتووە کە ئانە **ane** کورتکراوەی دانە **dane** یە. دان **dan** شوێن **shwên** /جێگە **cêge** یە (گوڵدان **gul'dan** شوێنی گوڵ، شەکردان **shekirdan** جێی شەکر). ← هەناو **henaw**، ئەو شتەیە کە بەشی نێوەوە/ناوەندی شتێك بگرێتەوە. هەناوی مرۆڤ **henawî mirov** (ناو زگ و ورگ، ناخی مرۆڤ). هەناوانە **henawane** بووە بە هەوانە **hewane** و ئەوجا هەمانە **hemane** و هەمبانە **hembane** و هەنبانە **henbane** و، بەو پارچە پێستە دەگوترێ کە شتۆمەکی

تێدەکرێ. لە فارسیدا پێیدەگوترێ انبانە enbane. انبان لە فارسیدا بە مانای پڕ piř دێ. دەنگی م m و نب nb جێییەك دەگرنەوە. سەرنجی وشەی هەمار hemar بدرێ کە لە فارسیدا بووە بە انبار enbar.

**Hemû** هەموو/ هەم/ هەڤ hem/hev لە عەرەبیدا بووە بە عەم (عَم) و ئەوجا بە عام.

**Hem(y)ar** هەمیار (←mal' ماڵ).

**Henaw** هەناو (← هندر hindir).

**Hendaze** هەندازە (مقیاس) هەندازە hendaze > هەند (مقدار) hend + ئازە aze > هەند hend + ئاسە ase > هەند hend + ئاستە aste. کە ئاستە، بە مانای (مستوی) شتێك دێ. وشەی هەندازە لە پەهلەویدا هەنداچەك hendachek ە. کە هەند hend (بڕ، مقدار) ی کوردی لەمەوە هاتووە. و هەند hend لە فارسیدا بووە بە أند end و هەندازە کە هەنداچەك بووە، لە فارسیدا بووە بە أندازە endaze. و بەمپێیە وشەی "هندسە" کە لە عەرەبی و فارسیدا بەکاردەبرێ، لەم وشە کوردییەوە وەرگیراوە، ئەگەرنا، ئەگەر لە فارسییەوە وەربگیرایە، نەدەبوو بگوترێ هندسە، بەلکو أندزە endeze چۆنکە فارس نابێژن هەند hend بەڵکو أند end. بێجگە لەوەش، دەنگی ست st لە ئاستە aste دا نەبووە بە ز z بەلکو، وەك دەنگی سە se ماوەتەوە > ستە ste. (← هەندەسە hendese).

**Hendese** هەندەسە، هەندەسە hendese > هەند hend + سە se "هەند" لە زمانی کوردیدا بە مانای بڕ (مقدار) دێ، واتە: بۆ چەندایەتی شت بەکاردەبرێ. بۆ وێنە: لە کوردیی ئەورۆدا دەگوترێ: "ڕۆستەم هاوسێیەکەی

به هەند ناگرێ" واتە: هیچ جورە برِێك/چەندایەتیەك دانانێ بۆی. وشەی "مقدار" ی عەرەبی، کەوتووتە فارسیەوە و، بە تەواوی بەرامبەر بە "هەند" ی کوردی بەکاردەبرێ، بۆ وێنە دەگوترێ: اَقای علی آدم بی مقدار یست" واتە: "عەلی ئاغا مرۆڤێکی بێ هەندە". دەمێنێتەوە سە se کە لە ئاست ast ەوە هاتووە. ئاست ast، مانای جێ و شوێنی شتە (لەو ئاستەدا مەوەستە، واتە: لەو شوێنەدا مەوەستە) کە ئاست ast و ← ئاسۆ aso یەك بنەرِتیان هەیە (← ئاسمان asman).

**Heneza** هەنەزا. زارۆی هەڤی (هەوی) یە، هە he وێنەیەکی دیکەی xe/ خۆ xo یە. واتە: خۆنەزا xweneza واتە: زارۆ (منداڵەکە) لەخۆی نەزاوە و هی هەوێکەیەتی. (← هەوێ hewê).

**Heng** هەنگ، چەند مانایەکی هەیە، وەك نیشانە، ئامانج، کۆمەڵە شتێك، یان، بەشێك لە لەشکرێك (سەرنجی وشەی سەرهەنگ serheng بدرێ کە فارسەکان بەکاریدەبەن). وشەکە لە بنەرِەتدا کوردییە و، هوێنگە hwênge یە (فەرهەنگی فارسی موعین). وشەی هەنگ بووە بە هەند hend بە مانای برِ biř (مقدار) کە لە فارسیدا بووە بە أند end. کورد دەبێژن: بە هەندیان نەزانی be hendyan nezanî واتە: "قەدریان نەگرت qedryan negirt" (← هەندەسە Hendese، ← هەندازە Hendaze).

**Hengaw** هەنگاو (← هنگاڤ hingav).

**Hengwîn** هەنگوین /هەنگڤین hengvîn/ هنگڤ hingiv. هەنگڤین hengvîn > هەنگ

heng + و/ڤ w/v + ین în. بە پەهلەوی: ئەنگوبین əengubîn و، لە عەرەبیدا بووە بە أنجبین. وشەی هەنگ heng لە فارسیدا بە شێوەی أنگ eng بەکار نابرێ و لە جیاتی وی "زنبور عسل" بەکاردەبرێ.

**Herd** هەرد (← Hel’gurd هەلگورد).

**Heře** هەڕە، بڕەك biřek /مشار mishar. (← خەڕەك xeřek). لە فارسیدا بووە بە أره (← خەڕەك xeřek).

**Heřet** هەڕەت (مانای گەیشتنە پۆپەی شتێك). بە کوردی دەبێژن هەڕەتی لاوێتی، یان هەڕەتی گەنجێتی واتە: ئەو پەڕی. هەروەها دەبێژن هەڕەتیا heřetya، یان، هەڕەکیا heřekya واتە: لە ماندوویەتیدا پەکیکەوت. هەڕەت heřet > هەر her + ـەت et. هەر her یان herî مانای پەڕ peř (ئەو پەڕ ew peř) ی بەرزێتی (هەرە گەورە here gewre، هەری مەزن herî mezin، هەرە خۆشەویستی here xoshewîstî). هەر her (هار har) بۆ بەرزێتی چیاش بەکاردێ. (← هەرد herd).

**Herêm** هەرێم (←Îqlîm ئیقلیم).

**Heřî** هەڕی/ ← قوڕ quř / حەری ĥerî

**Hesan** هەسان (← ئەستێ estê).

**Hetav/w** هەتاو/ڤ، لە: هێزتاڤ/و hêztav/w دوە هاتووە، واتە هێزی گەرمی.

**Heval** هەڤال/Havîl هاڤیل (← هاوەڵ Hawel’) > هەڤ hev + پاشگر ـ ئال al ـ هەڤ hev (هاو haw). ئال al (لا la) واتا: هاولا hawla. بە شێوەی خاڤیر חבר کەوتووەتە زمانی عیبرییەوە و، بۆ هاوڕێ و ئەندام بەکاردێ.

**Hevî** (← **bûk** بووک).

**Hewa** هەوا، لە کوردیدا بە مانای با **ba** و بۆشایی **boshayî** دێ. هەوا **hewa** لە شێوەی **ĥewa** شدا هەیە کە بە مانای ← ئاسمان **asman** دێ. دەگوترێ: روویکردە حەوا (واتە: روویکردە ئاسمان). ئەم وشەیە، بە مانای ئاسمان، بە ئینگلیزی **heaven** ە کە بە مانای خودێ **xudê** (خوا **xwa**) یش دێ. بە ئینگلیزی دەگوترێ: **thank Heaven** (سوپاس بۆ خودێ). وشەی **heaven** لە زمانی ئەڵمانیدا **Himmel** ە، کە لە وشەی کۆنی ئەڵمانی **kemeno** وە هاتووە کە بە مانای "شاردنەوە **shardnewe** دێ، لێرەدا سەرنجی وشەی ← کەمین **kemîn** ی کوردی بدرێ کە مانای شوێنی خۆشاردنەوەیە. لە کوردیشدا وشەی هەیف **heyv** هەیە کە مانای مانگ **mang** ە و لە ئاسماندایە. هەوا **hewa** لە (هواء) ی عەرەبییەوە نەهاتووە، بەلکو وشەیەکی هێندۆجەرمینی و کوردییە.

**Hewar** هەوار، وەك ← وار **war** مانای جێی ژیان و دانیشتنە. (← وار**war**) وار **war** لە کوردیدا پاشگرێکە مانای هەبوونی شتێك پێشاندەدا. وەك بەندیوار **bendîwar** واتە: پێوەندیی هەبوون (بەندبوون) بە شتێکەوە. کۆڵەوار **kol'ewar** کەسێکە کە لە لەشیدا، کۆڵی **kol'î** هەیە. وار **war** شێوەیەکی دیکەی هەیە لە کوردیدا، ئەوەش: بار **bar** بۆ وێنە: گوناهبار **gunahbar** واتە: کەسێك کە گوناهی هەیە. بار **bar** و وار **war** بە

پەهلەوی ڤار var ە. وشەی وار war (ڤار var) هەر وەك خۆی کەوتووەتە زاری ترکییەوە و هەر بە مانای هەبوون hebûn بەکاردێ. هەر لە وشەی وار war ەوە، بە مانای جێ cê یش دێ، وشەی yer ی ترکی، لە ڕێی war < wêr ەوە، لە ترکییدا بە مانای شوێن بەکاردێ (سەرنجی وشەی iş yeri "شوێنی کار" بدرێ).

Hewîr/hevîr هەویر/هەڤیر (←هەوێن Hewên، هەڤێن Hevên).

Hewê هەوێ/ Hevî هەڤی (← Bûk بووك).

Hewên هەوێن، وشەیەکی دیکەش لە کوردییدا بۆ هەوێن هەیە، کە ئەوەش ئامیان amyan ە. مایەیەکە دەکرێتە شیرەوە و شیرەکە تورت دەکات و، بەشەکانی پێکەوە دەلکێنێ. لەم وشەیەوە (هەوین/هەڤین hewîn/hevîn) وشەی هەویر/هەڤیر hewîr/hevîr دروستبووە، کە لە عەرەبیدا کراوە بە "خمیر" و فارسیش وەریگرتووە.

Hewraz هەوراز /ئەرڤاز ervaz. هەوراز hewraz > هەور hewir + ئاز az. ئاز az کورتەی ئاست ast (← هەندەسە hendese) هەوراز hewraz > هەور ئاست hewir-ast. ئەرڤاز ervaz > ئرڤ erv + ئاز az. ئەرڤ erv لە ئەڤر evr ەوە هاتووە، بە گۆڕینی شوێنی دەنگەکان. ئەڤر evr هەور hewr ە.

Heywan هەیوان، کە لە کوردیدا بە شێوەی هەویان hewyan و هەی دۆ hey do ش هەیە، لە فارسیدا بووە بە أیوان eywan و عەرەبیش هەر بە شێوەی أیوان وەریگرتووە. لە بنەڕەتدا

پێوەندیی بە سەیوان seywan ەوە هەیە. دەنگی س s و ه h زورجار جێییەك دەگرنەوە. (سەرنجی سێ sê ی کرمانجی و هرە hire ی زازاکی بدە کە هەردووکیان مانایان (3) یە. هەروەها cent ی فەڕەنسی و Hundert ی ئەلمانی کە هەردووکیان مانایان "سەت" ە).

**Hêg** هێگ (← Hêlke هێلکە).

**Hêja** هێژا، واتە: گەورە و خاوەن پایە و خاوەن ڕێز. هێژا hêja لە وشەی ئاڤێستایی هوجەستە hu-ceste ەوە هاتووە کە بە مانای ← پیرۆز pîroz و باش bash و گوڵی هەمیشە بەهار gulî hemîshe behar ە. جەستە ceste لە کوردیدا بە مانای لەش lesh و گیان giyan دێ. هوجەستە huceste واتە: گیان بەرز giyan berz. وشەی "خجستە" ی فارسی لەمەوە وەگێراوە. وشەی هێژا hêja لە گەلێك زمانی ئەورووپاییدا، بە شێوەیەکی نێزیك لە هێژا heja هەیە. بۆ وێنە: هیوج huge (ئینگلیزی) کە بۆ گەورە و زل zil بەکاردێ هەروەها high بەرز و، hoch (هۆخ) ی ئەڵمانی کە بە مانای بەرز berz و بالا bala بەکاردەبرێ و، haut(e) ی فەرەنسی کە مانای بەرز berz ە.

**Hêlke** هێلکە/ Hêg هێگ. وشەیەکی هێندۆئەورووپاییی کۆنە بەمانای ← تۆو Tow (← xak خاك).

**Hêmin** هێمن/ هێون hêwin. هێمن hêmin لە هێم hêm و هێون hêwin لە هێو hêw ەوە هاتووە. کە هێم hêm و هێو hêw دوو وێنەن بۆ یەك وشە و، هەردووکیان بە مانای لەسەرخۆیی leserxoyî دێن. وشەی هێواش hêwash یش بریتییە لە هێو hêw + واش wash. واش wash (← واش

wash) وێنەیەکی دیکەی وەش
wesh و وەك wek ە. هێواش
hêwash مانای وەك
لەسەرخۆیی، بە چەشنێکی
لەسەرخۆ. بەکاوەخۆیی. وشەی
هێواش کەوتووەتە فارسی و
ترکییەوە هەر بەو مانایە. دیارە
لە وشەی واش wash دا
هێندەك جار دەنگی ش sh
دەبێتە س s و بە شێوەی وەسا
wesa (ئاوا awa، وەکی wekî)
دەردەچێ، واتە: هێواش
hêwash < هێوئاشا hêwasha
< هێوئاسا hêwasa کە ئاسا
asa و wesa بە مانای شێوە
shêwe، جۆر cor ە (خۆتاسایی
xotasayî واتە: بە شێوەی
خۆت be shêwey xot). دەبێ
ئەوەش بگوترێ کە وشەی هێور
hêwir بە مانای تەڕ teř یش
دێ، واتە: شتێك کە ڕەك rek و
هشك hishk نییەو، ڕەگی هێو
/hêw هێم hêm لێرەدا هەر
دەچێتەوە سەر نەرمی، چۆنکە
تەڕی و نەرمی دوو تایبەتکاری
نێزیك یەکن. سەرنجی وشەی
humeur ی فەڕەنسی بدە کە
مانای شلایی shlayî یە،
هەروەها humide کە مانای
تەڕ ter ە. هەروەها وشەی
ئینگلیزی humid (تەڕ) کە لە
لاتینیدا humidus و لە
یۆنانیدا "ύγ - ρός"ە.

**Hêz** هێز. دوو وشەی ئاڤێستایی هەن
کە پێوەندییان بە هێز hêz ەوە
هەیە، هەزەن گەهـ hezengeh
و هێزڤارنە hêzvarne.

**Hijin** هژن (← خەزێنە xezêne).

**Hindir** هندر، /هوندر hundir/
هەندرۆ hendro بە نێوەوەی
شتێك دەبێژن (بۆ وێنە:
هوندری خانی = نێوەوەی
خانی) بە ئاڤێستایی: (ئەنتەرە
entere و بە پەهلەوی:

ئەندەرۆن enderon ە و، لە فارسیدا بووە بە أندرون (أندر). لێرەدا سەرنجی وشەی inter ی لاتینی بدرێ کە بە مانای، نێوەوەی شتە. هەروەها وشەی هەناو henau لە هەنداو hendaw و هندرناو/ڤ hindirnaw/v ەوە هاتووە واتە: ناوی ناوەوە (نێوی نێوەوە).

**Hingav** هنگاڤ /هەنگاو hengaw، هنگاڤ hingav < هند hind (مقدار، بڕ) + گاڤ/و gav/w، هەندگاڤ و هندگاڤ، مانای بڕ (مقدار)ی کاتە. بەڵام هێندەك جار هەنگاو hengaw بە مانای شەقاو sheqaw < شەق sheq + قاو qaw < قاف qaf < گاڤ gav بەکاردێ واتە: کاتی شەقێك katî sheqêk کە بە عەرەبی (خطوة) یە. وشەی شەقام sheqam (جادە) یش هەر وێنەیەکی دیکەی sheqawەوە.

**Hînbûn** هینبوون/ فێربون fêrbûn (هوونبوون hûnbûn)

**Hîndar** هیندار (خوێندەوار xwêndewar) (← خێوەت xêwet ← هوونبوون hûnbûn).

**Ho** هۆ (← xizim خزم).

**Hocene** هۆجەنە (← Doxên دۆخێن) هۆجەنە hocene لە هۆچك بەنە hochik bene ەوە هاتووە. هۆچك hochik لە زمانی کوردیدا، بە داوێنی خوارەوەی مرۆڤ دەگوترێ. هۆجەنە واتە: ئەو بەنەی کە داوێنی خوارەوەی مرۆڤ بەنددەکا. هۆجەنە وشەیەکی سنەییانەیە. (← وەنجەنە wencene).

**Hogir** هۆگر (← هۆڤ **hov**)

**Homa** هۆما/ هوما **huma**/هۆمای **homay**. مانای خۆدێ **xodê** یە لە زمانی کوردیدا، کە لە شێوەزاری کرمانجکیدا بەکاردەبرێ. لەو شێوەزارەدا دەگوترێ: هۆمای زانۆ **homay zano** واتە: خۆدێ دەزانێ. هۆما < هۆ **ho** + ما **ma**، هۆ **ho** وێنەیەکی دیکەی خۆ **xo** یە. ما **ma** کاری رابوردووی "ماین **mayin**/مان **man** واتە: هەرخۆ مایە **her xo maye**. هۆما **homa** مەلێکی خەیاڵیشە کە بە زمانی لاتینی **phönix** ی پێدەڵێن. لە میتۆلۆژیای کوردیدا رەوان (روح)ی خۆدێ (هۆما) بەر لە وەی گەردوون دروست بکا، لە شێوەی مەلێکدا بووە و، گەردوون (گونْ) هەموو ئاو بووە، وشکایی و خۆر و مانگ و ستێرەکان نەبوون و، هیچ گیانەوەرێکیش نەبووە. ئەم باوەڕە لە میتۆلۆژیای ئێزیدی و یارسانی (کاکەیی) دا بە ئاشکرا دیارە، وەك لە پەرتۆکی پیرۆزی "جەلوە **celwe** و پەرتۆکە ڕەشە **meshef resh**" ی ئێزیدی و "شاهنامه حقیقت" ی یارسانییەکان کە لە سەرەتای سەتەی رابوردوودا نووسراوە. وادیارە ← سۆما **soma** کە رۆناکی و بیناییە، لەگەڵ هۆما **homa** دا یەك شت بن. چۆنکە دەنگی س **s** و هـ **h** جێی یەك دەگرن، بۆ وێنە هەسن **hesin** (ئاسن **asin**) بە فارسی "آهن **ahin**" ە و ئاسك **ask** بە فارسی آهو **ahu** یە، هەروەها وشەی سێ **sê** بە کرمانجکی: هێرێ **hêrê** یە. بێجگە لەوەش، ئێستە کورد بە خۆدێ دەبێژن "بینایی

چاوان"، که بینایی چاوان bînayîy chawan به تەواوی " سۆما" soma یە.

Hoqe هۆقه/ weqe وەقه، یەکەی کێشانی قورسایی شته. که له عەرەبیی نووسیندا بووه به "حُقَّة" و لەسەر زمانی عەرەبیی خەلکی عێراق وگییە wugyye یە. وشەکە بنەڕەتێکی هێندۆجەرمەنیی هەیە. بۆ وێنە: بە ئەلمانی بە تەرازوو دەگوترێ ڤاگە Waage و، Wäg بە شتێك دەگوترێ که قورسایی کەمێك پرتر بێ.

Hov هۆڤ، مرۆڤی زوردار zordar و ملهۆر milhor. هۆ ho وێنەیەکی دیکەی خوو xû (عادەت)ە. سەرنجی وشەی هۆگر hogir بدە که مانای خووگر xûgir ە (واته: کەسێك که هۆگری شتێك بوو، بەو شتەوە خووی گرتووە). ڤە ve کورتکراوەی ڤەلا vela یە که مانای قامچی qamchî یە. لە کوردیدا وشەی وەلە wele (ڤەلە vele) هەیە، که بۆ لێخۆڕینی گوێرەکە (گۆلك golik) بەکاردەبرێ. کەواتە: هۆڤ hov کەسێکە که خووی به قامچی وەشاندنەوە گرتبێ و، لە خەلك بخوڕێ وەك ئەوەی ← شوان shwan لە گۆلك golik دەخۆڕێ.

Horin هۆڕن، وشەکە ئینگلیزییە horn، واتە: دەنگێك بۆ هوشیارکردنەوە.

Hoz هۆز (← خزم xizim).

Hozan هۆزان > هۆ ho + زان zan. هۆ ho لە هۆنین honîn ەوە کورتکراوەتەوە. زان zan نێوی کارای چاوگەی زانین zanîn ە. واتە: کەسێك که دەزانێ چۆن

# H ه

وشە بهۆنێتەوە. وشەکە لە "وَزَان" ی عەرەبییەوە نەهاتووە. هەرچەندە وشەی "وزن" پێوەندیی بە "میزان" (تەرازوو)ەوە هەیە کە وشەی "میزان" بنەچەیەکی هیندۆئەوروپایی هەیە. سەرنجی وشەی measure ی ئینگلیزی و فەڕەنسی و maß ی ئەڵمانی و قاس qas ی کوردی بدە کە مانای "پێوان pêwan"ە.

**Hûnbûn** هوونبوون/ هین بوون hînbun مانای فێربوون fêrbûn ە. هوو hû و خوو xû یەك وشەن، دەنگی هـ h بووە بە خ x. مانای خووگرتن بە شتێکەوە. ← هۆگر hogir یش هەر خووگر xûgir ە. (← هۆڤ hov).

**Hûte** هووتە (هەو hew/ خەو xew). هووتە hûte خەوتە xewte یە، کە دەنگی هـ h بووە بە خ x.

**Hûn** هوون/ هۆن hon (ئێوە êwe) وشەی هوون hûn و هۆن hon وێنەیەکی دیکەی خوون xûn و خۆن xon > خۆ xo + ن n واتە: خۆتان xotan. هەر بەرامبەر ئەوەش وشەی هێت hêt هەیە لە کوردیدا کە بە مانای خۆت xot دێ. دەنگی هـ h و خ x زۆرجار جێییەکدی دەگرنەوە.

# ح Ĥ

**Ĥanût** حانووت، وشەیەکی کوردییە کەوتووەتە زاری عەرەبی و عیبری חָנוּת یەوە و بۆ دوکانی بچووك بەکاردەبرێ. بنەچەی وشەکە خانوو **xanû** + تك **tik**ە. واتە: خانووی بچووك، خانووتك **xanûtik** < خانووت **xanût** < حانووت **ĥanût**. هەروەها وشەی حانە **ĥane** ی عەرەبی، کە شوێنی خواردنەوەی مەیە (← مەی **mey**) لە خانە **xane** ی کوردییەوە وەرگیراوە. دەنگی ح **ĥ**و خ **x** زۆر جار جێییەك دەگرنەوە.

**Ĥel** حەل (کات **gav**/گاڤ/**kat**) ـ لەو حەلەدا **lew ĥeleda**. حەل **ĥel** لە هەل **hel** (← دەرفەت **derfet**) ەوە هاتووە. هێندەك جار دەنگی هـ **h** دەبێتە ح **ĥ**. (← **Ĥen** حەن).

**Ĥen** حەن (شوێن و کاتی تایبەتی ـ لە حەنی خۆیدا قسە بکا). حەن **ĥen** لە هەن **hen** ەوە هاتووە. هەن **hen** کورتکراوەی ← هەنگاو **hengaw** واتە: دەم **dem** و کات **kat**.

**Ĥeři** حەڕی (← قوڕ **quř**).

**Ĥêwet** حێوەت (← ئێوەت **êwet**).

**Ĥez** حەز/ هەژ **hej**. حەز **ĥez** لە خواز **xwaz** ەوە هاتووە. خواز **xwaz** < حواز **ĥwaz** < حاز **ĥaz** < حەز **ĥez**. وشەی حواز **ĥwaz** دەنگی ح **ĥ** کەوتووە لێی و بووە بە واز **waz** و ئەوجا باز **baz** (کۆترباز **kotirbaz** ـ کەسێك کە حەز لە کۆتر بکا، مێباز **mêbaz** کەسێك حەز لە مێینە بکا، واز واز **waz waz** ـ کەسێك کە هەر دەمەو حەز لە شتێکی دیکە بکا). بە گۆڕینی

# ح Ĥ

دەنگی ح ĥ و هـ h بۆ یەکدی و ز z و ژ j بۆ یەکدی وشەی حەز ĥez و هەژ hej بەیەك مانا دروستبوون.

**Ĥol** حۆل (مرۆڤی گێل mirovî gêl) (← حولحولی ĥulĥulî). حۆل ĥol لە فارسیدا بووە بە خۆل xul.

**Ĥulĥulî** حولحولی، بە کەسێك دەبێژرێ، کە نەخۆشییەکی دەروونی لەگەڵ بێ و، هەر دەمە لە سەر واز (← ĥez حەز) و فیکێك بێ، واتە: ← وازوازی wazwazî و دەمدەمی demdemî بێ. حولحولی لە خولخولی xulxulî یەوە هاتووە. واتە: کەسێك کە هەردەم بە جۆرێك خول xul بخوا (← خول xul) وشەی ← حۆل ĥol کەوتووەتە زاری عیبری. بە نەخۆشخانە دەگوترێ بێت خۆلیم בֵּת- חוֹלִ׳ם.

**Ĥunce** حونجە/حینجی ĥincî، بە سەر و بۆر و ژێر و زەنە دانان بۆ وشەی عەرەبی دەبێژن: حونجەکردن، بەتایبەتی ئەوە لە خوێندنخانە ئیسلامییەکانی کوردستاندا، کۆن باو بوو. حونجە ĥunce بەرامبەر ← سایە saye بەکاردەهێنرا، کە مانای خوێندنەوەی بێگرێوگۆڵی وشە و رستەکان بوو. حونجە ĥunce لە بنەڕەتدا لە هونجە hunce ەوە هاتووە، کە بنچینەی خونجە xunce یە. چۆنکە دەنگی خ x و هـ h لە کوردیدا بە زۆری جێییەك دەگرنەوە، وەك لە کوردی هەورامیدا دیارە. خونجە xunce ش وێنەیەکی دیکەی خوێندە xwênde یە (← خواجا xwaca).

**Ĥurmê** حورمیٚ/ هورمیٚ **hurmê** (نێوێکه بۆ بانگکردنی ژنان له لایەن مێردەکانیانەوە). وشەکە له حور **ĥur**/هور **hur** و، میٚ **mê** وه هاتووه، میٚ **mê** لێرەدا، دەبیٚ له من **min** ەوە هاتبیٚ. حور **ĥur**/هور **hur** (حۆری **ĥorî** /هۆری **horî** نێوێکه بۆ کچانی نێو بەهشت) واته: حۆریی من **ĥorîy min** (هۆری من **horî min**). وشەی حورمیٚ له عەرەبیدا بووه به "حُرمة"، به تایبەتی له زاری عەرەبیی خەلکی عێراقدا. ئەم وشەیه له بنەڕەتەوە، وشەیەکی هێندۆئەوروپاییه، بەڵام بۆ مەبەستێکی دی. بۆ وێنه: له زمانی ئەڵمانیدا وشەی هووره **Hure** بۆ ژنی رووسپی بەکاردەبریٚ، که له زمانی کۆنی ئەڵمانیدا بۆ ژنێك بەکاربراوه که له گەڵ پیاوانێك بنویٚ مێردی خۆی نەبن. له زمانی ئینگلیزیشدا **whore** هەیه که هەر بەو مانایه بەکاردەبریٚ.

**Ĥushtir** حوشتر (وشتر **wishtir**/ هوشتر **hushtir**) به ئاڤێستایی ئوشترە **ushtire** یه و به پەهلەوی ئوشتر **ushtir** ە و له فارسیدا بووه به شُتر **shutur**.

**Îqlîm** ئیقلیم، له وشەی یۆنانی کلیما κλίμα (Klîma) وه هاتووه، که به نێوچەیەکی جوگرافیایی دەگوترێ، به ئینگلیزی climate ه و clime ه، به ئەلمانی Klima یه. بەڵام ئێسته بۆ کەشوهەوا بەکاردەبرێ. وشەی کلیم Klîm بوه به هەلیم helîm و ئەوجا هەرێم herêm و له عەرەبیدا بووه به "حريم".

**Îshtîha** ئیشتیها (← Nashta ناشتا).

**Îsot** ئیسۆت (بەهاراتی تیژ beharatî tîj) < ئیس îs + سۆت sot. ئیس îs مانای هەڵبوون و پێبوون hel'bûn, pêbûn ه بۆ ئاگر و چرا و مۆم و ... هتد. (سەرنجی وشەی هەلگیرسا hel-gîr-sa داگیرسا da-gîr-sa. ئیسا îsa لێرەدا به مانای هەلگیرسان و پێبوون. سۆت sot له سووتان sûtan ەوه هاتووه. ئیسۆت به بیبەری زۆر تیژ دەگوترێ که هێندە تیژە، دەم و گەدە دەسۆتێنێ. وشەکه کەوتووەته زاری تركییەوە.

**Îsh** ئیش (← ئێش êsh).

**Îstîkan** ئیستیکان، پیالەی چایخواردنەوە Piyaley chayî xwardinewe، وشەکه له وشەی رووسی ستاکان стакáн ەوه هاتووه.

**Îstop** ئیستۆپ. ئامێری وەستاندنی ئۆتۆمۆبێل، یان دەزگەیەکی مۆتۆردار، وشەکه stop ی ئینگلیزییە.

# J ژ

**Jal'e** ژاڵە، بە سانسکریتی **jhardak** ە کە دوور نییە وشەی ژەهر **jehir** (ژار **jar**) لە مەوە هاتبێ، چۆنکە ژاڵە تاڵە وەك ژەهر. وشەی ژەهر **jehir** بە پەهلەوی: زەهر **zehr** ە کە لە فارسیدا هەر وەك خۆی بە شێوەی زەهر **zehr** بەکاردەبرێ.

**Jan** ژان، بە مانای ئازار و/ ← ئێش **êsh** دێ. لە ئاڤێستادا وشەی ژان **jan** مانای کوشتن **kushtin** و لێدان **lêdan** ەوادیارە وشەی ژەن **jen** کە وەك پاشگرێك دێ، بۆ وێنە: شمشاڵژەن **shimshal'-jen**، مەشکەژەن **meshke-jen**، هەر لەم وتەیەوە دێ، واتە: شمشاڵلێدەر **shimshal'-lêder** و مەشکەلێدەر **meshke-lêder**.

**Jehir/Jar** ژەهر/ژار (← ژاڵە).

**Jek** ژەك (← **Fiřnî** فڕنی).

**Jevek** ژەڤەك (نێوان **nêwan**، ناو دوو تشت، یان: ناو چەند شتێك). ژەڤەك **jevek** لە: ژ ـ هەڤ ـ یەك **je-hev-yek** ەوە هاتووە. کە هەڤ **hev** مانای هەموو **hemû** ەو، ژ **j** مانای لە **le** یە.

**Jêhatin** ژێهاتن، ژێهاتی **jêhatî** (بە مانای لێوەشاوەیی **lêweshaweyî**/لێوەشاوە **lêweshawe**). < ژێ **jê** + هاتن **hatin** < جێ **cê** + هاتن **hatin**. واتە: کەسێك کە لە جێی راستینەی خۆیدا بێ و ئەوەی لێهاتبێ.

**Ji** ژ، لە کوردیی باکووردا، جە **ce** لە کوردیی گۆرانیدا، بە پەهلەوی: هەچ **hech** ە و لە فارسیدا بووە بە أز **ez**.

**Jin** ژن، له ژین **jîn** و ژیان **jiyan** ەوە هاتووە، که وشەی ژین **jîn** و ژیان **jiyan** له زایین **zayîn** ەوە هاتووە، واته: گیانلەبەرێك که بزێ. ژن **jin** له ئاڤێستادا گنا **gina** و جەن **cen** ە و له پەهلەویدا: ژەن **jen** و له فارسیدا بووە به "زن" **zen** و زندگی **zendigî** مانای ژیان **jiyan** ە و به رووسی **женá** (ژنا) یه.

**Jineftin** ژنەفتن (ژنەوتن **jinewtin**/ ژنەوین **jinewîn**) به مانای بیستن **bîstin** و گوێلێبوون **gwêlêbûn** دێ و، له هێندەك زاری کوردیدا وەك: خانەقینی و هەورامانی بەکاردێ. به پەهلەوی: ئەشنووتەن **eshnûten** و شنەفتەن (**sheneften**)ە. له فارسیدا بووە به شنیدەن.

**Jîr** ژیر (← وەزیر **wezîr**).

# K ک

**Kaban** کابان (← کەڤانی **kevanî**).

**Kabra** کابرا (← **Gewre** گەورە).

**Kakil’** کاکڵ. ناوک **nawik**/ لە کا **ka** کە نیشانەی شوێن **shwên**/ جێ **cê** یە، (سەرنجی وشەی کایە **kaye** بدە (لەو کایەدا واتە: لەو شوێنەدا). کڵ **kil’** کر **kir** ە. کر **kir** مانای ناوک **nawik** ە. سەرنجی وشەی کڕۆک **kiřok** بدە کە بە مانای ناوک **nawik**ە. کەواتە کاکڵ **kakil** مانای جێی نێوەوەی شتێك.

**Kal’a** کاڵا، کە بۆ قوماش و/ ← کەرەسە **kerese** ی خاو بەکاردێ، لە ← کاڵ **kal’** ەوە هاتووە، واتە: بەکارنەهێنراو، پێنەگەیشتوو، دەستلێنەدراو، تەڕ، ← فەریك **ferîk** سەرنجی وشەی ← **kishtukal’** کشتوکاڵ (کشت و کاڵ) بدرێ (← گەلا **gela**).

**Kalyar** کالیار، بە هاروو **harû** (← خەیار **xeyar**) ی گەورە و زەردبوو دەگوترێ. کالیار **kalyar** > کال **kal** (واتە: پیر **pîr** و گەورە **gewre**) + یار **yar** (کورتکراوەی کال ـ خەیار **kal xeyar** (← خەیار **xeyar**) ە. واتە: خەیاری پیر **xeyarî pîr**.

**Kam** کام (← کاوخوە **kawxwe**).

**Kamp** کامپ (← قامووس **qamûs**).

**Kamyon** کامیۆن. وشەکە فەڕەنسییە **camion** و بەمانای لۆری **Lorî** یە. (← **Lorî** لۆری).

**Kanî** کانی، لە خانیە **xanye** ی ئاڤێستاییەوە هاتووە.

**Kanîn** (← **qarîn** قارین).

**Kar** کار، بە سانسکریت: کاریە **karye** و بە پەهلەوی: کار **kar** ە.

**Kardanik** کاردانك/ منداڵدان **mindal'dan**. کار **kar** لە زمانی کوردیدا بە مانای بێچوو **bêchû** ش دێ. دان/ك **dan/k** جێ و شوێن. کاردانك واتە: جێی بەچکە **cêy bechke**.

**Kareba** کارەبا/ **Kariva** کارڤا. ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا بۆ ئەو پسپسۆك (تەزبیح)انە بەکارهێنراوە کە هێزی راکێشانی کایان هەیە. بەمەیان گوتووە کا ـ رڤە **ka-rive** واتە: کارفێن **ka-rifên**. لە عەربیدا کراوە بە "کهرباء".

**Karêjî** کارێژ(ی)، بە ئاوهاتنەوەی پیاو دەگوترێ لە کاتی کاری سێکسیدا. کا **ka** لە کاو **kaw** (ئارەزوو **arezû**) ەوە هاتووە. کارێژی مانای رشتنی حەز و ئارەزوو.

**Kariva** کارڤا (← کارەبا **kareba**).

**Karîn** کارین (← **qarîn** قارین).

**Karwan** کاروان، لە بنەڕتدا و لە پازەندا بە شێوەی کارڤان **karvan** ە. کە کار لێرەدا مانای لەشکر و جەنگ و، ـ ڤان **van** یش پاشگری بکەرە. بەڵام لە دواییدا بۆ قافڵە بەکاربراوە. ئەم وشەیە کەوتووەتە زمانە ئەوروپاییەکانەوە. سەرنجی وشەی **karavane** ی ئەڵمانی بدرێ، کە فەرهەنگی **Duden** ی ئەڵمانی وشەکە دەباتەوە سەر فارسی، لە کاتێکدا وشەکە پازەندە. پازەند **pazend** فارسی نییە، بەڵام دیارە هەموو شتێکی کۆنی کورد و ئێرانی لە لایەن ئەوروپاییەکان و فارسەکانەوە کراون بە فارسی.

**Kase** کاسە، بە گڵێنە **gil'êne** و ← قاپ **qap** دەبێژن کاسە **kase**.

**کاسه kase** وشەیەکی کۆنی هێندۆئەوروپاییە. بە قاپ و سنووقی (← سندووق sindûq) پارە بە ئەڵمانی دەبێژن: kasse و بە پارەی دەستی کە بدرێ بە نرخی کرینی شتێك بە ئینگلیزی دەگوترێ: cash بە عەرەبی (نقد). وشەی کاسە kase لە عەرەبیدا بووە بە کأس.

**Kawan** كاوان (← کەڤانی kevanî).

**Kawêj** كاوێژ (← قاوت qawit، ← جوون cûn).

**Kawis** كاوس، نێوی پیاوانەیە لای کورد. < كاك kak + وس wis. وس wis لە وێس wês (وێسف wêsif)، یان لە وەیس weys ەوە هاتووە.

**Kawxwe** كاوخوە (بە کاوخوە کاربکە، واتە: لە سەرخۆ، بە ئارەزووی خۆ کاربکە). کاو Kaw وێنیەکی دیکەی کامە kame ی ئاڤێستاییە کە مانای ئارەزوو arezû ە و، لە فارسیدا بووە بە: کام kam. وشەی کام kam لە کوردیدا هەر بە مانا ئاڤێستاییەکەی بەکاردێ. دەگوترێ: "خواردنەکەی لە بەردەم مندا خوارد، بەشی منی نەدا، کامکرد kamim-kird" واتە: ئارەزوومکرد arezûm kird، حەزمکرد لێی ĥezim kird lêy (← حەز ĥez).

**Kaxez** کاخەز، وشەیەکی چینییە کەوتووەتە گەلێك زمانەوە.

**Kech** کەچ، (← کچ kich).

**Kech** کەچ (ناڕاست nařast، خوار xwar، کۆڵ kol’). کەچ و کۆڵ kech û kol’ وێنەیەکی دیکەی کەل kelە. عَوَج (عوُج) ی عەرەبی لە کەچ kech ەوە هاتووە. لە کوردیدا کەچ مەچ

kech mech (كەژ مەژ kejmej) هەیە کە عوج و معوج ی عەرەبی لە مەوە هاتووە. هەروەها سەرنجی وشەی گۆج goc یش بدرێ کە هاوڕەگی ئەمەیە. وشەی گۆج goc بە شێوەی عِوَج کەوتووەتە قورئانەوە. (قرآناً عربياً غيرِ ذي عِوَج.. 28 ك الزمر 39).

kech mech کەچ مەچ (کەژمەژ kejmej) ← کەچ kech.

Keftyar کەفتیار/ کەمتیار kemtyar هەردووکیان یەکمانان و، نێوی چوارپێیەکن. لەسەر دەمی کۆندا کورد پێیانوابووە کە کەمتیار زۆر حەز لە ئاوازی مۆسیقا دەکات و، بەوە راویانکردووە و گوتوویانە:"کەمتیار پیاوێکی چاکە، قولە پێی بسمیت دەنگ ناکا" وشەی کەم ـ تیار -kem tyar لە کەم ـ تەر kem-ter ەوە هاتووە کە کەم ـ تەر ـ کردن kem ter kirdin مانای دەم ـ بەستنەوەیە. (سەرنجی وشەی قەمتەرکراو qemterkiraw بدە). کەفت keft لە وشەی کەفتیار keftyar دا لە کەفتن /keftin کەوتن kewtin ەوە هاتووە، واتە: خستن بە زەویدا xistin be zewîda پاش کەمترکردن. وشەکە وەك خۆی بە شێوەی کەفتار(کفتار) کەوتووەتە فارسییەوە.

kel کەل، لە زمانی کوردیدا بەچیا و شوێنی بەرز دەگوترێ کەلkel و، بە بورجەکانی ئاسمانیش دەگوترێ کەلو kelu. لە سەر دەمی کۆندا، لە بەری خۆرهەلاتی باشووری بەغدا شوێنێك بووە بە نێوی"کەلوازی kelwazî" کە ئەمە وشەیەکی

کوردییە ومانای قەلای کراوەیە، واز waz لە کوردیی فەیلیدا مانای کراوەیە، وە we (کە لە کوردیی باکووردا ڤە ve یە و دەکەوێتە پێش وشەکەوە (ڤەکری/vekirî کراوە kirawe) ئەو ـ وە we یە لە واز waz ەوە هاتووە. واز waz بووە بە وەز wez ئەوجا وە we کە لە فارسیدا بووە بە باز baz. دوور نییە ئەو شوێنەی کەئێستە کوردەکانی بەغدا بە عەلوازییە و عەرەبەکان بە عیواضیة نێوی دەبەن و، نازانن وشەکە لە کوێوە هاتووە، ئەوە هەر ئەو کەلوازی kelwazî یە بووبێ. کەلوازی kelwazî > ئەلوازی elwazî > عەلوازی élwazî > عیواضیة. هەروەها وشەی ← قەلا qela قەلات qel'at پێوەندیی بە وشەی کەل kel و کەلو kelu ەوە هەیە و، وشەی قلعە ی عەرەبی لە مەوە هاتووە. کە لە کوردیدا وشەی کەلات kelat یش هەیە کە بۆ قەلات qelat بەکاردێ.

**Kel'eget کەڵەگەت**، واتە: مرۆڤی باڵا بەرز. ← کەل kel/ کەڵ kel' (سەرنجی وشەی کەل و کەژ بدرێ) مانای بەرز و بلندە. کەڵەکە بەرد واتە: بەد لە سەر بەرد هەڵچنراو و بەرزکراو. گەت get و کەت ket یەك وشەن. دەگوترێ کابرایێکی کەتە kete بوو، واتە: زل zil بوو.

**Kelegî کەلەگی**، بە ژوورێك دەگوترێ کە لە تەنیشت، یان لە پشت هەیوان (← هەیوان heywan) ی ماڵێکەوە بێ. کەلەگی kelegî
> کەل kel + ـە e + گی gî. کەل kel و کێل kêl لە کوردیدا مانای تەنیشت tenîsht ە. کێلی

گۆڕ kêlî goř ئەو بەردەیە کە لە تەنیشت، یان لای گۆڕەوە دادەچەقێنرێ، یان دادەنرێ. لە کوردیی باکووردا کێلەك kêlek مانای "تەنیشت"ە. کەلەکە keleke و کێلەکە kêleke کە هاومانان، بە لای تەنیشتی بەشی سەرەوەی لەشی مرۆڤ دەگوترێ. لێرەدا دەبێ سەرنجی ئەوە بدرێ کە دەنگی ك k و گ g زۆر جار لە جێییەك دادەنرێن. بۆ وێنە: لە کوردیی فەیلی دا باوك bawik دەبێتە باوگ bawigو باشەکە basheke دەبێتە باشەگە bashege.

Kel’ek کەڵەك/ کەلەهەك kelehek بە کۆمەڵە بەردێك دەگوترێ کە خرابنەتە سەریەك. کەل kel لە زمانی کوردیدا بە چیا chya ش دەگوترێ. کەڵەك kel’ek > کەل kel + ـەك ek (نیشانەی گچکە کردنەوە)، کەڵەك kel’ek واتە: کەل (چیا) یەکی گچکە kel (chya) yekî gichke.

Keleke کەلەکە/ کێلەکە kêleke (← کەلەگی kelegî).

Kelepûr کەلەپوور (میرات، شتی لە پاش مردوو بەجێماو). کەلەپوور kelepûr لە کەل kel (ناتەواو natewaw) وپر pir (تەواو و زۆر tewaw û zor) ەوە هاتووە. کەلوپر kelûpir لە زمانی کوردیدا بۆ شڕەوپڕە shiřewpiře یەك بەکاردەبرێ کە لە کەسێك بەجێدەمێنێ. وشەکە هەر بەو شێوەیە کەوتووەتە فارسییەوە.

Kelu کەلو (بورجی ئاسمان) (← کەل kel).

Kelupel کەلوپەل (شتومەکی کەسێك یان هی نێومالێ). ← کەل kel (شتی ناتەواو) پەل pel > پەر

per < پار par < پارچە parche ەوە هاتووە. (پارچەی شتومەك).

kem كەم/ كێم kêm (بەشێكی بچووك لە شتێك). بە پەهلەویش هەر: كەم kem ە.

Kemer كەمەر (← كەڤر kevir/كەور kewir).

Kemîn كەمین (← هەوا hewa).

Kenal' كەناڵ، وشەیەكی ئەوروپاییە. بە لاتینی Canalis و بە ئەڵمانی Kanal و بە ئیتالی Canale بە ئینگلیزی Channel و مەبەست لەو لوولەیەیە كە ئاوی پێدا دەڕوا. لە عەرەربیدا بووە بە "قناة".

Kenar كەنار (لێواری زەریا lêwarî zerya). لە كن kin + ئار ar ەوە هاتووە. كن kin مانای لا la/تەنیشت tenîsht/نك nik/كێلەك kêlek ە. ئار ar لە ئارا ara وە هاتووە، كە مانای جێ cê/شوێن shwên ە. كەنار kenar < كن ئار kinar واتە: لای/تەنیشت/ كنی/ئەو شوێنە kin schwên/lay schwên. هەروەها لێوار lêwar لە لێو lêw + ئار ar ەوە هاتووە، واتە: لێوی ئەو شوێنە lew/vî ew shwêne.

kenîshk كەنیشك (← كچ kich).

Kepir كەپر (← چەتر chetir).

Kepû/kepo كەپوو/ كەپۆ (لووت lût، بێڤل bêvil) ← قەپۆز qepoz.

Ker كەر (چوارپێ chwarpê/ گوێدرێژ gwêdirêj) لە سانسكریتدا كەرە kere و لە ئاڤێستادا xere یە و كەر ker، بە پەهلەوی و فارسی خەر (خر xer)ە، وشەی خەر xer و هەر her یش لە هێندەك شێوەزاری كوردیدا بەكاردەبرێن.

**Ker** کەر، مرۆڤی گەوج و کەمهۆش، کەر ker لە ← کەل kel و ← کەچ kech ەوە هاتووە بە گۆڕینی دەنگی ل l بۆ ر r. کەر ker بە مانای ناتەواو (← کەل kel) ەو، پێوەندیی بە ← کەر ker ەوە، کە (ئاژەڵ ajel’) ە، نییە.

**keř** کەڕ، کەسێکە کە گوێی وا گران بێ هیچ نەبیستێ. کەڕ keř لە کڕ kiř ەوە هاتووە. کڕی kiřî واتە: بێدەنگی و نەجووڵان. (مریشکەکە کڕکەوتووە واتە: دانیشتووە لەسەر هێلکەکانی و بێدەنگە و ناجووڵێ. هەر لەمەشەوە وشەی کڕۆك kiřok هاتووە کە بۆ "جماد" ی عەرەبی بەکاردەبرێ، بەرامبەر رووەك (نبات) و ئاژەل (حیوان) و مرۆڤ (أنسان). وشەی کەڕ بە پەهلەویش هەر: کەڕ keř ە.

**Keramat** کەرامات، لە وشەی "کرامة" ی عەرەبییەوە نەهاتووە کە بە مانای ئاوڕوو awřû دێ. بەلکو لە وشەیەکی یۆنانییەوە هاتووە کە لە لاتینیشدا بە شێوەی کاریزما charisma یە و بریتییە لە بەهرەی تایبەتی و بلیمەتیی کەسێك بۆ لێکدانەوەی شت. کاریس charis ژنە خودێی کۆنی یۆنانی کە زات و ورەی بە خەلك بەخشیوە. وشەی کاریزما لە ئەڵمانیدا هەروەك charisma و بەو مانایە بەکاردێ.

**Kere** کەرە/ کەرۆ kero لە/← چەور chewir ەوە هاتووە. (← چەرەس cheres).

**Kerese** کەرەسە/ کەرەستە kereste. لە: کار رستە kar riste ەوە هاتووە. (← کار kar). رستە

riste له رستەك ristek ەوە هاتووە. رستی ristî له زمانی کوردیدا بۆ بنچینەی خانوو وبناخه (← بناخه binaxe) بەکاردەبرێ. کار رسته (کەرەسته، کەرەسه)واته: ئەو شتانەی که بۆ سەرەتای کارێك بەکاردەبرێن. وشەی راستی rastî که به بنچینه (أصل) دادەنرێ پێوەندیی به وشەی رستی ristî یەوە هەیە. هەروەها وشەی رستن ristin/ رسین risîn واته: چەند شتێك پێکەوە دەرێسرێن و، واته: پێکەوە بنیات دەنرێن، پێوەندیی بەم وشەیەوە هەیە.

Kerewiz کەرەوز/ کەرپەس kersep کەرسەپ /kerpes شینابییەکە دەکرێ به ← زەلاته zelate. ئەمەش هەر وەك زۆربەی هەرە زۆری شیناییەکانی دیکه، له زمانی کوردیدا، به که ke، یان به کا ka، یان به ك ki دەستپێدەکا. بۆ وێنه: کەوەر kewer، کاهوو kahû، کەلەرم kelerim، کەدو kedu، کاڵەك kal'ek، کنگر kingir. فەرهەنگی فارسی موعین (معین) دەنووسێ: وشەی کەرەوز kerewz عیبرییه. بەڵام نابێ عیبری‌بێ و له عەرەبیدا بووبێ به کرفس، ئەوەته وشەی لاتینی curnus که جۆرە گیایەکە له عەرەبیدا بووه به "کرنوس". وشەی کەرەوز (کرفس به عەرەبی) به لاتینی Apium graveolens ە، که وشەی گراڤیۆلێنس زۆر له وشەی کەرەوز ی کوردی و کرفس ی عەەرەبی نێزیکه.

Kerkûk کەرکووك (← geřek گەڕەگ).

# K ک

Kerwêshk کەروێشک/ کەرۆشک
keroshk لە کەر گوێچک ker
gwêchk و کەرگۆچک
kergochkەوە هاتووە واتە:
گوێچکەکانی وەک گوێچکەی کەر
وانە.

Kesek کەسەک/ کەستەک Kestek
بە قفلی دەرگە دەگوترێت.
هەروەها بەو جۆرە شتانەش
دەگوترێ کە توندکراونەتەوە و
قالبیانگرتووە. کەستەک
Kestek > kest + ـک ek ـ
(نیشانەی گچکەکردنە). کەست
kest وێنەیەکی دیکەی خەست
xest ە واتە: توندکراوە و بەرەو
رەکبوون چوو. کە خەست xest
خۆی لە سەخت sext ەوە
هاتووە بە گۆڕینی شوێنی
دەنگەکانی وشەکە. سەخت sext
بە مانای گران giran و
زەحمەت بۆ پێداچوون و گرتن
دێ.

Keshkejno کەشکەژنو، لە: کاسەکی
ئەژنو kasekî ejno وەوە
هاتووە، واتە: کاسەی بچووکی
ئەژنو (کاسۆلکەی ئەژنو
kasolkey ejno). (← کاسە
kase).

Keshkol’ کەشکۆڵ، لە: کاسە ـ کۆڵ
kase-kol’ (کاسەی کۆڵ kasey
kol’) ەوە هاتووە (← کاسە
kase، ← کۆڵ kol’).

Kete کەتە (← کەڵەگەت kel’eget).

Ketîre کەتیرە، جۆرە ← سریش
sirîsh ێکە کە درەخت
ئێقیدەکاتەوە و بۆ پێکەوە
نووساندنی شت بەکاردەبرێ.
ئەم وشەیە ئاڤێستاییەو، ژەتەرە
jetere یە کە لە فارسیدا بووە
بە ژد (ژەد jed). و زاری فارسی

وشەی کەتیرە ketîre و کەتیرا ketîra ی کوردیش بەکاردەبا.

Kevanî کەڤانی/ کاڤانی /kavanî ← کابانی kabanî، بە ژنی ماڵ دەگوترێ. کەڤ/ کاو kaw لە: کانیا kanya ی سانسکریتییەوە (← کچ kich) ەوە هاتووە، کە مانای مێینە mêyîne دەدا بۆ رێزلێگرتن. ـ انی anî ـ کورتەی خانی xanî (خانوو xanû) ە. واتە: ژنی گەورەی ماڵ jinî gewrey mal'. کە کاوان kawan یش هەر هاومانای ئەوەیە.

Kevir کەڤر/ کەور kewir/ بەرد berd. وشەکە لە کەڤەر kever/ کەوەر kewer ەوە هاتووە، مانای بەندەلانی چیا (کێو kêw) دەگەیەنێ، واتە: کەمەری شاخ، کە کەمەر kemer و کەڤەر kever و کەوەر kewer هەر یەك رەگیان هەیە. هەروەها وشەی کوچك kuchk کە بەردی بچووکە لە کەڤرچك kevirchik ەوە هاتووە. ـ چك chik ـ پاشگرە بۆ کچکەکردن. (← قوفر qofir).

Kew کەو، لە: "کەوی kewî" یەوە هاتووە. "کەوی kewî" رەنگی شینی کاڵە، واتە: رەنگی بۆر bor بەم جۆرە کۆتر kotir/ کەڤۆك kevok واتە: کەویتر kewîtir بۆرتر bortir ئەمەیان لێکدانەوەیەکە. لێکدانەوەیەکی دیکەش هەیە ئەویە کەوی kewî واتە: ماڵی، بە کەسێکی رام/ بوو، یان بە مەلێکی رام/ بوو دەگوترێ: کەوی kewî. کۆتر kotir یش بەم پێیە، واتە: رامتر ramtir ماڵیتر mal'îtir. وشەکە لە سانسکریتدا کەپینجەلە

# K ك

kepîncele یە کە لە فارسیدا بووە بە کەبك (کبك) kebk و لە عەرەبیدا قبج.

kewsh کەوش، بە پەهلەوی: کەفش kefsh ە و، لە فارسیدا وەك کفش kefsh بەکاردێ.

Keyna کەینا (⟵ کچ kich).

Keys کەیس وشەکە case ی ئینگلیزییە، کە بە مانای بارودۆخ و چۆنێتی دێ. بەفەڕەنسی casە، کە بەشێوەی کا ka دەردەبڕدرێ و هەر بەو مانایەیە.

kezeb کەزەب (جگەر ciger/جەرگ cerg). کەزەب kezeb لە: کال بەز kalbez ەوە هاتووە. کال kal لە: ڕەنگی کال rengî kal ەوە دێ، کە جۆرە ئاڵ al' ێکە. وشەی بەز bez بە گۆڕینی شوێنی دەنگەکانی تیپەکە، بووە بە زەب zeb. بەز bez چەوریی نێو زکی چوارپێیە. کەزەب kezeb واتە: بەزێکی ڕەنگ کاڵ. وشەی کبد (جگەر)ی عەرەبی لە کالبەزەوە هاتووە بە گوڕینی دەنگی ز z بۆ د d. هەر بەم جۆرە وشەی قلب (دل dil/زەرت zert) لەم کالبەز kalbez ەوە هاتووە، کە بە زمانی ئێرانیی کۆن کالبود kalbod ە. کورد دەبێژن: کەزەب شەوات kezeb shewat واتە: جگەر سووتاو ciger sûtaw.

Kêbil' کێبڵ. بە ئینگلیزی cable و بە فرەنسی câble و بە ئەڵمانی kabel ە. جۆرە گوریسێکی ئەستووری زۆر قایمە.

Kêl کێل (⟵ باخەڵ baxel'، ⟵ کەلەگی kelegî).

Kêlek کێلەك / کەلەك kelek (⟵ باخەڵ baxel'، ⟵ کەلەگی kelegî).

Kêr کێر (⟵ چووك chûk).

Kêrd کێرد/ کارد kard (⟵ چووك chûk).

Kich كچ، له زمانی کوردیدا گه‌لێك وشه هه‌ن بۆ كچ kich وه‌ك: كه‌چ kech، کیژ kîj، كه‌نیشك kenîshk، قیز qîz، چه‌نا chena، كه‌ینا keyna، كناچه kinache، كه‌نی kenî،... هتد. وشه‌ی كچ kich و هه‌موو وشه‌كانی دیكه‌ش له وشه‌ی سانسكریتی kenya وه هاتووه كه به مانای (← ژن jin) یان، مێیینه mêyîne یه و به په‌هله‌وی به ژنی گه‌نج jinî genc ده‌گوترێ kenîch (سه‌رنجی وشه‌ی كناچه kinache ی كوردیی هه‌ورامی بده). وشه‌ی کیژ kîj به شێوه‌ی كز kiz/ قز qiz چووه‌ته زاری توركییه‌وه. ده‌نگی چ ch له كه‌چ kech و كچ kich دا و چه che له كناچه kinache دا، هه‌روه‌ها ده‌نگی زz له قیز qîz و ژ j له کیژ kîj دا بۆ كچكه كردنه‌وه‌ی خۆشه‌ویستییه. ز z و ژ j وێنه‌یه‌كی دیكه‌ی چ ch ن. (← كه‌ڤانی kevanî/ كاڤانی kavanî).

Kifte كفته/ كفتك kiftik. له كوته‌ن kuten و كوتان kutan و كوتاندن kutandin ه‌وه هاتووه. كفته kifte (كفتك kiftik) خواردنێكه له ساڤار savar و برنج و گۆشتی كوتراو و نۆك و به‌هارات دروستده‌كرێ و له‌گه‌ڵ یه‌ك ده‌كوترێن. كوتان kutan و كوتاندن kutandin وێنه‌یه‌كی دیكه‌ی (كڤتان kivtan و كڤتاندن kivtandinه كه به‌م شێوه‌یه‌ی له كوردیی ئه‌ورۆدا به‌كار ناهێنرێ، به‌لام وێنه‌ی له هێنده‌ك وشه‌دا ماوه، بۆ وێنه: كفتیی له‌ش kiftîy lesh واته:

داهێزاویی لەش و، وەك ئەوەی کوترابێ. تەنانەت بەفری تۆپەڵکراو بە کوردی "کوتە"ی پێدەڵێن کە ئەمە کفتە **kivte** و کفتە **kifte** یە. کوتە گۆشت **kute gosht** یش لە کفتە گۆشت **kifte gosht** ەوە هاتووە واتە: گۆشتی کوتکراو/کوتراو **.kutkiraw/kutraw** وشەی کفتە **kifte** کەوتووەتە فارسی و ترکییەوە، کە بە ترکی بووە بە **.küfte**

**Kil'** کڵ، شوێنی سۆرکرنەوەی ← سواڵەت **swal'et**ە.

**Kila** کلا/ کلاکەوتن **kilakewtin** (دوورە و پەرێز بوون). کلا **kila** لە کن لا **kin-la** وە هاتووە. کن **kin** و نك **nik** مانای تەنیشت**tenîsht** ە. (لە کن من **le kin min**، لە نك من **(le nik min** کلاکەوتن **kilakewtin** واتە: کن لا کەوتن **kin la kewtin**، تەنیشت کەوتن **tenîsht kewtin**.

**Kilam** کلام، لە زمانی کوردیدا بە مانای جۆرە گۆرانییەك دێ. کلام **kilam** لە"کلام"ی عەرەبییەوە، کە بە مانای قسەکردنە، نەهاتووە، بەڵکو وشەیەکی هێندۆئەوروپاییی کۆنە. سەرنجی وشەی **klang** ی ئەڵمانی بدرێ، کە بە مانای ئاواز **awaz**ە و **klingen** دەنگدانەوە و ئاوازلێدەرکەوتنە. هەروەها وشەی **clang** (کلانگ) ی ئینگلیزی کە بە مانای دەنگلێوەهاتنە و، وشەی ئینگلیزی **clandestine** کە مانای بە دزێوە و لە ژێرەوە و بە بێدەنگی کارکدنە.

**Kil'ash-dum** کلاش دوم (← دوپشك **dupishk**). کڵ **kil'** لە کوڵ **kul'** ەوە هاتووە، واتە: ← کورت **kurt**. دوم **dum** واتە:

کلك kilk، کلاّش دوم kil'ash- dum واتە: جانەوەرێك کە خاوەنی کلکێکی کورتە. دوڤ duv و dûg دووگ و dum دوم، هەرسێکیان بنچینەیان یەکە و مانایان کلك kilk ە.

Kl'awrojne کلاّورۆژنە (← رۆناك ronak، ← rûnak رووناك).

Kilir کلر، بە شوێنی ← کلیل/کلیت kilîl/kilît دەگوترێ لە دەرگەدا. کلر kilir > کل kil + ـر ir. کل kil لە کلیل kilîl (کلیت kilît) ەوە هاتووە. ـر ir لە: رێ rê ەوە هاتووە، واتە: کلیل رێ kilîl-rê رێی کلیل kilîl /rêy شوێنی کلیل kilîl shwênî، کونی کلیل kunî kilîl.

Kilîl کلیل/ کلیت kilît وشەیەکی کۆنی هێندۆئەوروپاییە، کە لە زمانی فەڕەنسیدا clé و clef ن و بە ئینگلیزی key و بە رووسی ключ کلووچ وبە ئەڵمانی schlüssel و لە فارسیدا بووە بە کلید kilîd. عەرەبەکان وشەی کلید kilîd یان کردووە بە: إقليد. لە زمانی کوردیدا هێندەك وشە هەن کە پێوەندییان بە کلیل kilîl ەوە هەیە. بۆ وێنە بە پەنجەتووتەلە pence tûtele دەگوترێ قلیچك qilîchk. قل qil ← پەنجە pence ەیە و ichk– پاشگرە بۆ بچووککردنەوە. هەروەها وشەی تلی tilî لە زمانی کوردیدا مانای پەنجە pence یە، کە قلی qilî و تلی tilî نێزیکی یەکن بە گۆڕینی دەنگی ق q و ت t بۆ جێییەك. بێجگە لەوەش، وشەی قلیل qilîl هەیە بۆ شتێك کە کونی تێبووبێ، وشەی قلێش qil'îsh هەیە بۆ درز کە قلیچك qilîchk ە.

Kilk کلك (← قەڵەم qel'em).

**Kil’om** کلۆم/ کولۆم **kul’om** (← قەڵەم **qel’em**).

**Kilor** کلۆر/ **Kulor** کولۆر نێو بۆش **nêw bosh**، ناڤ ڤالا **nav vala**، کولۆر **kulor** لە: کول **kul** + وار **war** ەوە هاتووە. کول **kul** و کون **kun** یەك رەگیان هەیە، کول وار **kul war** کون وار **kun war** ە، واتە: شتێك کە کونی تێدابێ. (سەرنجی: دانی کولۆر **danî kulor** بدە، دانێك کە کونی تێدابێ.

**Kiltûr** کلتوور (کلدان **kildan**/ جێی کل لێدانان **cêy killêdanan**) > کل **kil** + توور **tûr**، توورك **tûrik** کورتکراوەی توور **tûr**ە واتە: توورەکەیەکی کچکە. کلتوور **kiltûr** واتە: کلدانێکی کچکە. توورەکەیەکی کچکە بۆ کل.

**Kin** کن (لە کن **le kin**/ لە لا **le la**/ لە نك **le nik**) کن **kin** لە جێگۆڕکی دەنگی وشەی نك **nik** ەوە هاتووە کە نك **nik** کورتکراوەی نێزیك **nêzîk** ە. (← باخەڵ **baxel’**). سەرنجی وشەی ئینگلیزی **kin** بدرێ کە مانای خزم **xizim** ە.

**Kinache** کناچە (← کچ **kich**).

**Kiřandin** کڕاندن، وشەیەکی هێندۆئەوروپاییی کۆنە، سەرنجی وشەی ئەڵمانی **kratzen** و ئینگلیزی **to scratch** بدرێ کە بە مانای کڕاندن دێن. دوور نییە وشەی خوران **xuran** و خوراندن **xurandin** کە بە نینۆکهانین بە پێتدا دەگوترێ پێوەندیی بنەڕەتیی بە کڕان **kiřan** و کڕاندن **kiřandin** ەوە هەبێ. ئەگەرچی لە پەهلەویدا وشەی خار **xar** بۆ درك **diřk** هەیە. هەروەها وشەی خوران و خوراندن بە شێوەی خاران و خاراندن کەوتووەتە فارسییەوە، بەڵام دەنگی ك **k** ی کوردی

زۆرجار لە فارسیدا دەبێتە خ x (سەرنجی وشەی کەر ker و کڕین kiřîn لە زمانی کوردی و خر xer و خریدن xerîden ی فارسی بدرێ.

**Kird** کرد. وشەیەکی شێوەزاری زازاکی و دملی یە، کە لە بنەڕەتدا مەبەست لە زمانی کوردی **kurdî** یە. **kirdasî** کرداسی. ئەو کوردانەی بە شێوەزاری زازاکی و دملی (← **kird** کرد) قسە دەکەن بە شێوەزاری کرمانجی دەبێژن کرداسی **kirdasî** و بەو کوردانەش دەبێژن کرداس **kirdas** (کرداس لە کورد ئاسایی **kurdasayî** یەوە هاتووە، واتە: وەك کوردی **wek kurdî**).

**Kirîf/v** کریف/ڤ/ کرێف/ڤ **kirêf/v.** ئێزدییەکان بەکاری دەهێنن بۆ نێونانی ئەو کەسەی کە منداڵی یەکێکی دیکەی لە باوەشدا خەتەنە کرابێ، هەروەها بۆ دۆست و خزمیش بەکاردەبرێ. لە پەهلەویدا وشەی کەرپەك **kerpek** هەیە بۆ پاداش (ثواب) ی کاری باش.

**Kirmanc** کرمانج/ **Kurmanc** کورمانج. وشەیەکی دیکەیە بۆ نێوی ← کورد **kurd**. هەر لەبەر ئەوەیە بە زمانی کوردی دەگوترێ زمانی کرمانجی **zimanî kirmancî**. ئەگەر چی، جاروبار و بە هەڵە تەنێ بۆ شێوەزاری کوردیی باکوور بەکاردەبرێ. هێندەك جار بەشێوەی کرماج **kirmac** دەردەبڕدرێ. کرمانج لە هێندەك جێی کوردستان نێوێکە بۆ خەلکی گوند و دەرەوەی شار. لەبارەی بنەچەی ئەم وشەیەوە، رۆژهەڵاتناسی رووس ڤلادیمیر مینۆرسکی (1877ـ1966) پێیوایە کە وشەی کرمانج

# K ك

kirmanc له کورد ـ ماد
kurd-mad ەوە هاتووە کە
"کوردەمادەکان" دەگرێتەوە.
خاوەنی ئەم وشەنامەیەش ئەو
بۆچوونەی بەلاوە راستە و
لەرێی زمانەوانییەوە ساخی
کردووەتەوە (سەرنجی: جەمال
نەبەز: "رەخنەی زمانەوانی".
گۆڤاری "ئاسۆی زانکۆیی"
زانستگەی سلێمانی. تەمووزی
1978، ل 90ـ91). "شانامە" ی
فیردەوسی (932؟ـ1020) کە
باسی بنەچە و رەچەلەکی کورد
دەکات و دەیبەستێ بە چیرۆکی
ئەژدەهاك/ زوحاك ەوە، نێوی
دوو چێشتکەری خێرخوازی
زوحاکیش دەبات، یەکێکیان
گەرمانك Germank و ئەوی
دییان ئەرمانك Ermank
(سەرنجی: شاهنامە.
بلاوکەرەوەی: J.A.Vullers،
بەرگی یەکەم، لایدن 1877، ل
36، بەیتی 37ـ38 و ئەو
لاپەڕەیە. کوردەزازاکان بە
شێوەزارەکەی خۆیان دەبێژن
کرمانجکی kirmanckî و بە
کوردیی زازا دەبێژن kird/e
کرد/ە و بە کوردانە kurdane
دەبێژن کردانە kirdane.
هەروەها بە کوردە کرمانجەکان
دەبێژن: کرداس(ە) kirdas/e و
بە کوردییەکەیان دەبێژن
کرداسی kirdasî واتە: کوردی ـ
ئاسا kurdî-asa واتە: لە
کوردی دەچێ. (سەرنجی
Malmisanij: Ferhengê
Dimliki-Tirki بدە).

**Kiřok** کرۆك (جماد) (← کەڕ keř).

**Kishmîsh** کشمیش، کشمیش
kishmîsh > کش kish +
میش mîsh. کش kish
کورتکراوەی کشك kishk ە، کە
وێنەیەکی کۆنی وشك wishk/
هیشك hishk ەو بە پەهلەوی:

hushk ه و له فارسیدا بووه به خشك xoshk. میش mîsh وێنەیەکی دیکەی مەویژ mewîj و مەویش mewîsh و ← مێوژ mêwij ه. کەواتە: کشمیش بریتییە لە مێوژێکی وشك.

**Kisht û kal’** کشتوکاڵ > کشت kisht + کاڵ kal’. کشت kisht وێنەیەکی دیکەی کشك kishk ه واتە: وشك wushk/ هیشك hîshk. کاڵ kal’ بە مانای: پێنەگەیشتوو و تەڕ. کشتوکاڵ واتە: وشك و تەر wushk û teř.

**Kish û mat** کشو مات. کش kish مانای وشك wushk و بێدەنگ bêdeng ه (←kal’ û + kisht کشتوکاڵ). مات mat مانای کز kiz و بێجووڵە bêcul’e یە.

**Kîj** کیژ (← کچ kich).

**Kîmya** کیمیا، کە بە فەرەنسی شیمی chimie و بە ئینگلیزی chemistry و بە ئەڵمانی Chemie یە، لە وشەی یۆنانی χημεία (xêmia)وە وەگیراوە کە بە مانای لە گەڵ یەك تێکەڵکردن/ تەڤلهەڤکرن tevlihevkirin.

**kîn** کین/ قین qîn، هەردووکیان هاومانان و، مانایان ← رك rik ه. کین kîn بە پەهلەوی کێن kên ه.

**Kitk** کتك/ کتك kitik/ ختك xitik ئەمانە هەموو وشەی کوردین بۆ ← پشیلە pishîle و پسیك pisîk و، وشەکە وشەیەکی هێندۆئەوروپاییی کۆنە. سەرنجی وشەی cat ی ئینگلیزی و chat ی فەرەنسی و katze ی ئەڵمانی بدرێ کە بۆ پشیلە pishîle بەکاردەبرێن.

# ک K

**Klox** کلۆخ، واتە: گڵی وشککراو **gil’î wushkiraw.** کلۆخ **klox** < کل **kil** + ئۆخ **ox** < گڵ **gil’** + ئاخ **ax** واتە: گڵی زەوی. بە شێوەی کلوخ **kolûx** کەوتووەتە فارسییەوە.

**Ko** کۆ (← کۆمار **komar**).

**Kochkirdin** کۆچکردن، وشەی کۆچ **koch** لە بنەڕتدا وشەیەکی مەغۆلییە، کە بە کوردی: ڕەوکردن **rewkirdin** ە. وشەی کۆچەر **kocher** کەوتووەتە زمانی کوردییەوە، بەڵام بە کوردیی ڕاست: ڕەوند **rewend**ە.

**Kok** کۆك (← قورمیش **qurmîsh**).

**Kol’** کۆڵ. وێنەیەکی دیکەی کوڵ **kul’**ە.

**Kolêra** کۆلێرا (ڕشانەوە **rishanewe**) لە وشەی یۆنانی χολέρα خۆلێرا وە هاتووە.

**Kol’ewar** کۆڵەوار < ← کۆڵ **kol’** + ـە **e** + وار **war** کەسێك کە کۆڵیی هەبێ. کۆڕ **koř** و ← کۆر **kor** و کوڵ **kul’** و کووڕ **kûr**، هەرچەندە مانایان جیاوازە، بەڵام بنچینەی ڕەگیان هەر یەکە، واتە: هەبوونی کۆڵی (ناتەواوی لە لەشدا). وار **war** پاشکۆیەکە کە هەبوونی شتێك دەردەخا (← هەوار **hewar** ← وار **war**). تەنانەت وار **war** کە بە مانای وەڵات **wel’at** و نیشتمان **nîshtiman** دێ، ئەوەش هەر بە مانای ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ هەیەتی و خاوەنێتی. وشەی بەندیوار **bendîwar** یش هەر مانای ئەوەیە کە مرۆڤ بەندبوونێکی بە شتێکەوە هەیە. کۆڵ **kol’** لە ← کوڵ **kul’** ەوە هاتووە.

**Kolîn** کۆلین/ لێکۆلین **lêkolîn** (← **Qûl'** قوولّ/ **kûr** کوور).

**Komar** کۆمار، کۆمار **komar** و کۆماڵ **komal'** یەکمانان. دەنگی (ر **r**) و (ڵ **l'**) جێییەکیانگرتووە. کە دەنگی ر **r** لە هێندەك زاراوەی کوردیدا ماوە، وەك کۆیی و هەولێری و کۆنترە لە دەنگی ڵ **l'**. بۆ وێنە: وشەی نێرەکەڵ **nêrekel'** و نێرەکەر **nêreker** وشەی قووڵ **qûl'** و کوور **kûr** (لە کوردیی باکووردا) وەك یەك و لە جیاتییەك بەکاردەبرێن. کۆمار < کۆم **kom** + ئار **ar**، ئار **ar** کورتکراوەی ← وار **war** < هەوار **hewar**. وار **war** و **hewar** هەردوکیان یەکمانان و بۆ شوێنی نیشتەجێبون و لێژیان بەکاردەبرێن. ڤارا **vara** لە سانسکریت و ڤار **var** لە ئاڤێستایی و پەهلەویدا بە مانای شوێن و جێگە دێن. کۆم **kom** بریتییە لە ژمارەیەك خەڵك کە پێکەوە دانیشتبن، یان، بەهۆی شتێکەوە گرێدایی هەبێ لە نێوانیاندا. کە دیارە وشەی کۆمەڵ **komel'** یش لە کۆمار **komar** ەوە هاتووە. وشەی کۆمار **komar** (کۆم هەوار **komhewar**) بە شێوەی "جمهور" کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە. "کۆم هەوار **komhewar** و گۆم هەوار **gomhewar**" یەکمانان و دەنگی ك **k** و گ **g** لە جیاتییەك بەکاردەبرێن. بۆ وێنە: لە شێوەزارەکانی کرمانجی خوارووودا (خانەقینی، مەندەلایی،بەدرەیی، کەڵهوڕی، کرماشانی... هتد دا) دەنگی گ **g** جێیدەنگی ك **k** دەگرێتەوە.

بۆ وێنە: دەبێژن باوگم bawgim لە جێی باوکم bawkim و باشەگە bashege لە جێی باشەکە basheke.

هەروەها وشەی کات kat و گاڤ gav لە شێوەزاری ناڤین و باکووردا نموونەیەکی دیکەن.

نموونەیەکی دیکەی وشەی کۆ ko و گۆ go یە کە لە بنەرەتدا یەك شتن. "گۆ" go بە مانای خڕ xiř دێ. کۆ ko، لە زمانی لاتینیدا کۆ co یە، هەروەك کۆم com کە وێنەیەکی کۆنی acunە و، مانای لەگەڵ legel' و پێکەوەبوون pêkewebûn ە لە لاتینیدا. لە بەرئەوە وێنەیەکی دیکەی کۆم هەوار komhewar گۆم هەوار gomhewar بووە، کە بووە بە "جمهور"، بە گۆڕینی دەنگی گ g بو ج c، چۆنکە دەنگی گ g لە زاری عەرەبیدا نییە، بۆ وێنە: وشەی بزرگ مهری ئێرانی، لە زمانی عەرەبیدا بووە بە بزر جمهر.

**Komel'** کۆمەڵ ← کۆمار **komar**.

**Kontrol** کۆنترۆڵ، لە فەرەنسییەوە وەرگیراوە contrôle و، بە ئەڵمانی kontroll و بە ئینگلیزی control. وشە لە بنچینەدا contre-rolle بووە، واتە: رۆلێکی پێچەوانە.

**Kor** کۆر (نابینا nabîna) بە پەهلەوی هەر کۆر kor ە و، بە فارسی کوُر kûr ە. لە کوردیدا بۆ کۆر kor. وشەی کوێر kör یش هەیە کە هەر بەو شێوەیە چووەتە ترکییەوە. دەبێ وشەی کۆر kor لە سەر دەمی کۆندا چاو/ڤ کۆر chaw/v kor بووبێ و، لەگەڵ کات، وشەی چاو/ڤ chaw/v کەوتبێ لێی. چۆنکە وشەی کۆر kor دەبێ هاوڕەگی کۆڵ kol' بێ.

**Kose** کۆسە/ **Koste** کۆستە. پیاوێك کە مووی ریشی نەهاتبێ، یان شێوەی خۆی گۆڕیبێ. جاران لە کوردەواریدا یارییەك هەبوو بە ناوی کۆسەوەوی **kose wewî** (← بووك **bûk**).

**Kotir** کۆتر/ کەڤۆك **kevok** بە پەهلەوی کەپۆتەر **kepoter** و، لە فارسیدا بووە بە کبوتر **kebûter**. کۆتر **kotir** لە کەوی **kewî** + تر **tir** ەوە هاتووە واتە: شینتر **shîntir**. وشەی کەڤۆك **kevok** یش لە کەڤ **kev** (کەو **kew**) + ۆك **ok** (پاشگرێکە بۆ پتر پێشاندانی شتێك)، واتە: کەڤ تر **kev-tir** (شینتر). وشەی کەڤۆك لە فارسیدا کراوە بە کبك **kebk** و کبوك **kebûk** کە ئەمەیان وێنەیەکی دیکەی کەڤۆك **kevok** ی کوردییە بە گۆڕینی دەنگی ڤ **v** بۆ ب **b** و گوڕینی دەنگی ۆ **o** بۆ وو **û**. (← کەو **kew**).

**Kox** کۆخ/ کۆختە **koxte** خانووی بچووك **xanûy bichûk**. لە زمانی کوردیدا وشەیەکی دیکە هەیە بۆ کۆخ **kox**/ کۆختە **koxte** ئەوەش: کۆزلاخ **kozlax**ە. کۆز **koz** و کووز **kûz** پارچەیەکی بچووکە لە شتێك، واتە: ← قاش **qash** ێکە لەو شتە. کۆزلاخ **kozlax** < کۆز **koz** + لـ **li** + ← ئاخ **ax** (خاك **xak**/ زەوی **zewî**). کۆزلاخ **kozlax** کەواتە: کووزێك (پارچەیەکی بچووك لە ئاخ، خاك، زەوی). کۆزلاخ کورتکراوەتەوە بووە بە کۆخ **kox**. وشەی کۆخ بە شێوەی کوخ **kûx** کەوتووەتە زاری عەرەبی و فارسییەوە.

# K ك

**Kuchk** كوچك (← كەڤر kevir/ كەور kewir).

**Kul** كول (← كوڵ kul’).

**Kul’** كوڵ، بە شتێك دەگوترێ كە درێژییەكەی تەواو نەبێ و كەم بێ. كوڵ kul’ لە ← كورت kurt ەوە هاتووە. كورت kurt < كور kur < كول kul<كوڵ kul’. وشەی كول kul یش كە بۆ كەمیٖ تیژی بەكاردەبرێ هەر لە كورت kurt ەوە هاتووە.

**Kulîng** كولینگ/ كۆلینك kolînk هاومانای یەكن و بریتین لە ئامێری زەویكۆڵێنوشەكە لە: كۆڵێن kol’în ەوە هاتووە. كۆڵ kol’ لە ← قووڵ qûl’ ەوە هاتووە، واتە: قوول كردن qûl kirdin ی زەوی. وشەی قوول qûl لە كووڵ kûl’ و كۆڵ kol’ ەوە هاتووە. (← كوور kûr).

**Kurt** كورت، وشەیەكی هێندۆئەوروپاییی كۆنە. سەرنجی وشەی kurtz ی ئەڵمانی و short ی ئینگلیزی و court ی فەرەنسی و وشەی kopótkий رووسی بدرێ. لە فارسیدا وشەی كوتاە (كوتاهی) بەكاردەبرێ، كە ئەوەش لە وشەی كوردیی كورتاهی kurtahî یەوە وەرگیراوە، كە لە كرمانجیی باكووردا بەكادەبرێ.

**Kurt** كورت (كورد kurd) (← شوان/شڤان shw/van).

**Kurtek** كورتەك كەوای كورتی پیاوانەیە لە پەهلەویدا هەر كورتەك kwrtek ە، و لە عەرەبیدا بووە بە قرطق كە بۆ كراس بەكاردەبرێ.

**Kushin** كوشن، شوێنی دانیشتن لە نێو ئۆتۆمۆبیلدا. لە couching ی ئینگلیزییەوە هاتووە.

**Kuve** كوڤە/ Kîve كیڤە (← بۆ كوێ bo kwê).

## K ك

**Kuz/s** کوز/س. ئەندامی سێکسی مرۆڤی مێینە. لە **kun** کون + **zê** زێ وە هاتووە. زێ **zê** لە زایین **zayîn** ەوە هاتووە. (← **zaw û zê** زاوزێ).

**Kûpe** کووپە (← **Gep** گەپ).

**Kûr** کوور (← قووڵ **qûl'**).

**Kûz** کووز(← کۆخ **kox**).

**Kwêwe** کوێوە (← بۆ کوێ **bo kwê**).

**kwêxa** کوێخا، کە بە کوردیی هەورامی: کۆخا **koxa** یە و "کەیخا **keyxa** ش هەیە، بە پەهلەوی: **ketek-xvetay**. خڤەتای **xvetay** مانای خاوەن **xawen** (← خێو **xêw**)ە، کەتەك **ketek** یش مانای خانوو **xanû** (خانی **xanî**) یە. سەرنجی وشەی ← **koxte(k)** کۆختە(ك) بدە. کەتەك خڤەتای **ketek xvetay** مانای خاوەن ماڵ.

# L ل

La لا گەلێك مانای هەیە لە زمانی کوردیدا. لەوانە: (لنك li nik، لە کن le kin، لبال li bal، باڵ bal’، ئالی alî) باڵ bal’ لە پاڵ pal’ ەوە هاتووە کە بە مانای "تەنیشت و لای کەسێك"، یان "لای شتێك دێ". پاڵ بە فارسی "پهلو" pehlo ە. لا la لە ئال al ەوە هاتووە، بە جێگۆڕینی شوێنی دەنگەکانی وشەکە. وەك "کن kin" (لە کن من)/ "نك nik" (لنك من) و، وشەی زیخ zîx ی "سۆرانی" لە "بادینانی" دا بووە بە xîz. وشەی ئال al بە شێوەی ئێل êl چووەتە زاری ترکییەوە و بۆ "دەست dest" بەکاردەبرێ. (⟵ لاقرتی laqirtî).

La لا (⟵ دۆلاب dolab).

Lalengî لالەنگی (⟵ نارنگی naringî).

Lanik لانك (⟵ بێشکە Bêshke).

Laq لاق (واتە: لنگ ling) وشەکە وشەیەکی هێندۆئەوروپاییی کۆنە، بە سانسکریتی Lak-uṭá، بە ئینگلیزی leg ە، بە زمانی سوێدی lägg ئێسقانی لاقە. وشەی لەقە leqe ش لە لاق laq ەوە هاتووە.

Laqirtî لاقرتی دەگوترێ: "قسەی لاقرتی" واتە: قسەی ناڕێکوپێك. قرت qirt لە کوردیدا بە مانای "ڕێك rêk" دێ. دەبێژیت: "نانەکەی قرت بڕی" واتە "نانەکەی ڕێك بڕی". "لا la" لە کوردیدا بە مانای شتێکی ناسەرەکی دێ، وەك دەبێژیت: "لا کۆڵان la kol’an" واتە: کۆڵانێکی تەنیشت و دوورە دەست و ناسەرەکی. لا la بە مانای "نیوە nîwe" ش دێ. دەگوترێ

"کردمان به دوو لا" واتە:
"کردمان به دوو نیوه". کەواتە:
لاقرتی laqirtî مانای "نیوه
ڕیك و نیوه چڵ" ە.

**Lare** لاره (← لارەسا laresa).

**Laresa** لارەسا (سێبەری نێوەڕوان
la لا > (sêberî nêwerwan
la لا .sa سا + re ره +
(تەنیشت tenîsht/ پاڵ pal'،
+ rê رێ > re ره + al ئال <
(sêber سێبەر ،sê سێ) sa سا
واتە: لاڕێ سیبەر lařê sêber
سێبەرێك كه له ڕێ لادەدا. لاره
lare له لاڕێ lařê وه هاتووه،
واتە: بە لادا دەكەوێ و، لەگەڵ
لەره lere هاوڕەگن.

**Las** لاس/ لاز laz/ لاج lac/ لاو
Law. ئەمانە هەموو هاومانان
و، بە مانای کوڕی گەنج دێن.
لاسۆ laso و لازۆ lazo
هەردووکیان نێون بۆ کوڕ
(پیاو). سەرنجی چیرۆکی لاس و
خەزال las û xezal بدرێ. لاس
las وشەیەکی کۆنی
هێندۆئەوروپاییە. سەرنجی
وشەی lad ی ئینگلیزی بدرێ
که مانای گەنج genc ە.
هەروەها وشەی لاو law له
کوردیدا کە هاومانای ئەوانەی
سەرەوەیە، لە گوڕینی دەنگی s و
z و c و w بۆ یەکدی هاتووه. له
پەرتۆکی "زمانی یەکگرتووی
کوردیدا"، چاپی بامبێرگ
(1976) نووسیومە کە law له
غولام (غلام) xhulam ی
عەرەبییەوە دێ، ئەوە ڕاست
نییە. غلام xhulam کراوە به
خولام xulam. لاو law
کوردییەکی پەتییە.

**Lasayî** لاسایی له: لا la ئاسایی
asayî یەوە هاتووه. لا la مانای
نیوه nîwe، واتە: نیوه ئاسایی

Dolab ←) .nîwe asayî دولاب).

**Lastîk/Lastîq** لاستيك/لاستيق، وشەيەكی ئەوروپاييە، سەرنجی وشەی elastisch ی ئەڵمانی و وشەی یۆنانی ἐλαστικός بدرێ كه ماناى شتێك دەگەيەنێ، كه بتوانرێ بكشێنرێ، واتە: لە كشاندنەوە هاتووە.

**Lashîpan** لاشيپان (دار، يان ئاسنی تەنيشتی چوارچێوەی دەرگە).

لاشيپان lashîpan < لا la + شيپ shîp + ئان an. شيپ shîp و شف shiv و چێو chêw و چيپ chîp هەموو هەر يەك مانايان هەيە و، بە پارچەدار دەگوترێ. ئان an لە وشەی لاشيپان lashîpan دا، نيشانەی گەل (جمع)ە. واتە: داری لايەكان، داری تەنيشتەكان.

**Law** لاو (← Las لاس... هتد).

**Lawandinewe** لاواندنەوە، ئەم وشەيە، لە لايەكەوە بە ماناى دڵدانەوە و خۆشەويستيپێشاندان بەرامبەر كەسێك و، لە لايەكی ديكەشەوە، ئەو گۆرانييەيە كە پاش مردنی كەسێك، ژنێك بۆی دەچڕێنێ و، بەوە خەڵكەكە دەهێنێتە گريان بۆ مردووەكە. "لاواندنەوە" پێوەنديی بە ← "لاو law" (←گەنج genc)ەوە نييە، وەك لە نێو خەڵكدا باوە، كە گوايە ئەو گۆرانييە بۆ بەزەييپێهاتنەوەيە بە لاوێكی مردوو. بەڵكو "لاو law" لە زمانی كورديدا مانايەكی ديكەشی هەيە ئەوەش: خۆشەويستی xoshewîstî (ئەڤينی evînî) يە. كەواتە: "لاواندنەوە" ماناى "خۆشەويستی دەربڕينە". كورد

دەبێژن: "بیلاوێنەوە" واتە: "دڵی بدەرەوە، خۆشەویستیی پێشانبدە". وشەی "لاو law" بەم مانایە پێوەندیی بە وشەی love ی ئینگلیزی و liebe ی ئەڵمانییەوە هەیە کە هەردووکیان مانای "خۆشەویستی" دەگەیەنن.

**Lawich** لاوچ، لە زمانی کوردیدا بە جێیەك دەگوترێ کە سێ لای وشکانی و لایەکی ئاو بێ. لاوچ **lawich** > لا **la** + ئاو **aw** + چ **ch** > (جهـ **cih**، جێ **cê**). واتە: لا ئاو جێ، واتە: جێی لایەکی ئاوە. ئەم وشەیە لە عەرەبیدا بووە بە خلیج. خ **x** کورتکراوەی خاك **xak**، لیچ **lîc** یش لە لاوچ **lawich** > لاوج **lawic** > لیچ **lîc** واتە: خاك لاوج **xak lawic** بووە بە خلیج.

**Lawja** لاوژا (براگەورە **biragewre**) لە: لاو **law** + هێژا **hêja** دوە هاتووە، واتە: لاوهێژا **lawhêja**. (← لاو **law**، ← هێژا **hêja**).

**Lawj(e)** لاوژە (← گۆرانی **goranî**، ← ستران **sitran**)، لاوك **lawik** (گۆرانییە کۆنەکانی کورد) لەو **lew**، لەپ **lep**، لەوس **lews** (دەمولەوس **demûlewis**)، لاوس **lawis** (لای سەرەوەی دەم، نیوەی دەم). ئەم وشانە هەموویان پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی **laut** بۆ دەنگ بەکاردێ. لە زمانی ئیگلیزیدا **language** و لە فەڕەنسیدا **language** بۆ زمان بەکاردێن، لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی **lyrik** هەیە. دەم و زمان و زمانی قسەکردن پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. وژە **wije** وێنەیەکی دیکەی ← وشە **wishe** یە. لاوژە، لاوشەیە واتە: وشەیەکی ناتەواو. هەر لەو وشیەوە وشەی "لهجە" ی

عەرەبی دێ کە لە لاوژە lawje < لاوجە lawce < لەهجە (لهجة) دروست بووە و کوردییەکەی رۆنە، بە شێوەی لاف laf، کەوتووەتە زاری ترکییەوە. لاف laf لە کوردی و فارسیدا بە مانای وتەی درۆ diro/ درەو direw بەکاردێ. لە زمانی کوردیدا وشەی لافە lafe هەیە، بە مانای ← وڕێنە wiřêne.

**Legen** لەگەن، وشەیەکی کوردییە کە خەلکی عێراق بەکاریدەهێنن. لە زمانی یۆنانیدا lechane و لە زمانی بابلیدا Lignu ە. لە Le کورتکراوەی لان Lan ە، واتە: جێ، گەن gen گەنیوو شتی پیس بوو. لەگەن ئەو ئامێرەیە کە مرۆڤ دەستیان دەشۆن تێیدا و پیسایی دەستی تێدەکەن. لە عەرەبیدا بووە بە لَجَن کە مانای پیسایی دەدات.

**Lehce** لەهجە، ئەم وشەیە لە زمانی فارسی و عەرەبیدا بەکاردەبرێ بۆ "شێوەزار". لە زمانی کوردیدا وشەی ← لاوژە lawje هەیە کە ستران و گۆرانییەکی تایبەتییە. هەر لە زمانی کوردیدا گڕەلاوژە giřelawje بەکاردەبرێ بۆ جۆرە دەنگێکی تێکەڵوپێکەڵ کە کەس تێینەگا. بە گۆرانییە کوردییە کۆنەکان دەگوترێ: لاوك lawik (لاوك و حەیران lawik û ĥeyran). لاوژە و لاوك لە کوردیدا لە گەڵ language ی ئینگلیزی و language ی فەرەنسی کە هەردووکیان مانای "زمان"ە، بنەچە و رەچەلەکەکانیان یەکە. Langue بەتەنێ "زمانی نێودەم" ە. وشەی "لەهجە" لە کوردییەوە چووەتە زمانی عەرەبی و "لاوژە lawje" بووە

به لاژه **laje** و ئەوجا لاجه **lace** و دوایی لەهجە **lehce** و، فارسەکانیش لە عەرەبەوە وەریانگرتووە. لەبەر ئەوەی خاوەنی فەرهەنگی "معین" کە کوردی نەزانیوە، پێیوابووە کە "لەهجە" (لهجة) وشەیەکی عەرەبییە، بێ ئەوەی بگەڕێ بە دوای بنەچەکەیدا. راستییەکەی، نە هەر تەنێ "لەهجە" عەرەبی نییە و کوردییە، بەڵکو وشەی "لغة" (لوغەت) یش عەرەبی نییە و لە **logos** (λόγος) ی یۆنانییەوە وەرگیراوە کە بە مانای وشە و قسە دێ، جا لە بەر ئەوەی عەرەبەکان دەنگی "گ **g**" لە زمانەکەیاندا نییە، جاری وا هەیە دەیکەن بە "ج" و جاری واش هەیە دەیکەن بە "غ". بۆ وێنە "گوندی شاپور" دەکەنە "جندی شاپور" و "گاریپالدی" دەکەنە "غاریبالدی" و "گراماتیك (رێزمان)" دەکەنە "أجرُمیة" و"گوند **gund**" دەکەن بە "جُند".

**Leheng** لەهەنگ > لە **le** + هەنگ **heng**، > لاو **law** + هەنگ **heng** واتە: لاوێك کە لە هەنگ دەدا. ← هەنگ **heng** لە زمانی کوردیدا بە گەلێك مانا، لەوانە بە مانای نیشانە **nîshane** و ئامانج **amanc** بەکاردێ. سەرنجی وشەی هنگافتن/ئەنگاوتن **hingavtin/engawtin** بدرێ کە مانای نیشانە شکاندن و لە نیشانەدانە.

**Lend** لەند، بە پارچە زەوییەکی بەرز دەگوترێ کە دەوروبەری بە ئاو گیرابێ. وشەی **land** لە زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکاندا بە خاك **xak** و زەوی **zewî** و وڵات **welat** دەگوترێ.

# L ل

**Lendehor** لەندەهۆر، مرۆڤی ← کەڵەگەت **kel’eget** و زل. لەند **lend** مانای ← بەرز **berz** (سەرنجی وشەی کەندولەند **kend û lend** بدرێ کە کەند **kend** مانای چاڵوچۆڵە **chal’ûchol’** ە. ← لەند **lend** یش مانای بەرزاییە. هۆر (هور) **hor/hur** مانای ← (ئە)ستوور **e(stûr)** ە. بۆ وێنە: ملهۆر **milhor** واتە مل ئەستوور **milestûr**، هور (هۆر) **hur/hor** وێنەیەکی دیکەی وشەی (ئە)ستوور **(e)stûr** ە.

**Lenger** لەنگەر، لە لەنگر **lengir** و لەنگیگر **lengîgir** ەوە هاتووە. واتە: ئامێرێك، یان شتێك کە لەنگی **lengî** ی شتێکی دیکە رابگرێ. ئەم وشەیە لە عەرەبیدا بووە بە "أنجَر" و لە فارسیدا هەر بە شێوەی لنگر **lenger** وەرگیراوە.

**Leqe** لەقە، (← لاق **laq**).

**Leqleq** لەق لەق، ئەو مەلەیە کە هەمیشە لاقێکی دادەنێ و لاقێکی هەلدەبڕێ و لاقە و لاق دەوەستێ. وشەکە کوردییەکی رووتە. لە عەرەبیدا بووە بە أللقلق. وشەکە پێوەندیی بە وشەی لاقەوە هەیە (← لاق **laq**، ← لنگ **ling**). کاری لەقین **leqîn** یش هەر لە وشەی لاق **laq** ەوە دێ. طه باقر لە پەرتۆکی "من تراثنا اللغوي ألقديم" دەیباتەوە سەر وشەی "رەق رەققوو" **reqreqqû** ی بابلی.

**Leqîn** لەقین (← لاق **laq**).

**Leř** لەڕ، واتە: کەسێك کە قەڵەو و گۆشتن نەبێ. لەڕ لە لەخەر **lexer** ەوە هاتووە، کە لەخەر وشەیەکی کوردییە هەر بە مانای لەڕ دێ. لەخەر **lexer** لە

فارسیدا بە شێوەی "لاغر" دەرکەوتووە.

**Leshkir** لەشکر/ **Leshker** لەشکەر. وشەیەکی کۆنی کوردییە، لە فارسیدا وەك لەشکەر (لشکر leshker) بەکاردێ. سەرنجی چیرۆکی کۆن بدرێ کە باسی "کەوڵ سۆری بەر لەشکر" دەکا.

**Lewashe** لەواشە، جۆرە نانێکی پانە < لەو lew + واش wash + ـە e، لەو lew وێنەیەکی دیکەی لەپ lep (بەری دەست berî dest)ە، ← واش wash (وەش wesh، ← وەك wek ە ) ← سپی واش sipî wash). واتە: لەواش ئەو شتەیە کە وەك بەری دەست پانە. هەروەها، لە کوردیدا وشەی "لەواسە lewase" هەیە کە بە بەری دەست دەگوترێ، کە ئەمەش لە "لەو ئاسا lewasa" و < لەپ ئاسا lepasa ەوە هاتووە کە مانای: وەك (ئاسا) بەری لەپە.

**Lewend** لەوەند (لاوچاك lawchak) < ← لاو law + ← وەند wend. واتە: لاوێکی خاوەن هەند hend xawend. هەند hend (مقدار)ە.

**Lêwar** لێوار (← کەنار kenar).

**Lifke** لفکە/ لفك lifk/ لەفکە lefke، پارچەیەکە کە لە پرزالی رووەك دروستدەکرێ و لە گەرماودا خۆی پێدەشۆن. لفکە lifke لە لەپکە lepke ەوە هاتووە، واتە: لەپی دەست lepî dest کە lepke وشەیەکی دیکەیە بۆ لفکەی حەمام، لەپك lepk و لەپکە lepkeپارچە پەڕۆ peřo parche یە، وەك دەستکێش لە دەستی دەکەن و خۆیانی پێدەشۆن. وشەی لفَ، یلفُ، التفاف، ملَف کە بە مانای

پێچان pêchan و تێپێچان têpêchan دێن، لەم لەفکە lefke و لەپکە lepke یەوە وەرگیراوە.

**Lifkrî** لفکری/ لفگیری lifgîrî / لفگرین lifgirîn، واتە: ژنمێری jinmêrî پێکەوەنان، شووکردن و ژنهێنان (زواج). لف lif مانای← جومرانە cumrane/ دووانە duwane یە.

**Lirf** لرف (← Mishexor مشەخۆر).

**Ling** لنگ/ Lîng لینگ، بە ← لاق laq ی مرۆڤ دەگوترێ. پێوەندیی بە وشەی سانسکریتی لینگە lînge وە هەیە کە بە مانای ئامێری زاوزێی پیاوە. ئەم وشە کوردییە هەر بە شێوەی لینگ lîng کەوتووەتە فارسییەوە. لە ئینگلیزیدا وشەی leg بۆ لاق laq هەیە. دوورنییە وشەی ← لەند lend ی کوردی کە بۆ بەرزاییەك بەکاردێ کە ئەم لا و ئەو لای ئاو بێ، پێوەندی بەم وشەیەوە هەبێ، نەك لە وشەی بلند bilind ەوە وەرگیرابێ کە بە مانای بەرزییە. چۆنکە وشەی لەند lend لە زمانی هیندیدا هەر بەو مانایە بەکاردێ.

**Liwêr** لوێر/ Lewar لەوار، بە کەسی خاوەن شت دەگوترێ (سەرنجی لات و لوێر lat û liwêr / lat û lewar لات و لەوار بدرێ). لە شێوەزاری شاری کوناری ئەفگانستاندا وشەی lwar لوار هەیە بە مانای ← gewre گەورە و سەرکردە serkirde.

**Lixhaw** لغاو، یان لغاڤ lixhav، جۆرە ئاسنێکە دەیخەنە دەمی ئەسپەوە بۆ ئەوەی لە کاتی سواربووندا بتوانن بیگرن. لغاڤ lixhav > لـ li + غاڤ xhav >

# L ل

لـ li + گاڤ gav < لـ li + گەڤ gev < لـ li + گەپ gep (دەنگی پ p و ڤ v و w جێییەکدەگرنەوە). ← گەپ gep مانای قسەکردن و دەمبزواندنە. ل گەپ li gep مانای لە دەمنراو، لە دەمخراو (سەرنجی وشەی گاڵتە و گەپ gal'te û gep بدری)، تەنانەت وشەی گووپ gûp ی کوردی پێوەندیی بە گەپ gep ەوە هەیە. وشەی لغاو/ڤ lixaw/v لە فارسیدا بە شێوەی لگام legam دەرچووەوە و لە عەرەبیدا بووە بە لجام. لە پەرتۆکی "زمانی یەکگرتووی کوردی" دا کە لە ساڵی 1976 دا چاپکراوە نووسیومە، کە لغاو lixhaw ی کوردی لە "لجام" ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. ئەو بۆچوونەی ئەو کاتەم راست نەبوو. لێرەدا راستیدەکەمەوە.

**Lo** لۆ، لە: لەبۆ lebo وە هاتووە.

**Lobî** لۆبی. بە کۆمەڵێك کەس دەگوترێ کە پشتگیریی لە شتێك بکەن. وشەکە لە وشەی Lobia ی لاتینیی ناڤینەوە هاتووە کە مانای "کۆختە" koxte یە. لە ئەڵمانی و ئینگلیزیدا lobby یە کە لە بنەڕەتدا بە مانای "ژووری چاوەڕوانی" بووە.

**Loc** لۆج، وشەیەکی کۆنی فەڕەنسییە Loge (لۆژ). لە زمانی ئیتالییایدا بووە بە Loggia کە بە مانای ← کەپر kepir دێ.

**Logarîtim** لۆگاریتم. لە ماتماتیکدا بەکاردێ. وشەیەکی لاتینیی نوێیە کە لە ئینگلیزیدا بووە بە Logarithm و لە ئەڵمانیدا Logarithmus.

**Lorî** لۆری. وشەکە ئینگلیزییە lorry.

**Luxhet** لوغەت (لغة) (← لەهجە lehce).

## L ل

**Lûle** لووله، له لوولکردن **lûlkirdin**ەوه دێ. لوول **lûl** و لوور **lûr** مانای پێچدان **pêchdan** و هەر یەك شتن. لۆرەپ **lorep** کونی گوانی چوارپێیه، که شیر دێته خوارێ پێیدا وشەیەکی زۆر کۆنی کوردی و هێندۆجەرمانییه. سەرنجی وشەی **Rohr** ی ئەڵمانی بدرێ که به مانای لووله و ← قامیش **qamîsh** دێ. وشەی لووله **lûle** هەر وەك خۆی کەوتووەته فارسییەوە. (← رۆبار **robar**).

**Lût** لووت/← کەپوو **kepû**/ بێڤل **bevil**. لووت **lût** له رووت **rût**ەوه هاتووه. رووت **rût** خۆی وشەیەکی دیکەیه بۆ لووت **lût**.

# M م

**Mach** ماچ، له ← ماش **mash** ەوە هاتووە کە بەمانای ماڵینی جێگەیەکە (← ماشەدان **mashedan**، ماشەماش **mashemash**). ماچ **mach** ماڵینی روومەت، یان شوێنێکی دیکە، یان شتێکی دیکەیە، بە دەم. ماچ کردن **mach kirdin** واتە: ← ماشدان **mashdan**، یان ماشین **mashîn** ی ئەو شوێنە، یان ئەو شتە. ماش **mash** و ماچ **mach** و ماڵ **mal’** (ماڵین **mal’în**) بنەڕتیان یەکە. لە کوردیدا: ماچین **machîn** یش بۆ ماچ کردن **machkirdin** هەیە.

**Mak** ماك، لە کوردیدا گەلێك مانای هەیە. یەکێك لەوانە: "مادە **made**" یە کە بە مانای← دایك **dayk** یش دێ. ماك **mak** پێکهاتەی شتە. وشەی ماك **mak** لە پەهلەویدا ماتەك **matek** ە. ماتەك ڤار **matekvar** (رەسەن، ئەسڵی) یە. لە عەرەبیدا بووە بە مادّة و لە زمانی ئەڵمانیدا **materie** و لە ئینگلیزیدا **matter** و لە فەرەنسیدا **matière** و لە لاتینیدا **materialis**.

**mal’** ماڵ، واتە: ← خانوو **xanû**/ خانی **xanî** لە "مال" ی عەرەبییەوە نەهاتووە. ماڵ **mal’** لە بنەرەتدا مار **mar** ە کە هەتا ئەورۆ لە شێوەزاری هەولێر و دەوروبەریدا بەکاردەبرێ. وشەی مار **mar** لە هەمیار **hemyar** و هەمار **hemar** ەوە هاتووە کە مانای: شوێنی لێدانان و کۆکردنەوەی هەم (هەموو) **hem/hemû**

# M م

شتومەکە کە لە فارسیدا بووە بە انبار enbar و لە هێندەك شێوەزاری کوردیدا بووە بە عەمار ʿemar. (← ʿEmbar عەمبار). ← هەوار hewar یش کە لە بنەڕەتدا هەو(ڤ) ـ وار hew(v)war ە، واتە "هەڤ" hev (هەموو) لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، لەم ڕەگەوەیە.

**Mal'bat** ماڵبات، > ماڵ mal' + بات bat. ماڵبات واتە: ماڵی باوان (باوکان، باڤان) بۆ بنەماڵە و خانەوادە بەکاردەبرێ. بات bat لە باڤك bavk ەوە هاتووە، باڤك bavk بووە بە بافك bafk وئەوجا بافت baft و ئەوجا بات bat.

**maman** مامان، بەو ژنە دەگوترێ کە لە کاتی منداڵبووندا یارمەتیی ژن دەدا. مامان maman لە ماما mama (کە مانای دایك dayik ە) و مان man ەوە هاتووە واتە: مامامان mamaman. مان man و مینا mîna بە مانای ← وەك wek دێن. سەرنجی وشەی ئێمە و مانان ême û manan بدرێ کە مانای ئێمە و ئەوانەی وەك ئێمەن. مامان، کەسێکە وەك دایك وایە.

**Mamir** مامر (← مریشك mirîshk). ما ma وێنەیەکی دیکەی مێ mê یە. مر mir مەل mel ە. (← مەل mel) واتە: مەلێکی مێ.

**Mamosta** مامۆستا، لە دوو وشە پێکدێ: مام mam + وەستا westa. مام mam لە مام mam (برای باوك) ەوە نەهاتووە، بەلکو لە ئام am ەوە هاتووە کە بەشێکە لە وشەی

ئامۆژگار amojgar، واتە: کەسێك کە موچیاری muchyarî بکا. مۆچاندن mochandin لە کوردیدا مانای ئامۆژگاریکردن amojgarîkirdin ە. وشەی ئامۆژگار لە پەهلەویدا هەر وەك کوردییە، ئەوە نەبێ کە دەنگی گ g بووە بە ك k و دەگوترێ: ئامۆژکار amojkar واتە: کەسێك کە کارەکەی ئامۆژگاریکردنە. ئامۆژگار، لە فارسیدا بووە بە آموزگار amûzgar. بەشی دووەمی وشەی مامۆستا واتە: ستا sta لە ستات stat ی پەهلەوییەوە هاتووە، کە بە مانای گەیاندن geyandin ە. بەڵام وشەی أستاد ostad کە فارسەکان بەکاریدەهێنن بۆ مامۆستا و عەرەبەکان کردوویانە بە "أستاذ" ئەوە لە وشەی پەهلەوی ostat ئۆستات ەوە هاتووە، کە مانای لێزان و شارەزا shareza یە. هەر لەم وشەی ostat ەوە وشەی کوردی وەستا westa وەرگیراوە، کە بە کوردیی باکوور هۆستا hosta یە و بەو شێوەیە کەوتووتەوە ترکییەوە.

Man ~ ~ مان، پاشگرێکە کە بنووسێ بە هێندەك وشەوە، وشەیەکی نوێ دروستدەکا. بە مانای بیرکردنەوە و کەوتنە دۆخێکەوە، وەك سەرسوڕمان sersûřman، پەشێمان peshêman، دامان daman. ئەم پاشگرە لە ئاڤێستادا مەنەهـ meneh ە.

Man ~ ~ مان، پاشگرێکە بۆ ← جێگە cêge بەکاردێ واتە: ماڵ و شوێنی لێبوونە. وەك دارەمان

dareman (جێ دارودرەخت).
ئەم پاشگرە لە ئاڤێستادا دیمانە dîmane یە.

**Mana** مانا، لە minîk ەوە هاتووە کە مانای بیرکردنەوەیە. سەرنجی وشەی ئینگلیزی to mean و ئەلمانی meinen بدرێ. وشەی "معنی" ی عەرەبی لەمەوە هاتووە. مانا mana لە "معنی" وە نەهاتووە، پێچەوانەکەی راستە.

**Manshêt** مانشێت. وشەیەکی ئەوروپاییە بۆ سەر نێوی وتارێك، یان هەواڵێك بەکاردێ. لە manchette ی فەڕەنسییەوە وەرگیراوە کە بە ئەلمانی manschette ە.

**Mar** مار، (جانەوەر canewer) بە پەهلەوی هەر مار mar ە. مار mar بە شێوەزاری لوڕی بە مانای دایك دێ. کە بە پەهلەوی ماتەر mater ە و لە زمانە ئەوروپاییەکانیشدا هەیە. بۆ وێنە بە ئینگلیزی mother و بە ئەڵمانی Mutter و لە فارسیدا بووە بە مادر mader.

**Marke** مارکە، بە مانای نیشانە nîshane و پێناسە pênase و مۆدێل ← modêl ی شتێك دێ. دەگوترێ ئۆتۆمبیلەکە چ مارکەیەکە؟ وشەکە بە فەڕەنسی marque و بە ئەلمانی marke و، بە ئینگلیزی mark ە.

**Maroxe** مارۆخە (پارچە زەوی گچکە) < مار mar (ماڵ mal’) + ۆخە oxe (ئاخە axe واتە: زەوی (← ئاخ ax). مارۆخە maroxe واتە: ماڵۆچکە mal’ochke.

**Mash** ماش، (دانەوێڵە danewêl’e) بە سانسکریت هەر ماش mash ە.

Mashedan ماشەدان/ ماشین mashîn و ماشتین mashtîn به پاككردنەوە و گەسكدان و ماڵین دەگوترێ. ماشە mashe لە ماژە maje و مژین mijîn ەوە هاتووە. كورد دەبێژن: "نانەكەی ماشە ماش mashemash خوارد"، واتە: هەمووی خوارد و راماڵی دا. وشەی ← ماچ mach یش هەر لە ماش mash ەوە هاتووە. وشەی ماشین mashîn و ماڵین malîn یەك بنەڕەتیان هەیە، دەنگی ش sh و ڵ l' جێییەكیانگرتووتەوە.

Mashên ماشێن (ترومبێل tirombêl) وشەكە لە وشەی فەڕەنسییەوە وەرگیراوە كە مانای ← مەكینە mekîne یە.

Mashîn ماشین (← ماشەدان mashedan).

Masî ماسی، بە ئاڤێستایی مەسیە mesiye و زمانی پارتی masyag ە و لە پەهلەویدا ماهیك mahîk ە ولە فارسیدا بووە بە ماهی mahî. دیارە دەنگی س s شێوەیەكی كۆنی دەنگی ه h یە (وەك ئاسن asin كوردی و آهن ahin فارسی).

Mast ماست، بە سانسكریت بە شیری ترش دەگوترێ مەستو mástu كە لە لاتینیدا بووە بە moose.

Mat مات (← matemînî ماتەمینی).

Matemînî ماتەمینی، واتە: دۆخی خەمداگیری و، بەدەست خەمەوە دامان و مات دامان. مات mat لە زمانی كوردیدا بە مانای كپی kipî و بێدەنگبوون bêdengbûn ە، بە هۆی خەم، یان، بیركردنەوەی قووڵەوە. وشەی مات mat وشەیەكی

کۆنی هێندۆئەوروپاییە کە لە گەلێك لە زمانە ئەوروپاییەکاندا هەیە. بۆ وێنە: mat بە فەرەنسی و matt بە ئەڵمانی، بە مانای کز kiz و بێجووڵە و بێتاقەت دێ. مین bêcûl'e mîn لە مینا mîna وە هاتووە کە بە مانای وێنە wêne (وەکو weku)ە (← مینا mîna).
ماتەمینی matemînî وێنەی ماتی بە خۆوەگرتن. وشەی "مأتم" ی عەرەبی لە ماتەمینی matemînî کوردیەوە وەگیراوە.

**Mater** ماتەر (← meter مەتەر).

**Maxolan** ماخۆلان، وشەیەکی بە بنچینە یۆنانییە: melaxolia کە لە زمانی ئینگلیزیدا بووە بە melancolia و لە ئەڵمانیدا Melankolie. ماخۆلان نەخۆشییەکی دەماری مێشکە کە مرۆڤ جێ بە خۆی ناگرێ. (ئەوە چییە؟ ماخۆلانت گرتووە؟).

**Maye** مایە، بە بنەچە و رەچەلەکی شت دەگوترێ، یان، بڕ bir، هەند hend (مقدار) ی شت. بە پەهلەوی ماتەك matek ە کە لە عەرەبیدا بووە بە مادة. وشەی سەرمایە sermaye لەمەوە هاتووە و کەوتووەتە زاری فارسی و ترکی و عەرەبییەوە.

**Mayesîrî** مایەسیری، یان باوەسیری bawesîrî نەخۆشییەکە تووشی کۆمی مرۆڤ دەبێ. لە باسۆرە basore وە هاتووە. کۆمی مرۆڤ دەئاوسێ (بادەکا) و سۆردەبێتەوە. ئەم وشەیە، بە شێوەی بواسیر کە وشەی باسۆرە basore یە و گەل (جمع) کراوەتەوە، کەوتووەتە زاری عەرەبی و زاری فارسیش هەر

بەو شێوەیە، لە عەرەبییەوە وەریگرتووە.

**Me** مە (← مەقاش **meqash**).

**Megez** مەگەز (← مێش **mêsh**).

**Megrîcenî** مەگریجەنی (مقەست **miqest**، قەیچی **qeychî**، دوێرد **dwêrd**) مەگریجەنی **megrîcenî** لە مەگریژەنی **megrîjenî** یەوە هاتووە، واتە: مەگر لێدان **megirlêdan** (ژەندن **jendin** مانای لێدان **lêdan** ە، بلوێرژەن **bilwêrjen** = بلوێرلێدەر **bilwêrlêder**). مەگریجەنی **megrîcenî** کە لە مە **me** + گر **gir** + ی **î** + جەنی **cenî** یەوە هاتووە لە بنەرەتدا < مە **me** + گر **gir** + ی **î** + ژەنی **jeni** یەوە هاتووە. واتە: ئەو ئامێرەی کە لە شتێکی گیراو دەدا (← مەقاش **meqash**).

**Meh** مەهـ (مانگ **mang**) بە ئاڤێستایی ماونگهە **mawinghe** و، ماهە **mahe** و ماسە **mase** یە.

**Mehabad** مەهاباد، مەهـ **meh** وێنەیەکی دیکەی مەز **mez** ە. کە مەز **mez** لە مەزن **mezin** ەوە هاتووە و بە مانای گەورە **gewre** یە. مەهاباد وێنەیەکی دیکەی مەزناوا **mezinawa** یە.

**Me** مە (← مەقاش **meqash**).

**Mekare** مەکارە (← مەقاش **meqash**، ← مەگریجەنی **megrîcenî**).

**Mekîne** مەکینە (ئەو ئامێرەیە کە دەزگەیەك دەخاتە کار). وشەیەکی ئەوروپاییە کە لە فەرەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزیدا هەیە: بە ئەڵمانی **maschine** و بە فەرەنسی **machine** و بە ئینگلیزی **machinery** و بە لاتینی **machina**. وشەی میکانیك **mîkanik** کە بە مانای جووڵان

و بزووتن cûlan û bizûtin ە، هەر لەم بنەڕەتەوە هاتووە.

Meko مەکۆ/ مەکۆك mekok (← مەگریجەنی megrîcenî).

Mekok مەکۆك (← مەقاش meqash).

Mel مەل (پەلەوەر pelewer، باڵدار baldar، باڵندە bal'inde) مەل mel لە مەر mer ەوە هاتووە کە دەنگی ر r ێی کۆن بووە بە ل l. "مەر mer" و "مر mir" هەردووکیان بە مانای پەلەوەر pelewer دێن. مر mir لە وشەی ← مریشك mir + îshk (واتە: مەلێکی بچووك). مراوی mirawî mir + awî واتە: مەلی ئاوی melî awî (پەلەوەری ئاوی pelewerî awî). مر mir بە پەهلەوی مورڤ murv ە. کە بە کوردیی فەیلی "مرخ mirx"ە.

لە زمانی کوردیدا قەلمراو qelmiraw هەیە، ئەو قەلەیە کە وەك مراوی دەتوانێ بچێتە نێو ئاو. "عەینە مەل eyne melʿ" کە بە کوردیی هەورامی "ئاینە مەل ayne mel" ی پێدەڵێن، بە مانای: مەلی فێلباز melî fêlbaz ە. ئاین ayin وشەیەکە کە یەکێك لە ماناکانی فێل fêl ە. (سەرنجی وشەی: ئاین و ئۆین ayin û oyin بدە) کە وشەی ئۆین oyin بە مانای یاری yarî یە و کەوتووەتە زاری ترکییەوە. دەنگی "ع" کە لە بنەڕەتدا لە زمانی کوردیدا نییە، بە زۆری، لە جیاتی بزوێن (vowel) ی درێژ دێ. بۆ وینە دەنگی a لە وشەی کانی kanî دا و لە شێوەزاری کوردیی رۆژئاوادا دەبێتە ع eʿ و دەگوترێ کەعنی keʿnî. شایانی باسە، بە پێی

میتۆلۆژیای کورد (ئێزدی و یارسانی) ڕەوانی ئێزدانی لە پێش ئاڤراندنی گەردووندا، لە شێوەی مەلێکدا بووە. مەل لە کن کوردی کۆن پیرۆز بووە، بۆ وێنە: سیمرخ **sîmirx**، کە مرخ **mirx** هەر وەك لە کوردیی فەیلیدا، مانای مەل **mel** ە. لە زمانی کوردیدا بە ← ئاڤژەنی **avjenî** دەگوترێ مەلە **mele** چۆنکە مرۆڤ بەسەر ئاوەوە هەردوو باڵی وەك مەل دەجووڵێنێ.

**Mele** مەلە (← مەل **mel**).

**Memik** مەمك < مەم **mem** + ـك **ik**. مەم **mem** لە (مام **mam** واتە: دایك **dayik**) ەوە هاتووە کە بە پازەندیش هەر مام **mam** ە. ـك **ik** پاشگرێکە بۆبچووککردنەوە بە نیشانەی خۆشەویستی.

**Mend** مەند (← مەنگ **meng**).

**Meng** مەنگ (← بەنج **benc** و پەنج **penc**).

**Menî** مەنی (← خواردەمەنی **xwardemenî**).

**Meqash** مەقاش/ مقاش **miqash**/ مەقاش **meqash** < مە **me** + قاش **qash**. قاش **qash** وێنەیەکی دیکەی کاش **kash** ە، بە گۆڕینی دەنگی ك **k** بۆ ق **q**. کاش **kash** لە کوردیدا بە مانای کێشکردن **kêshkirdin** دێ. مە **me** پێشگرێکە کە لە گەلێك نێوی ئامێر (ئالەت) دا هەیە. وەك ← مەکۆك **mekok** (ئامێرێکە جۆلا بەکاریدەهێنێ بۆ ڕستن، واتە: ڕێکخستنی جلك)، ← مەکارە **mekare** (ئامێرێکە دارتاش بەکاریدەهێنێ بۆ تاشینی دار)، مەتارە **metare** (ئەو

گومگومەیەیە کە ئاوی تێدەکرێ
کاتێك مروڤ بچێ بۆ شوێنی
دوور و لە ماڵی خۆی تەرە tere
ببێ، واتە: جیابێتەوە (⟵
تاراوگە tarawge)، مەگریجەنی
megrîcenî (مقەست
miqest/، تۆرتۆ torto
مەرازێکە بۆ بڕینی شت). مە
me کورتکراوەی ـ مایە maye
یەیە، کە لە زمانی کوردیدا
گەلێك مانای هەیە، یەکێك
لەوانە هۆ ho (وسیلە، سبب)
یە. مەقاش meqash یش
وشەیەکە لەو بابەتە پێکهاتووە،
واتە: لە مە (هو) + قاش. قاش
qash (وێنەیەکی دیکەی وشەی
کاش kash/ کێش kêsh ە، بە
گۆڕینی دەنگی ك k بۆ ق q،
(سەرنجی: رك rik و رق riq و
کین kîn و قین qîn و ... هتد
بدە). کەواتە: مەقاش meqash
مانای هۆی کێشکردن hoy
kêshkirdin واتە: هوی
راکێشان hoy rakêshan.
وشەی مەقاش meqash بە
شێوەی منقاش minqash
کەوتووتە زاری عەرەبی و، بە
شێوەی ماشە mashe کەوتووتە
زاری ترکییەوە.

**Meqel'î** مەقەڵی < مە me
(پێشگرێکە بۆ ئامێر amêr
(⟵ مەقاش meqash) + قەڵی
qel'î ـ کەڵی kel'î مەبەست لە
"کەڵی kel'î" کەڵە ئاگر kel'e
agir).

**Meř** مەڕ، کە بە کوردی مێشن
mêshin و میشنە mîshine
شی پێدەڵێن، بە پەهلەوی مێش
mêsh ە کە لە فارسیدا بووە بە
میش mîsh. دەنگی ش sh
گۆڕاوە بە ڕ r. وەك چۆن دەنگی
ش sh لە وشەی چوارمەشقی

chwarmeshqî دا گۆڕاوە بە ر r و بووە بە چوارمێردەکی chwarmêrdekî (سەرنجی پاش ـ شێو pash-shêw بدە کە بووە بە پار ـ شێو -par shêw) وشەی مێش mêsh لە کوردیی باکووردا بووە بە مێهـ mêh، کە لەمەوە وشەی مێهتن mêhtin واتە: مژین mijîn (دۆشین doshîn ی مەڕ) وەرگیراوە. وشەی مەڕ mer/مێهـ mêh (مێش mêsh) پێوەندیی بە روون rûn و چەوری chewrî یەوە هەیە (← مەشکە meshke).

**Merg** مەرگ (مردن mirdin) بە ئاڤێستایی مەهرگە mehirge یە. لە فارسی و کوردیدا وەك: مەرگ merg بەکاردەبرێ و لە فەڕەنسیدا mort و بە زمانی ئەڵمانی Mord بە کوشتن و مراندن دەگوترێ.

**Mesaj** مەساژ. هەواڵدانان بۆ یەکێك، بەتایبەتی لە کاتی تەلەفۆنکردندا، ئەگەر ئەو کەسە خۆی لەسەر تەلەفۆن نەبێ. بە ئینگلیزی و فەڕەنسی message ە و، وشەکە لە زمانە ئەوروپاییەکانەوە وەرگیراوە.

**Mesh** مەش، لە "مشی" عەرەبییەوە نەهاتووە کە مانای "رۆیشتن بە پێ" یە، بەلکو بنەڕەتێکی هیندۆئەوروپایی هەیە. سەرنجی وشەی marche ی فەڕەنسی و marschieren ی ئەڵمانی بدە کە بە مانای رۆیشتن و کەوتنەڕێ یە. مەش mesh کورتەی مارش marsh ە.

**Meshke** مەشکە، پارچە پێستەیەکی مەڕە، جاروبار دەباخیش دەکرێ و بەکاردەبرێ بۆ شڵەقاندنی ماست mast، کە لەوەوە روون و دۆ لە یەك جیادەکرێنەوە. مەشکە meshke بە پەهلەوی

مەشك meshk ە، تەنانەت پێستی مەڕ و بزن کە دەباخیکرا بێ پێیدەگوترێ مێشن mêshin. مەش mesh/مش mish لە بنەڕەتدا مانای چەوری chewrî و روون rûn ە (⟵ چەور chewir). ئاینی عیسایی، کە پاش ئاینی زەردەشتی پەیدابوو، عیسای نێونا مشێح mishêĥ واتە: سڕراو (هەنووراو) بە روون، بە روون چەورکراو. وشەی "مشێح mishêĥ" کە لە ئارامیدا بەکاردەبرێ، لە عەرەبیدا بووە بە "مسیح" کە وشەی "مسح" ی عەرەبی بە مانای سڕین siřîn لە وەوە هاتووە.

Metare مەتارە (⟵ مەقاش meqash).

Meter مەتەر/⟵ Dayik دایك/ Mater ماتەر، وشەیەکی کۆنی هێندۆئەوروپاییە. بە ئەڵمانی Mutter، بە ئینگلیزی Mother. بە فارسی مادر mader.

Metrlewêz مەترلەوێز. فەڕەنسیە mitrailleuse

Mewîj مەویژ (⟵ مێوژ mêwij).

Meydan مەیدان، لە پەهلەویدا هەر مەیدان meydan ە.

Meykut مەیکوت/ مێکوت mêkut (⟵ مەقاش meqash).

Meze مەزە، ئەو خواردنەیە کە لە گەڵ خواردنەوەی ئەلکۆلی، وەك بیرە و مەی و ئارەق دەخورێ بۆ تام و چیژ. کورد دەبێژن: مەزەم نەکردووە، واتە: نەمچێشتووە. مەزە meze لە مژ mij ەوە دێ کە بە پەهلەوی مێچەك mêchek ە. بە کوردی دەگوترێ: تۆ مژێکی لێدە، واتە: تام و چیژەکەی تاقیکەرەوە، بزانە چۆنە. وشەی چێژ chêj یش هەر لە بەشی دووەمی وشەی مێچەك mêchek ەوە

(مێ **mê** + چەك **chek**) دێ. واتە: چەك **chek** > چێك **chêk** > چێژ **chêj** ئەوجا، وشەی مێخۆش **mêxosh** یش هەر لە مێ **mê** + خۆش **xosh** ەوە هاتووە کە مێ **mê** لێرەدا لە مێینە وە نەهاتووە، بەڵکو لە مژ **mij** ەوە هاتووە، واتە: تام و مژی خۆشە.

**Mezin** مەزن، لە وشەی ئاڤێستایی: مەزەنت **mezent** و مەزێنە **mezêne** وە هاتووە کە شێوەی دیکەشی هەیە، وەك: مەسەن **mesen** و مەس **mes** کە دوورنییە وشەی **mister** و **master** ی ئەوروپایی هاوڕەگی ئەم وشە ئاڤێستاییە بن.

**Mêhtin** مێهتن (مژین **mijîn**/دۆشین **doshîn**) (← مەڕ **meř**).

**Mêkut** مێکوت، لە مێخ کوت **-mêx kut** ەوە هاتووە، ئامێری کوتانی ← مێخ **mêx**.

**Mêrdezime** مێردەزمە، پیرهەڤۆك **pîrhevok**، جنۆکەیەکە مێرد تاقیدەکاتەوە. زمە **zime** لە ئەزمە **ezme** ەوە هاتووە، کە مانای تاقیکردنەوەیە (ئەزموون **ezmûn** تاقیکردنەوە).

**Mêsh** مێش، واتە: سپییەکی کەوەیی **sipîyekî kewî** (← شین باو **shîn baw**). هەروەها وشەی خۆڵەمێش **xol'emêsh** کە ڕەنگەکەی سپیەکی شین باوە لە مەوەوە هاتووە. مێش **mêsh** لە فارسیدا بووە بە مشکی **mishkî** و بۆ ڕەنگی ڕەش **resh** ی کاڵ بەکاردەبرێ.

**Mêsh** مێش، لە مە **me** و ئێش **êsh** ەوە هاتووە. مە **me** هۆ **ho** یە. (← مەقاش **meqash**). واتە: هۆیەك بۆ ئێش و ئازار گەیاندن، کە هەر لە کوردیدا وشەیەکی دیکە هەیە بۆ مێش **mêsh** کە مەگەز (مە ـ گەز

(me-gez (هۆی گەزین hoy gezîn) و لە فارسیدا بووە بە مگس meges. مێش mêsh بە پەهلەوی مەخش mexsh ە.

Mêwij مێوژ/ Mewîj مەویژ ، واتە: ترێی وشك (هیشك) tirêy hîshk. مێوژ mêwij > مێو mêw + ـژ ij ـ، مێو mîw لە زمانی کوردیدا بە ترێ tirê (تەری terî) دەبێژن. دەگوترێ: دارمێو darmêw واتە: داری ترێ tirê darî. مێوژ لە بنەرەتدا مێووشك mêwwishkە واتە: ترێی وشك. مێووشك mêwwishk > مێووش mêwish > مێوژ mêwij. مێوژ mêwij کەوتووەتە زاری فارسییەوە بە شێوەی "مویز" mewîz، چۆنکە لە زمانی کوردیدا لە پاڵ وشەی "مێوژ mêwij" ەوە وشەی مەویژ mewîj یش هەیە کە لە بنەڕەتدا مێوویشك mêw wishk ە. فەرهەنگی فارسی معین ئاماژە بەوە دەکا کە وشەی "مویز" ی فارسی لە کوردییەوە وەرگیراوە.

Mêx مێخ، لە پەهلەویدا: مێگ mêg ە و لە فارسیدا بووە بە میخ mîx و بە شێوەی مخ mih کەوتووەتە زاری ترکییەوە.

Mêxosh مێخۆش (⟵ مەزە meze).

Mêz مێز، وەك ئامێری نان لەسەر خواردن، یان بەکارهێنانی بۆ کاروباری نووسین، وشەیەکی هیندۆئەوروپاییی کۆنە. بە ئاڤێستایی مێز mêz و میەزە miyeze کە مانای "مێوان mêw/van"، یان ئەو شتانەیە کە بۆ مێوانداری بەکاردەبرێن (مەزە meze). بە زمانی لاتینی مێنزا mensa مانای مێز mêzە

## M م

که ئەورۆش لە زمانی ئەڵمانیدا بەکاردەهێنرێ بۆ نێوبردنی ئەو چێشتخانەیەی که خوێندکارەکانی زانستگەکان و کاربەدەستانی، نان دەخۆن لەوێ. دەبێ بگوترێ کە دەنگی س s لە زمانی ئەڵمانیدا وەك ز z (زێ) دەردەبڕدرێ، واتە: دەگوترێ "مێنزا" نەك "مێنسا". وشەی مێز **mêz** کەوتووەتە زاری ترکی و عەرەبییەوە. لە ترکیدا بووە بە ماسە **mase** و لە عەرەبیدا "ماصة" و "منصة". فارسەکان وەك میز **mîz** دەریدەبڕن.

**Mêzer** مێزەر، ئەو پارچە پەڕۆیەیە کە بە زۆری، پیاوە ئاینییەکان لە کوردستاندا، دەیبەستن بە سەریانەوە. ئەم وشەیە لە وشەی یۆنانیی کۆن میترا **μίτρα** **(mîtra)**وە هاتووە، کە کەوتووەتە زمانی لاتینی و ئەڵمانی و ئینگلیزییەوە. بە ئەڵمانی میترا **mitra** یە و بە فەرەنسی میتر **mitre** ە و بە ئینگلیزی مایتەر **mitre** ە. وادیارە سەردەمی ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆئەو زەمانەی (← زەمان **zeman**) کە پێوەندیی زانستکارانی کورد و یۆنانییەکان لەڕێی زانستگەی هاران **haran** (کە عەرەبەکان کردوویانە بە حَرّان) ی نێزیك ئورفە لە باکووری کوردستان، بە هێز بووە. زمانی عەرەبی ئەم وشەیەی لە کوردییەوە وەرگرتووە و کردوویەتی بە "مئزر".

**Micêwir** مجێور/ مجەور **micewir**. لە مووچەوەر **mûchewer**، یان مزوەر **mizwer** ەوە هاتووە، کە مووچە **mûche** و مز **miz**

هەردووکیان، پێوەندییان بە پارە، یان بە شتێکەوە هەیە کە دەدرێ بە کەسێك، بەرامبەر بە کارێك، کە ئەو کەسە راگیرابێ بۆی.

**Milhuř** ملهوڕ **Milhor** ملهۆر < مل **mil** + هوڕ **huř**. هور **hur** (هۆر **(hor** مانای ← (ئە)ستوور **e(stûr)** ە. هور **hur** و ستوور **stûr** هەر یەك وشەن، بەڵام دەنگی ه **h** وس **s** جێی یەکیانگرتووە. بۆ وێنە سێ **(3)** لە کوردێی کرمانجکی (زازاکی) دا هره **hire** یە. کەواتە: ملهور **milhur** ملـ (ئە)ستوور **mil(e)stûr** ە و بە کەسێك دەگوترێ کە زۆردار **zordar** و دەستوەشێن **destweshên** بێ.

**Minawere** مناوەرە. وشەیەکی ئەوروپاییە، کە لە بنەڕەتدا لاتینییە**manu operari** واتە: بەدەست جێبەجێکردن. لە فەڕەنسیدا بووە بە **manoeuvre** و لە ئینگلیزیدا **maneuver** و بە ئیتالیایی **manovra** و بە ئەلمانی **manöver** و لە عەرەبیدا مناورة.

**Mindal’** منداڵ **Mindar** مندار، منداڵ < مند **mind** + ئاڵ **al’** < منج **minc** + ئار **ar**. دەنگی ج **c** لە منج **minc** دا بووە بە د **d** و ئار **ar** یش بووە بە ئاڵ **al’**. ئار **ar** لە ئاردن **ardin**/ ئاوردن **awirdin** ەوە هاتووە. وشەکە لە بنەڕەتدا منج ئار **minc ar**. منج **minc** و بنج **binc** هەردووکی بە مانای بنەڕەت **bineřet** و تۆو **tow** دێن لە زمانی کوردیدا. واتە: لە تۆوەوە دروست بوو، لە تۆوەوە هاتوو. وشەی منداڵ/مناڵ **mindal’/minal’** پێوەندیی

نییه بە "مال و منال" ەوە چونکە ماڵ mal' ی کوردی و مال mal' ی عەرەبی دوو وشەی بنەڕەتجیاوازن. (← ماڵ mal'). بێجگە لەمەش، وشەیەکی کۆنی ئێرانی هەیە کە لە وشەی منداڵ mindal' ەوە نێزیکە، ئەوەش مەنتەرە mentere یە.

**Mirîshk** مریشك (← مەل mel).

**Mirov** مروڤ/ مەرڤ meriv/ مرۆ miro. مرۆڤ mirov کە بە مانای ئادەمزاد ademzad و خەلك xelk دێ، لە پەهلەویدا "مەرتۆم mertom" ە و لە فارسیدا بووە بە "مردم" (مەردوم merdom). دەنگی م m ی پەهلەوی، بەزۆری، لە کوردیی ئەورۆدا بە شێوەی w و یان ڤ v دێتە دەربڕین. مەرتۆم mertom < مەرتۆڤ mertov < مرتۆڤ mirtov < مرۆڤ mirov. وشەی مەرتۆڤ mertov لە ← مەل mel و تۆڤ/تۆو tov/w واتە: تۆوێك کە لە بووەی پیرۆزەوە هاتووە. (← مەل mel).

**Mishe** مشە (← مەشەخۆر mishexor).

**Mishema** مشەما، بە پارچە پەڕۆیەك دەگوترێ، کە مۆمی تێهەلسوورابێ و چەورکرابێ. ← مش mish مانای ← چەوری chewrî یە. هەر لە کوردیدا بۆ مشەما mishema وشەی مۆمینە momîne و مۆمناو momnaw یش هەیە. تەنانەت وشەی مۆمیا momya کە دەرمانێکە، لەشی مردووی پێ چەور دەکەن، بۆ ئەوەی نەڕزێ، لە مۆمکردن momkirdin ەوە هاتووە، واتە:

لە چەورکردنەوە هاتووە (← چەور chewir، ← شەم shem).

**Mishexor** مشەخۆر/ **Mifexor** مفەخۆر. لە کوردیی ئەوڕۆدا بە مانای شتێك دێ کە بە خۆڕایی بخورێ، هەروەك لرف لێدان lirf lêdan. لرف lirf قووتدانە بە پەلەوە و، لە دەنگەکەیەوە ئەو نێوەی گرتووە. (← مووچە mûche).

**Mishmish** مشمش، بە کوردیی باکوور بە قەیسی qeysî دەبێژن. وشەکە لە مژمێوژ mijmêwij ەوە هاتووە، واتە: تام مێوژ tammêwij. مشمش هەر بەو شێوەیە کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە (← مەزە meze).

**Misk** مسك، جۆرە بۆنێکە. لە وشەی سانسکریتی موسکە muske ەوە هاتووە کە لە یۆنانیدا بووە بە mosxos (μόσχος) و زمانی عەرەبی، وەك خۆی، بە شێوەی مِسك وەریگرتووە. لە کوردیدا جۆری بۆنەکەی پێچەوانە دەبێتەوە لە بۆنی خۆشەوە بۆ بۆنی ناخۆش، سەرنجی وشەی بۆمچك bomichk < بۆن مچك bon michk بدرێ. کە مچك michk و مسك، یەك بنەڕەتیان هەیە.

**mizir** مزر (واتە تامی وەك تامی ماستی ترش). ماست ترش mast tirsh < مەز ترش mez tirsh < مەزتر meztir < مزتر miztir < مزر mizir (← ماست mast).

**Mîna** مینا، بە مانای وێنە wêne و نموونە nimûne و وەك wek دێ و، میناکی mînakî ش بە مانای (معنوی) دێ. مینا mîna

# M م

له وشەی ئاڤێستایی مینو mînu ەوە هاتووە کە بە پەهلەوی ماناك manak و مانە mane یەو لە فارسیدا بوە بە (مانند) مانەند manend. مینا mîna هاوماناى وشەی وێنە wêne یە. مینا mîna بووە بە وینا wîna و ئەوجا وێنا wêna و دوایی وێنە wêne (← ماتەمینی matemînî).

**Mînak** میناك (وەك /wek وەکو /weku وەکی wekî) بە پەهلەوی ماناك manakەو، لە فارسیدا بووە بە (مانند) مانەند. لە زمانی کوردیدا میناك mînak یش هەیە بۆ (مثال). (← مینا mîna).

**Mînga** مینگا، وشەیەکی دیکەی کوردییە بۆ ← مەر /mer ← پەز pez. مینگا mînga لە مین mîn + گا ga ەوە هاتووە. مین mîn/مینا mîna واتە: وەك wek/وەکی wekî/وەکو weku. مینگا واتە: لە گا دەچێ wekî ga/v.

**Mîqat** میقات، کورد دەبێژن: کاتژمێرەکە میقاتە. واتە: کاتەکە بە ڕاستی و تەواوی پێشاندەدا. میقات کردن mîqat kirdin ماناى پێشکەوتن و پاشکەوتنی کاتژمێرەکە نەهێلراوە. میقات mîqat < میـ mî + قات qat. قات qat و کات kat هەردووکیان یەك وشەن. دەنگی ق q و ك k جێگۆڕکێیانکردووە. وشەی کات kat شێوەی زۆرە، لەوانە: قاف qaf و گاڤ gav و کاو kaw. "لە قافێ خۆیدا قسە بکە" واتە: "لە کاتی خۆیدا..."، "گاڤا ئەز لە کەرکووك بووم" واتە: "کاتێك ئەز لە ..."، "لە ناکاو

هات" واتە: "لە کاتی خۆیدا نەهات". میـ mî کورتەی مینا mîna یە کە، لە کوردیی باکووردا باوە و بۆ "وەك، پڕ بە پڕی شتێك" بەکاردێ. کەواتە: میقات mîqat مینا کات mîna katە، واتە: وەك کاتەکەیە بە تەواوی.

Mîwan میوان/ mêvan مێڤان (← مێز mêz).

Mode مۆدە. بەشتێك دەگوترێ کە لە کاتێکی دیاریکراو و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ← باو baw بێت و برەوی هەبێ. وشەکە لە وشەی لاتینی modus ەوە وەرگیراوە، کە لە فەڕەنسیدا بووە بە mode مۆد. بە ئینگلیزی mode ە و بە شێوەی موود moud دەردەبڕدرێ.

Modêl مۆدێل وشەیەکی ئەوروپاییە بەمانای جۆر cor و نموونە nimûne دێ. بە فەڕەنسی modèle و بە ئەڵمانی modell و بە ئینگلیزی model ە.

Modêrin مۆدێرن. تازەبابەت، شتی سەردەمی نوێ. لە وشەی لاتینی modernus ەوە هاتووە کە لە فەڕەنسیدا بووە بە مۆدێرن moderne و لە ئینگلیزیدا modern.

Mom مۆم (← shem شەم).

Mostre مۆسترە. شتی سەیروسەمەرە. وشەکە دەبێ زۆر کۆن بێ. لە زمانە ئەوروپاییەکاندا بۆ شتی سەیروسەمەرە وشەیەکی لەم جۆرە هەیە. بە ئەڵمانی mysteriös ە، کە لە وشەی یۆنانی (μυστηριώδης)ەوە هاتووە و، بە هێندەك نهێنیی خوایەتی گوتراوە، کە بەلای خەلکەوە سەیربووە. لە ئینگلیزیدا mysteriousە.

Motor مۆتۆر (ئامێری جووڵان). وشەیەکی ئەوروپاییە. بە

ئینگلیزی motor و بە ئەڵمانی Motor و فەڕەنسی moteur. لە کوردیدا زۆر جار بە شێوەی ماتۆر mator دەگوترێ. (بۆ وێنە ماتۆر سایکل) چۆنکە ئەوەش لە ئینگلیزییەوە وەرگیراوە. وشەی مۆتۆر motor بە ئینگلیزی بە جۆرێك دەردەبڕدرێ کە لە ماتۆر mator ەوە نزیکە.

**Mûche** مووچە/ **Mûshe** مووشە. جۆرە خواردنێکە، یان پارەیەکە کە کوردی سەر بە ئاینی یارسان yarsan وەك خێر بەسەر خەلکدا دابەشیدەکەن و، ئێستە بەکاردێ بۆ کرێی کاربەدەستانی میری. لە زمانی کوردیدا وشەی مووتگ mûtig هەیە کە بە مانای بەشێکە، یان کەمێکە لە شتێك. دەبێ مووتگ mûtig بووبێتە مووچگ mûchig و ئەوجا مووچە mûche. وشەی مشەخۆر mishexor، کە بە کەسێك دەگوترێ بەخۆڕایی شتێك بخوات، یان بە بێ زەحمەتکێشان، وەربگرێت، لە وشەی مووچە mûche/ مووشە mûshe وە هاتووە، چونکە مووچە mûche لە بنەڕەتدا پارەیەك بووە بە خۆڕایی دراوە بە خەلك، لەمەوە وشەی "مەواجیب" پەیدابووە.

# N ن

**Nahît** ناهیت. نێوێکی ژنانەیە، کورتەی ئاناهیتا **Anahîta** یە کە لە ئاینی زەردەشتیدا (← زەردەشت **zerdesht**) ئیزەدی ئاوە. ئاڤێستا ئاناهیتا وەك کچێکی جوان و گەڵەگەت پێشان دەدا.

**Nakaw** ناکاو/ نەکاو **nekaw**/ نشکاڤ **nishkav**. هەرسێ وشەکە هاومانای یەکن. واتە: شتێك لە کاتی خۆیدا روونەدا. ناکاو **nakaw** > نا **na** + کاو **kaw**. کاو **kaw** و کات **kat** و گاڤ **gav** و قاف **qaf**، هەرچواریان وێنەی جیاوازی یەك شتن کە ئەوەش کات **kat** ە. نەکاو **nekaw** واتە: نەکات **nekat**. نشکاڤ **nishkav** > نـ **n** + ش **sh** (ژ **j**) + کاڤ **kav** (گاڤ **gav**) واتە: نەژگاڤ **nejgav** واتە: نەلگاڤدا **ne le** (نە لە کاتدا **neligavda** (**katda**). (ئەو مەری نشکێڤە **ew merî nishkêve** دەرکەت (**derket**).

**Namo** نامۆ. مۆ **mo** کورتکراوەی کەمۆ **kemo** یە کە مانای هۆگر **hogir** و ماڵی **malî** یە. دەستەمۆ **destemo** هۆگری دەست و ماڵ دەگەیەنێ. نامۆ **namo** = نامالّی **namal'î**

**Namûs** نامووس (خوورەوشت **xûřewisht**) لە وشەی یۆنانی **nómus** (نۆموس **νόμος**) ەوە هاتووە، کە بە مانای نەریت **nerît** و ← قانوون **qanûn** دێ و کەوتووەتە زاری عەرەبی و فارسی و ترکییەوە.

**nankor** نانکۆر/ نانکوێر **nankör** واتە: سپڵە **sipl'e**/ پێنەزان **pênezan**. بە کەسێك دەبێژن

که چاوی بەرامبەر ئەو نانەی که هی خەلك بووە و، خواردوویەتی کۆر بێ. ئەم وشەیە، هەروەك خۆی چووەتە زاری ترکییەوە بە شێوەی nankör.

**Narbe** ناربە، بە گۆپکێك دەگوترێ که پشکووتبێ. < نارب **narb** + بە **be**. لە ئەڵمانیدا، بە پارچە گۆشتێکی بچووك، که لە دەموچاو، یان پێستی لەش هاتبێتە دەرێ دەگوترێ ناربە **Narbe**.

**Narinc** نارنج، میوەیەکە لە خێزانی ← پرتەقاڵ و ← کەبات و لالەنگی. ئەم وشەیە لە نار **nar** و رەنگ **reng** ەوە هاتووە. واتە: لە رەنگی نار **nar**، که نار **nar** هەنار **henar** ە. لالەنگی بە کوردی نارنگی **naringî** یە، واتە: نار رەنگی **nar rengî** رەنگی وەك نار.

**Naringî** نارنگی (← نارنج **narinc**).

**Nashta** ناشتا، واتە: خواردنی شتێك لە خورێنێ، واتە: کەسێك که هێشتا نانی نەخواردووە و برسییەتی و خەریکی نانخواردنە. شتا **shta** لە زمانی سانسکریتدا مانای خواردن **xwardin** ە. کەواتە: ناشتا **nashta** مانای نەخواردووە. هەر لە وشەی شتا **shta** وە وشەی "إشتهاء" ی عەرەبی وەگیراوە، لە رێی زاری فارسییەوە، که دوو دەنگی شت **sht** بەیارمەتیی بزوێنی **i** دەردەبڕدرێ.

**Nawbijîkirdin** ناوبژیکردن/ نێوبژیکردن **nêwbijîkirdin**/ نافجی کرن **navcî kirin** < نێو/ناو **nêw/naw** + بـ **bi** + ژی **jî** + کر(د)ن **kir(d)in**، واتە: نێوان **nêwan** + بـ **bi** +

# N ن

ciyakir(d)in جیاکر(د)ن
واتە: نێوانی دوو لا، لە یەکدی جیاکردنەوە. دەنگی ج c بووە بە ژ j وەك چۆن وشەی سەرژێکرن serjêkirin کە لە سەرجیاکردن serciyakirdin ەوە هاتووە. (← شەرژێکرن sherjêkirin).

**Nax** ناخ، واتە: بەشی نێوەوە (ناوەوە)ی شتێك (لە ناخی دڵمەوە دەبێژم... هتد.) > ناو naw + ← ئاخ ax، ناو naw (نێو nêw)، ئاخ ax (← خاك xak، زەوی zewî، بنی شتێك binî shtêk).

**Nay** نای/ نەی ney، ئامرازێکی مۆزیکی کۆنی کوردە. بە پەهلەوی نای nay، بە کوردی ← بلوور bilûr و ← بلوێر bilwêr یشی پێدەڵێن.

**Nawaze** ناوازە/ نەمازە nemaze
واتە: شتێکی تایبەتی و بژاردە .taybetî, bijarde > نا na + واز waz ← ە e + واز waz مانای کراوە kirawe/ ڤەکری vekirî و بەرەللا berella واتە: شتێکی گشتی gishtî، نەك تایبەتی nek taybetî. ناوازە nawaze واتە: شتێك کە نە بەر بەرەللا و گشتیە، بەلکو تایبەتی و بژاردەیە. لە کوردیی باکووردا بووە بە نەمازە nemaze.

**Nebez** نەبەز (← Bezîn بەزین).

**Neft** نەفت (← نەوت newt).

**Negrîs** نەگریس/ نگریس nigrîs (شریر)/ نەگریساندن negrîsandin. گریس girîs بە کەسێك دەگوترێ، یان بە شتێك دەگوترێ، کە بێهێز و خۆنەگرتوو و شلوشێواو بێ. گریس girîs لە گرسیس girsîs ەوە هاتووە. سیس sîs مانای ژاکاو و لە یەکهەڵپچراوە. گریس

girîs واتە: لە گرتنداندا سیسە، واتە: بە ئاسانی دەگیرێ. بەڵام نەگریس ne-grîs، بە پێچەوانەی گریس girîs ەوە، مانای وایە کە نا گیرسێ nagîrsê و ناگیرسێندرێ. بەم جۆرە نەگریس negrîs وشەی "شریر" ی عەرەبی و evil ی ئینگلیزی دەگرێتەوە.

**Nemaze** نەمازە (← ناوازە nawaze).

**Nerdîwan** نەردیوان/ ناردیوان nardîwan ← پەیژە peyje یە. > نەرد nerd + وان wan. نەرد nerd تەختەی نەردە. وان wan وێنەیەکی دیکەی بان ban ە، واتە: سەروو serû، ژووروو jûrû. نەردیوان nerdîwan واتە: ئەو تەختەیەی کە پێی سەردەکەویت بۆ ژووروو (سەروو). وشەکە کەوتووەتە ترکییەوە بە شێوەی merdiven.

**Nesax** نەساخ (ناساخ nasax) واتە: نەخۆش و ناتەواو و بیمار. نەساخ nesax لە پەهلەویدا: نەساك nesak ە کە بە مانای گەنیو genîw و خراپبوو و کەڵکپێوەنەماو دێ. ساخ sax پێچەوانەی نەساخ nesax ە و مانای تەندروستە. ساخ sax بە شێوەی ساغ sağ کەوتووەتە زاری ترکییەوە.

**Nesen** نەسەن، قەڵافەت و باڵا و شێوەی مرۆڤ. نەسەن nesen لە نەسەل nesel ەوە هاتووە > نە ne + سەل sel. سەل sel ئامێرێکە بۆ پاڵاوتن و پاککردنەوەی پلاو pilaw/v لە ئاوەکەی (پلاوپالێو pil’awpal’êw). نەسەن nesen (نەسەل ne-sel) واتە:

شتێك كە هەر وەك خۆی بێ، بێ پالاوتن و جوانكردن بێ.

**Netekîn** نەتەكین (بە شوێنێك دەگوترێ كە پیرۆزبێ وەك گۆڕی چاكان، كە كەس نەوێرێ دەست ببا بۆی) < ne نە + tekîn تەكین. tekandin تەكاندن راوەشاندنی شتێكە بۆ هەڵوەراندنی تۆز، یان شتێكی دی لێی. نەتەكین netekîn مانای هیچی لێ هەڵناوەرێ و ناتەكێندرێ.

**Netewe** نەتەوە، لە ← رەتەوە retewe وە هاتووە كە ← رەچەڵەك rechel’ek ە.

**Netewî** نەتەوی (مخالف). تە(و)ڤی te(w)vî نەتەوی لە ویستن wîstin ەوە هاتووە. سەرنجی وشەی خۆشتەڤی xoshtevî لە بنەزاری بادینانیدا بدە كە بە مانای خۆشەویست xoshewist ە. نەتەوی = نەویستراو.

**Newal** نەوال، بە مانای شیو و شوێنی نزم دێ لە كوردیی باكووردا. < نە ne + وا wa + ل l. نە ne نیشانەی نەكردن (نفی)ە، وال wal لە وان wan ەوە هاتووە، كە وان wan وێنەیەكی دیكەی بان ban ە، واتە: شوێنی بەرز. تەنانەت ban بان، لە bala بالاوە هاتووە. نەوان newan واتە: شوێنێك كە بەرز نەبێ. هەر لە مەشەوە وشەی نەوی newî (نزم nizim) هاتووە. سەرنجی وشەی دانەواندن دا da + نە ne + وان wan + دن din (نزمكردنەوە nizim kirdinewe) بدرێ.

**Newe** نەوە، لە نوو (نوێ) زا nû(nwê)za وە هاتووە.

**Newî** نەوی، لە نزیك زەوی nizîk-zewî یەوە هاتووە.

**Newt** نەوت/ نەفت neft. وشەكە رووسییە НеФТЬ.

**Nexasme** نەخاسمە (نەخازمە nexazme) "نەخاسمە" لە کوردیی نێوچەی بادینانیدا بەکاردێ لە باتی ← "نەخوازەلا nexwazela".
نەخاسمە > نە ne + خاس xas + م m + ـە e، واتە: نەخوازمە nexwazme واتە: ئەوەیان، هەر ناخوازم. ئەمە بە عەرەبی "ناهیك عن" دەگرێتەوە. بە ئەڵمانی geschweige von بێدەنگبە لە....

**Nexwazela** نەخوازە لا، مانای ← "نەخاسمە nexasme" و "نەخازمە nexazme"یە.
نەخوازە لا > نەخوازە لە nexwaze le یە، واتە: لەو شتە نەخوازە، داوای مەکە.

**Neynek** نەینەك (← ئاوێنە awêne) کە گەلێك شێوەی هاومانای هەیە، وەك نەینۆك neynok، نەینك neynik، نوێنك nwênik. نەینەك neynek و هەموو ئەو وشە هاومانایانەی سەرەوە، لە: نۆنەك nonek و نوێنەك nwênek ەوە هاتوون. واتە: "نواندن niwandin"، پێشاندان pêshandan، بە جۆرێك کە کەسێك تەماشای "نەینك" دەکاو، وێنەی خۆی، یان شتێکی دیکەی تێدا دەبینێ. واتە: ← وێنە wêne ی شت دەنوێنێ.

**Nezend** نەزەند، لە: نەسەند nesend ەوە هاتووە، واتە: وەرنەگرتوو wernegirtû، نەسێن nesên.

**Nêzîk** نێزیك، بە ئاڤیستایی نەسە nese و ناسە nase و نەزدە nezde یە و، بە ئەڵمانی nahe یە و بە ئینگلیزی near.

وشەیەکی هیندۆئەوروپاییی کۆنە.

**Nijdevan** نژدەڤان، لە کوردیی باکووردا، بە جەردە **cerde** دەبێژن نژدەڤان **nijdevan**. نژد **nijd** مانای چزوو **chizû** ە، کە نژد **nijd** پێوەندیی بە نەشتەر **neshter** ەوە هەیە، کە نەشتەر **neshter** لە نەشت **nesht** و ـەر **er** (پاشکۆی بکەر) ەوە دێ. واتە: چزوودار. کە واتە: نژدەڤان **nijdevan** کەسێکە ئامێرێکی تیژی پێیە، واتە: چەك بە دەستە. وشەی ← نژدار **nijdar** کە بە دوکتۆری برینکاری (جراحة) دەگوترێ، پێوەندیی بە مەوە هەیە. وشەی نوژدار **nujdar** کە لەم ساڵانەی دواییە دا بۆ هەموو جۆرە ← بژیشك **bihîshk** یك دروستکراوە، راست نییە.

**Nik** نك (← باخەڵ **baxel'**).

**Nimêne** نمێنە (← **niwandin** نواندن).

**Nimûne** نموونە (← نواندن **niwandin**).

**Niqûch** نقووچ/ **Nuqurch** نوقورچ/ **niqurchk** نقورچك هەرسێکیان یەك مانایان هەیە. نوقورچ **nuqurch** < نوق **nuq** + رچ **rich**. نوق **nuq** وێنەیەکی دیکەی نووك **nûk** ە. نووك **nûk** بە شتی تیژ و باریك دەبێژن. رچ **rich** مانای رێی باریك و تەنگ (سەرنجی وشەی رچە **riche** شکاندن **shikandin** بدرێ، واتە: کردنەوەی رێیەکی باریك لە شوێنێکی سەختدا) کەواتە: نوقورچ **nuqurch** بە مانای بە شتێکی تیژ (لێرەدا ← نینۆك **nînok**) کردنەوەی

# N ن

رێیەکی تەنگ لە گۆشتدا. نوقورچ nuqurch بە فارسی نیشگون nîshgun ە کە نیش nîsh بە فارسی نەشتەر neshter و چزوو chizû ە.

**Nishkav** نشکاڤ (← ناکاو nakaw/ نەکاو nekaw).

**Niwandin** نواندن، بە مانای پێشاندان pêshandan و خستنەڕوو xistineřû دێ. نواندن niwandin > نوان niwan + دن din. نوان niwan لە نۆران noran و نوارین niwarîn (روانین riwanîn)ەوە دێ. لە نواندن niwandin وشەی نوانە niwane دروستبووە. نوانە niwane > نوێنە niwêne > وێنە wêne. هەروەها نوێنە niwêne و نمێنە nimêne هاومانای یەکن، کە وشەی نموونە nimûne لە نمێنە nimêne ەوە هاتووە. "نموذج" ی عەرەبی لەمەوە هاتووە.

**Nixav** نخاڤ (← نخرۆ nixro).

**Nixro** نخرۆ/ نخرۆچوون nixro chûn (رۆچوون ro chûn). وشەکە لە کاری نخفتن nixiftin ەوە هاتووە کە بە مانای داپۆشین daposhîn ە. نخفتن nixiftin > ن ni + خفتن xiftin (خەوتن xewtin، راکشان rakishan)، ن ni لە نان nan ەوە دێ، کە کورتەی دانان danan ە. (ئەو بەردەم نایە سەر ئەو بەردە) (دەستت بنێ ژێر مێزەکە). نخاڤ nixav وشەیەکی دیکەیە بۆ لێفە lefe. "لحاف" ی عەرەبی لەم نخاڤ nixav ەوە وەرگیراوە. واتە: نانە سەر خەوتوو.

**Nizim** نزم. لە نك/کن - زەمین nik/kin-zemîn ەوە هاتووە (← zewî زەوی).

## N ن

**Nînok نینۆک > نی nî + نۆک nok.**
**نی nî > نەیژە neyje (شتێکی باریک). نۆک nok > نووک nûk (شتی تیژ) (← نقورچ niqurch).**

**Nîshtiman نیشتمان (← Dîmane دیمانە).**

**Nok نۆک، لە پەهلەویدا نۆ(خ) ڤەت nox(v)et ە و لە فارسیدا بووە بە نخد noxod.**

**Noker نۆکەر، وشەیەکی مەغۆلییە.**

# O ئۆ

**Ofer** ئۆفەر. مانای خستنەڕوو، یان پێشکێشکردنی نەخشەیەك، یان شتێك بە کەسێك. لە وشەی **offer** ی ئینگلیزییەوە هاتووە کە بە فەڕەنسی **offre** ە. بنەڕەتی وشەکە لاتینییە.

**Oyin** ئۆین (← مەل **mel**).

# P پ

**Pak** پاك، بە پەهلەوی و فارسی هەر پاك **pak**ە.

**Pal'** پاڵ (**tenîsht** تەنیشت ← **Baxel'** باخەڵ).

**Pal'to** پاڵتۆ/ پاڵتاو **pal'taw** لە وشەی فەرەنسی مانتۆ **manteau** وە وەرگیراوە. دەنگی م **m** بووە بە پ **p** و دەنگی ن **n** بووە بە ڵ **l'**.

**Pan** پان، بە پەهلەوی: پەهناك **pehnak**ە.

**Panêl** پانێل، وشەیەکی ئەوروپاییە و لە بنەڕەتدا فەڕەنسییە **panel**ە و بە مانای "گۆڕەپان" بەکاربراوە. ئێستە بەکاردەبرێ بۆ شوێنێکی کۆبوونەوە، کە بەشداران بیروڕای خۆیان دەربڕن.

**Pantol** پانتۆڵ/ دوولنگە **dûlinge**، وشەیەکی ئەوروپاییە، بە فەرەنسی **pantalon** و بە ئیتالیایی **pantaloni**.

**Par** پار، (← پێرار **pêrar**).

**Paradoks** پارادۆکس. وشەکە لە بنەڕەتدا **παράδοξος** (**parádoxos**)ی یۆنانیی بووە، بە مانای پێچەوانەی بیروڕا. **pará** پێچەوانە **pêchewane** و **dóxa** بیروڕا **bîrûra**. پاشان چووەتە زمانی لاتینییەوە بە شێوەی **paradoxus** بە مانای ناتەبا **nateba**، نەگونجاو **neguncaw** و بە شێوەی **paradox** لە زمانی ئینگلیزی و ئەلمانیدا و **paradoxe** لە زمانی فەڕەنسیدا.

**Parastin** پاراستن، لە ئاڤێستادا: پارشتە **parishte** یە.

**Paraw** پاراو (شتێك کە ئاوی زۆر تێدابێ) لە: پڕئاو **piřaw**ەوە هاتووە.

**Pare** پارە، بە مانای بەش **besh** دێ. لە ئاڤێستادا پارە **pare** مانای

# P پ

واو waw (قەرز) ە و بە پەهلەوی پارەك par(ek)ە. لە کوردیی ئەورۆدا بۆ ← دراو diraw بەکاردێ. پارە pare واتە: بەش besh بچووککراوتەوە و، کراوە بە پارچە parche واتە: بەشێکی بچووك (← چە çe نیشانەی بچووکردنەوەیە). پار par لە زمانی ئەڵمانیدا بە بەشێك لە شتێك دادەنری ein par davon واتە: "بەشێك لەوە". پارە pare (دراو) چووەتە زاری ترکییەوە و بووە بە pere.

**Parshêw** پارشێو (نانێکە دەمەوبەیانی دەخورێ لە مانگی رەمەزاندا، لەلایەن ئەوانەوە کە رۆژوو دەگرن). پارشێو parshêw لە پاش pash + شێو shêw ەوە هاتووە. واتە: ئەو کەسەی کە شێوی ئێوارێی (نانی ئێوارێ)ی خواردووە دوای ئەو شێوە، ئەو پاش شێو pashshêw ە دەکا. زۆرجار کە دەنگی دوو ش sh بەریەکدەکەون دەنگی ش sh ی یەکەم دەبێتە ر r.

**Patirî** پاتری، وشەیەکی ئەورووپاییە، بە ئەڵمانی: Batterie، بە ئینگلیزی Battery لە بنچینەدا لە زمانی کلێتی و لاتینییەوە وەرگیراوە و لە عەرەبیدا کراوە بە "بطرية".

**Pechete** پەچەتە (← پەتە pete).

**Pej** پەژ (پەز pez) (← پەشمەك peshmek).

**Pejim** پەژم (خوری xurî، هەری herî) < پەژ pej + ـم im. پەژ pej وێنەیەکی دیکەی ← پەز pez ە. واتە: مەڕ و بزن meř û bizin. ـم im کورتکراوەی موو mû وە. واتە: پەژموو pejmû

(پەزموو pezmû) مووی پەز
mûy pez. پەژم pejim ی
کوردی لە فارسیدا بووە بە پشم
peshm. لەبەر ئەوەی پەژم
pejim کەرەسەیەکی فشەڵە و
پتەو نییە، بە قسەی فیشال
fîshal' و بێسەروبەر دەگوترێ.
پەژم pejim.

Pekkû پەککوو، وشەیەکە بۆ
سەرسووڕمان و دامان،
بەکاردەبرێ. پەککوو pekkû >
پەك pek (کە مانای دەرفەت
derfet و هەل hel ە) و، کوو
kû لە کوا kwa (کوانێ
kwanê، کانێ kanê) وە
هاتووە واتە: دەرفەت کوانی؟
derfet k(w)anê?.

Pel پەل، لە کوردیی باکووردا، بە
مانای گەڵا gel'a دێ و، لە
کوردیی ناڤیندا بە مانای
"پەلی دەست pelî dest" دێ.

وشەکە لە بنەڕەتدا ← پەڕ
per.

Penîr پەنیر، بە پەهلەوی هەر پەنیر
penîr ە و بە شێوەی پەینر
peynir کەوتووەتە زاری
ترکییەوە.

Penceپەنجە/ پێنجە pênce.
(پەنجەی دەست pencey dest
← تلی tilî) لە ژمارەی پێنج
(5) ەوە هاتووە کە پەنجەکانی
دەست پێنجن. بە شێوەی
pençe کەوتووتە زاری
ترکییەوە.

Pencere پەنجەرە/ پێنجەرە
pêncere واتە: دەرگەیەك کە
لە شێوەی پەنجەکانی دەستدا بێ
کە بە یەکەوە ریزکرابن. بە
فەڕەنسی: fenetre و بە
ئەڵمانی fenster. لە نێزیکیی
ئەم وشانەوە لەگەڵ یەك، لە وە
دەچێ پەنجەرە وشەیەکی کۆنی

هێندۆئەوروپایی بێ. پەنجەرە هەروەك خۆی کەوتووەتە زاری ترکییەوە.

**Pencer** پەنجەر/ **pencher** پەنچەر، بۆ کونتێبوونی تایەی ئۆتۆمۆبیل، یان پایسکل بەکاردەبرێ. لە وشەی ئینگلیزی **puncture** ەوە هاتووە.

**Pend** پەند، بە مانای راوێژ **rawêj** و فێل ← **fêl** و تەڵەکە **tel'eke** دێ. کورد دەبێژن "فەن و فێل". وشەی "فەن" **fen** کە لە پەند **pend** ەوە هاتووە، بەمانای هونەر **huner** چووەتە عەرەبییەوە. دنگی پ **p** و ف **f** زۆرجار دێنە جێییەك وەك ئەوەی پۆلا(ت) **pol'at** ی کوردی بووە بە فولاذ **fûlath** لە عەرەبیدا. وشەی پلاتۆ **plato** ی یۆنانی، بووە بە إفلاطون لە عەرەبیدا. دەنگی پ **p** کۆنترە لە دەنگی ف **f**. بۆ وێنە: لە کوردیدا لافاو **lafaw** هەیە و لاپاو **lapaw** یش هەیە، هەر بەو مانایە. سپڵە **sipl'e** هەیە و، سفڵە **sifle** ش هەیە هەر بەو مانایە.

**Pepusil'êmanke** پەپوسلێمانکە، بەلاتینی **vpupa** یە و بە یۆنانی **epoph**. پەپو **pepû** کە بووە بە پەپوسلێمانکە، لە پەیامبەری جووەکان، سلێمانەوە، ئەو نێوەی وەرگرتووە، کە ئەمەش چیرۆکێکی ئەفسانەیی بەدواوەیە. دەلێن سلێمان پەیامبەر دەسەڵاتی بەسەر ئاژەڵ و مەلیشدا بووە.

**peř** پەڕ (باڵ **bal'** باڵی مەل) بە پەهلەوی پەر **per**. وشەکە لە وشەی ئاڤێستایی پەڕنە **perne** ەوە هاتووە کە بە ئەڵمانی **Feder** و بە ئینگلیزی **feather** ە.

**Perco** پەرجۆلە زمانی کوردیدا بە مانای مۆزات (معجزە) دێ. > پەر **per** + جۆ **co**. پەر **per** کورتکراوەی پەردە **perde** یە. پەردە **perde** ئەو کاڵایەیە کە شتێك دادەپۆشی و، بەنهێنی دەیهێڵێتەوە. جۆ **co** پاشگرێکە لە کاری جووڵان **cûl'an** و بەدوای شتدا گەڕان، ەوە وەرگیراوە. ئەم پاشگرە لە فارسیدا جو **cû** ە (سەرنجی وشەی دانشجو **danishcu** بدە). **perco** پەرجۆ، واتە: پەردە لابر لەسەر نهێنی، پەردەجووڵێن لەسەر نهێنی.

**Peřesilêrke** پەڕەسلێرکە/ پەڕەسێلکە **peřesêlke**، پەڕەسلێرکە **peřeslêrke** لە پەڕەشلێرکەوە هاتووە. شلێر **shilêr** نێوی گوڵێکە. پەڕە سلێرکە پەڕەکانی لە رنگی گوڵی شلێرن، بۆیە ئەو نێوەی دراوەتێ. دەنگی س **s** و ش **sh** زۆرجار جێییەك دەگرنەوە.

**Peristin** پەرستن، بە لاتینی **pretiare** کە لە ئینگلیزیدا بووە بە **praise** بە مانای پەسندان (مدح) و بە پەهلەوی پەرەستاتەن **perestaten**ە.

**Perî** پەری (خێوێکی مێیینەیە، کە بە ژنی جوانیش دەگوترێ). لە پەهلەویدا پەریك **perîk**ە و بە ئینگلیزی **ferry** و لە ئاڤێستادا پەریکا **perîka** یە.

**Peřîn** پەڕین (لە شوێنی خۆ بەرزبوونەوە و دەرچوون). وشەی فڕین **fiřîn** لە مەوە هاتووە. فڕین **fiřîn** بە ئینگلیزی **flight** و بە ئەڵمانی **Flug**ە، کە هاوڕەگی یەکن.

**Perjîn** پەرژین > پەر **per** + ژین **jîn**. پەر **per** لە ئاڤێستادا بە

شێوەی pairi هاتووە، واتە: بە هەموو لایەکدا، بە دەروبەری شتێکدا. ژین jîn وێنەیەکی دیکەی چین chînە کە لە چاندن chandin هاتووە. واتە: پەرژین مانای بەدەوری شتێکدا، یان شوێنێکدا چێنراو. لە کوردیی (شێوەزاری هەورامیدا) بۆ پەرژین perjîn وشەی پەرچ perch هەیە کە کورتەی پەرچێنراو perchênraw ە.

**Perwane** پەروانە < پەر (پەڕ) per/ř + وانە wane. پەڕ peř/l پەل ی مەل (← مەل mel)، وانە wane (ئاوەژووی شتێك ← پێچەوانە pêchewane واتە: باڵێکی پێچەوانە.

**Perasû** پەراسوو، بە سانسکریت parchve یە و، بە ئاڤێستایی پەرەسو peresu و پەراسوا peraswa یە کە بە پەهلەوی بووە بە pehluk و لە فارسیدا بووە بە پهلو pehlu. هەر لە وشەی پەهلووک pehlûk ەوە وشەی پاڵ pal واتە تەنیشت tenîsht (کێلەك kêlek) وەرگیراوە. بە کوردی دەگوترێ: "ئەو پشتییە بخەرە پاڵ خۆت" واتە: بخەرە تەنیشت خۆت. وشەی پال pal کورتکراوەتەوە و بووە بە ← ئال al واتە تەنیشت tenîsht لە کوردیی باکووردا. ئال al جێگۆرکێی دەنگی بەسەرهاتووە و بووە بە ← لا la. لا la هەر بەو مانایە لە فارسیدا بووە بە لای lay.

**Perde** پەردە، لە بەر دەر ber der ەوە هاتووە. قوماشێکە، یان شتێکە دەخرێتە بەردەم دەر (دەرگە)ی خانوویەك یان ← پەنجەرە pencere یەك، بۆ ئەوەی بیپارێزێ لە چاوی

# P پ

خەلك، یان گەرما، یان سەرما، یان تیشکی خۆر. وشەی بەردانەوە، واتە: هێنانەخوارەوە و، بەرگرتنەوە، پێوەندیی بە مەوە هەیە. کوردەکانی لوبنان بە پەردە perde دەبێژن "بەردایە berdaye".

**Peshmek** پەشمەك (جۆرە شیرانییەکە لە مووی ← مەڕ meř (← پەز pez) دەچێ. < پەشم peshim + ـەك ek. پەشم peshim > ← پەژم pejim + ـەك ek واتە: وەك خوری مەڕ meř (پەز pez، ← پەژ pej) وایە. لە فارسیدا هەر پشمك peshmek ە و لە کوردییەوە وەرگیراوە. بە عەرەبی "شعر بنات"ە.

**Pete** پەتە (پارچە کاغەزێکی بچووك کە شتێکی لەسەر نووسرابێ، پسووڵە pisûle) < پارچەتە parchete < پەچەتە pechete، کە وشەی پەچەتە pechete ئەو پارچە پەڕۆیەیە کە لە کاتی نانخوارندا دەیدەن بە سەر کۆشدا. تە te بە مانای نێو nêw ە. کە تە te و تێ tê (تێدا têda، واتە: لە نێودا).

**Petî** پەتی، شتێکی پاك و تێکەڵنەبوو بە شتی دی کە لە بابەتی خۆی نەبێ. (کوردیی پەتی kurdîy petî، ئاوی پەتی awî Petî). پەتی petî وشەیەکی سانسکریتییە بۆ ئەو کەسانە بەکارهێنراوە کە زێڕ و دراوی بە نرخیان لە هی قەڵپ جیاکردووتەوە. دوایی بووە بە زاراوەیەك و بەکاردەهێنرا بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە شتی باش و خراپیان لە یەك جیادەکردەوە. وشەی پەتی petî لە فارسیدا بووە بە بد bod، بڕوانە وشەی گهبد gehbod

(مرۆڤی خاوەن پایە و پلە) کە لە زاری عەرەبیدا بووە بە جهبد (جهبذ، جهابذة). لە سەر دەمی ساسانییەکاندا ئەوانەی کە خەزنەداربوون پێیاندەگوترا گەهبەت gehbet. bod > bet > pet > petî.

**Petyare** پەتیارە، لە پەهلەویدا وشەی: پەیتیارە(ك) peytyare(k) هەیە بە مانای ئەوەی کەسێك رەوشت و خووی ئەهریمەنانەی هەبێ. پەتیارە لە کوردیدا بۆ یەکێك دەگوترێ کە شێت و وێت shêt û wêt بێ. دوور نییە پەتیارە petyare لە پت pit (بت bit) و یار yar ەوە هاتبێ، واتە: دۆستی بت، بتپەرست bitperist ئەهریمەندۆست ehrîmendost.

**Peyamber** پەیامبەر. پەیام peyam مانای راسپێری raspêrî یە و لە پەهلەویدا پیتام pîtam ە. پەیامبەر لە پەهلەویدا پیتامبەر pîtambere ە.

**Peyda** پەیدا (پەیدابوون peydabûn). پەیدابوون، مانای خۆیابوون و دیاربوون و ئاشکرابوونە. لە سانسکریتدا وشەی پرەتیاکە pretyake هەیە کە ئەم وشەیە، بنەڕەتی وشەی پراکتیك piraktîk ە کە لە زمانە ئەوروپاییەکاندا هەیە و، بۆ بە کردەیی kirdeyî (عملی) بەکاردەبرێ. هەروەها لە پەهلەویدا وشەی پێیتەك pêytek هەیە، کە لەو وشە سانسکریتیەوە هاتووە.

**Peyje** پەیژە (← ناردیوان nardîwan). پەیژە peyje > پەی pey + ژە je > پێ pê + ژە je. ژە je وێنەیەکی دیکەیە بۆ "جەهـ ceh" واتە: جێ cê.

جەھ ceh لە کوردیی باکووردا جێ cê یە. کەواتە: پەیژە peyje مانای: جێی پێ cêy pê. تەنانەت لە کوردیی نێوچەی ئەردەلاندا وشەی پەیچە peyce لە جیاتی پەیژە peyje بەکاردێ.

**Pez** پەز/ pes پەس (مەڕ meř، یان مەڕ و بزن بە تێکەڵی) لە وشەی ئاڤێستایی پەسەڤ pesev و پەزوو pezû و پەسوو (ك) pesû(k) ەوە هاتووە.

**Pezmende** پەزمەندە، بە مانای پاشەکەوتکردن pashekewtkirdin (إدخار) لە پەژمەندە pejmende و پاش ماندە pashmande و پاش مان pashman ەوە هاتووە، واتە: شتێك کە لە پاشەوە بە جێبمێنێ و اشکەوتکرابێ واتە: خرابێتە پاشەوە و لە بەردەستدا دانەنرابێ.

**Pê** پێ، بە پەهلەوی باد bad ە و لە فارسیدا بووە بە پا pa، وەك هێندەك شێوەزاری کوردی.

**Pêchewane** پێچەوانە < پێچ pêch + وانە wane. پێچ pêch و خێچ xêch (خوار و خێچ xwar û xêch) و وێچ wêch (پێچ و وێچ pêch û wêch) لە پێچێ pêchê ەوە هاتووە، واتە: جێی پێ cêy pê. وانە wane مانای ڤاژی vajî یە. وشەی وانە لە پەهلەویدا eparûn ە، کە بووە بە پاروون parûn و واروون warûn (دەنگی پ p بووە بە و w) واروون warûn بووە بە وان wan و، وانە wane و، وا wa، واتە: دژی جێ پێ dijî cê pê واتە: دژی ڕێبازی سووڕانی پێ. وشەی eparûn ی پەهلەوی، لە فارسیدا بووە بە وارونە warûne.

**Pêl'aw/v** پێلاو/ ڤ > پێ **pê** + لە **lê** (لـ **li**)+ (نا **na**) و/ڤ **w/v** ەوە هاتووە، واتە: پێلە ناو/ڤ **pê le/i naw/v**.

**Pênaw/v** پێناو/ ڤ (لە پێناو/ڤ **le pênaw/v**) > پێ **pê** + ناو/ڤ **naw/v** > پێ **pê** + ناو/ڤ **naw/v** > پێ **pê** + هەنگاو/ڤ **hengaw/v** (← شەقاو **sheqaw**).

**Pêrar** پێرار، لە پێش پار **par** ەوە هاتووە. وشەی پار **par** لە پێش **pêsh** + یار **yar** ەوە هاتووە. یار **yar** وشەیەکی دیکەیە بۆ ساڵ **sal**. ساڵ **sal** لە ئاڤێستادا یار **yar** ە و لە زمانی ئەڵمانیشدا هەر یار **jahr** ە. پێش ـ پار ـ یار **pêsh-par-yar** بووە بە پێرار **Pêrar**.

**Pêřist** پێڕست، بە پێی رست **be pêy rist** بۆ زنجیرەی بەندەکانی نێوەرۆکی پەرتۆك دێ، کە لە پەهلەویدا: **pêrst** و لە فارسیدا بووە بە فهرست و لە عەرەبیدا کراوە بە فهرس. لێرەدا: فارسی دەنگی پ ی **p** کۆنی نە پاراستووە و کردوویەتی بە ف **f**، ئەمەش کۆنێتیی زمانی کوردی پێشاندەدا.

**Pêst** پێست، لە وشەی ئاڤێستایی پەستە **peste** و پاستۆ **pasto** وە هاتووە، کە لە فارسیدا بووە بە پۆست **pûst** و لە فەرەنسیدا **peau**.

**Pêsh** پێش، لە ئاڤێستادا **peytîsh** ە و لە پەهلەویدا بووە بە **pat(î)sh** و دوایی بووە بە پێش **pêsh** لە فارسیشدا پیش **pîsh**.

**Pêshmerge** پێشمەرگە. پێشمەرگە ئەو کەسە نییە کە بەرلەوەی خەلك بمرن، یان بکوژرێن، ئەو بمرێ، یان بکوژرێ. بەلکو ئەو

کەسەیە پێش بە مەرگ (مردن)ی خەلك دەگرێ، واتە: بەر بە مەرگ (مردن) دەگرێ، بەکورتی: خەلك لە مردن دەپارێزێ. کورد دەبێژن: پێش بگرە لێی، یان: پێشی لێبگرە، واتە: رێ مەدە پێ بێتە پێشێ.

**Pêxawis** پێخاوس/ پێخواس pêxwas/ پێخاوس < پێ pê + خاو xaw + س s. خاو xaw مانای ← رووت rût و لەگەڵ هیچ شتێك تێکەڵنەبوو. س s یان لە "ساو saw" (ساف saf) ەوە دێ، یان لە سا sa < ئاسا asa وە دێ.

**Pêxust** پێخوست، شوێنێکە کە پێ خرابێتە سەری. لە پێخست pêxist ەوە هاتووە، سەرنجی پێ خستنە سەر pê-xistin-e ser بدە.

**Pine** پنە. تەختەی نان لەسەر دروستکردن. پێدەچێ پنە pine پێوەندیی بە وشەیەکی زۆر کۆنەوە هەبێ کە لە کوردیی ئەورۆدا نەماوە، ئەوەش پان pan (نان) ە. نان nan بە لاتینی panis ە و بە فەرەنسی pain و بە هیندی پانی panî یە. Panier لە ئەلمانیدا بە خواردنێك دەگوترێ کە وردەنان رۆکرابێ لەسەری.

**Piř** پڕ، بە پەهلەوی: پور pur ە، کە لە کوردیدا بە مانای ← تژی tijî و ← زۆر zor یش دێ.

**Pird** پرد/ پر pir، وشەیەکی هیندۆئەورووپاییی کۆنە، بە ئاڤێستایی: پرتەڤ pirtev ە، لە ئینگلیزیدا Bridge و، لە ئەڵمانیدا Brücke و لە فەرەنسیدا pont ە و، لە فارسیدا بووە بە پُل (کە دەنگی ر r کۆنترە لە دەنگی ل l). بۆ وێنە، فارسی: روخت rûxt (← رووت rût) ی کردووە بە لُخت loxt.

**Pirj** (← پرزه **pirze**).

**Profayil** پرۆفایل. له **Profile** ی ئینگلیزییەوه هاتووه. که مانای دیمەنی لاتەنیشت **dimenî latenîsht** ه و به ئەڵمانی پرۆفیل **profil** ه.

**Pirs** پرس/ پرسین **pirsîn** (پرسیارکردن). به پەهلەوی: پۆرسیتان **porsîtan** و پورسیتەن **pursîten** ه.

**Piřûpûch** پڕوپووچ، له پڕ **piř** (← تژی **tijî**) و پووچ **pûch** (پووت **pût**) ەوه نەهاتووه، بەڵکو، پڕ **piř** لێرەدا، له فڕ **fiř** و ڤڕ **viř** ەوه هاتووه، که به مانای ← درۆ **diro** و دەلەسە **delese** دێ له کوردیدا. ڤرتۆ **virto** (درۆزن **dirozin**، فیشالکەر **fîshalker**)ه. پڕوپووچ **piřûpûch** واته: درۆ و پووچ **diro û pûch**. وشەی فریو **firîw** پێوەندیی به فڕ **fiř** و ڤڕ **viř** واته: درۆ **diro** وه هەیه، که له فارسیدا بووه به فریب **ferîb**.

**Pirzang** پرزانگ (منداڵدان **mindal’dan**). زانگ **zang** زانگه **zange**یه جێی زایینه. پڕ **pir** کورتەی پووسار **pûsar** ه که به پەهلەوی مانای ← منداڵ **mindal’** ه و له فارسیدا بووه به پسر **pser** و پور **pûr** و، له کوردیی باکووردا بووه به پس (سەرنجی وشەی پسمام **pismam** واته: کوڕی مام بده).

**Pirze** پرزه (چالاکی **chalakî**، جووله **cûl’e**) (پرزەی لەبەر بڕا) له ئاڤێستادا سپەرز **sperz** ه. وشەی ← پرژ **pirj** لەمەوه هاتووه. سەرنجی وشەی ئەڵمانی **Spritzen** پرژاندن بده.

Pis پس/ کوڕ kuř (پسمام pismam/ کوڕی مام kuřî mam). (← پرزانگ pirzang).

Pisûl'e پسووڵە، لە پتووڵە pitûl'e دوە هاتووە. پتووڵە pitûl'e بچووککراوەی ← پەتە pete یە، واتە: پارچە کاخەز kaxez.

Piyade پیادە، واتە: کەسێك کە بە پێ بڕوا بە ڕێوە. پیادە piyade > پێ pê + یا ya + دە de. دە de لە دەو dew دوە هاتووە. دەو dew مانای: ڕۆیشتن و ڕاکردن. پیادە piyade هەر وەك خۆی کەوتووەتە فارسی و ترکییەوە. وشەکە فارسی نییە، چۆنکە ئەگەر فارسی بوایە، دەگوترا پایادە payade. پێ pê بە فارسی: پا pa یە، نەك پێ pê.

Piyal'e پیاڵە، وشەیەکی یۆنانییە pialé کە لە عەرەبیدا بووە بە فیالجە. دەنگی پ p لە زمانی کوردی و زمانە هیندۆئەوروپاییەکانی دیکەدا، بەزۆری لە عەرەبیدا، دەبێتە ف f.

Piyare پیارە، واتە: زڕ zîř، شت، یان، کەسێکی نا ڕەسەن (نا ئەسڵ)، سەرنجی وشەی باوەپیارە bawepiyare بدە. پیارە piyare لە پیاو ئاوارە piyaw-aware واتە: پیاوێك کە لە شوێنێکدا بێ شوێنی خۆی نەبێ.

Pîl پیل، وشەکە فەڕەنسییە pile بە پاتری بچووك دەگوترێ.

Pîne پینە، وێنەیەکی دیکەی چینە chîne یە، کە لە چنین chinîn دوە هاتووە، واتە: چنینی پارچە پەڕۆیەك، یان، شتێکی دیکە. وشەی تەنین tenîn یش هەر لەم بابەتەیەو، چنین chinîn ە، بە گۆڕینی دەنگی پ p و چ ch و ت t بۆ یەکدی.

**Pîr** پیر، لە ئاڤێستادا وشەی پەرۆ **pero** و پەریە **perye** هەیە، کە بە مانای پێشین دێ. کە لە کوردیی ئەوڕودا بووە بە بەروو **berû** و بەری **berî** واتە: ئەوەی لە پێشەوە هەبووە. وشەی پێش **pêsh** یش هەر لەمەوە هاتووە. دەنگی ر **r** گۆڕاوە بە ش **sh**.

**Pîrot** پیرۆت (نێوی پیاوە). رەنگە پیرۆت **pîrot** وێنەیەکی دیکەی وشەی پیرۆز **pîroz** بێ، لە کاتێکدا پیرۆز بۆ نێوی ژن بەکاردەبرێ، پیرۆت بۆ پیاو. ئەستێرەی کۆ **ko** نێویکی دیکەشی هەیە کە ئەوەش پیرۆ **pîro** یە و بە عەرەبی "ثریا". رەنگە **pîroz** لە **pîro** ەوە هاتبێ. شێمانەیەکی دیکەش هەیە، ئەوەش ئەوەیە بنچینەی وشەکە فرۆت **frot** ی پەهلەوی بێ کە مانای هاتنەخوارەوە، خۆ نزمکردنەوەیە. لە کوردیی باشووردا وشەی فرووت **firût** هەیە بۆ نێوی پیاوان و بە مانای بێفیز **bêfiz** دێ.

**Pîroz** پیرۆز، پیرۆز **pîroz** لە زمانی کوردیدا بە مانای "مبارەك" و "موقەدەس" دێ. ئەم وشەیە لە ئاڤێستادا **(peytî-rewcheh** پەیتی ـ رەوچەھ)ە، ولە پازەنددا **pêroj** و **pêroz** پێرۆزە. وشەی پیرۆز لە زاری عەرەبیدا بووە بە "فیروز". وشەی پیرۆز لە زمانی کوردیدا بە هێندەك مانای دیش بەکاردێ، وەك: "سپی رۆژ"، "بە فەڕ"، "بە پیت" (بە بەرەکەت)، "دەگمەن"، "دانسقە". رەوچەھ **rewcheh** ی ئاڤێستایی مانای ← رۆژ **roj**ە، کە رۆژ **roj** لای کوردی کۆن و لایەنگرانی هێندەك ئاینی کوردی، وەك

ئێزدی و یارسان و ئەلەوی پیرۆزە.

**Pîroze** پیرۆزە کە بە وێنەی "پیرۆژە **pîroje**" ش هەیە، وادیارە پێوەندیی بە "دەگمەن **degmen**" و "دانسقە **danisqe**" ەوە هەیە، واتە: بەردێکی بە نرخ کە کەم دەستدەکەوێ و، لای خەڵك بەڕێز و پیرۆزە.

**Pîrozî** پیرۆزی (قدسية). لە پەهلەویدا پێرۆژیه **pêrojîh** ە و لە فارسیدا وەك پیروزی و فیروزی بەکاردەبرێ، بەڵام بە مانای سەرکەوتن و زاڵبوون دێ، نەك "موقەدەسی".

**Pîs** پیس (← گەمار **gemar**) لە پیزی **pîzî** (واتە: کونی قوون) ەوە هاتووە کە گەمارە. ئەم وشەیە لە کوردیی زازاکیدا بە مانای ورگ **wirg** دێ کە پیسایی تێدا کۆدەبیتەوە. پیزەوەند **pîzewend** واتە: گەواد (جێکێش **cêkêsh**). هەر بەو شێوەیە وشەی پیس **pîs** و پێزەوەنە بە شێوەی **pezeveng** چووەتە زاری ترکییەوە.

**Pîtol’** پیتۆڵ/ پیتۆر **pîtor**. فەیلەسووف **feylesûf**، بلیمەت **bilîmet**، قسەزان **qisezan**. پیتۆر **pîtor** > پیت **pît** (حرف) + ۆر **or**. ۆر **or** کورتەی وار **war** ە، واتە: خاوەن **xawen**. پیتۆر **pîtor** کەسێکە کە خاوەن قسە بێ و بزانێ چ دەبێژێ. عەرەب بەوە دەبێژن "حکیم" کە لە "حکمة" وە هاتووە.

**Pol’a** پوڵا، بە پەهلەوی پۆلڤات **polvat** و پوولافت **pûlaft** هەیە، کە لە فارسیدا بووە بە پولاد و لە عەرەبیدا فولاذ

**Popeshmîn** پۆپەشمین (پارچە تەونێکە دەدرێ بە خۆدا) > پۆ

po+ پەشمین peshmîn. پۆ po (واتە: تێوەدانی تەون). پەشمین peshmîn لە پەژمین pejmîn ەوە هاتووە (⟵ پەژم pejim).

Postal' پۆستاڵ. > post پۆست (pêst پێست) + al' ئاڵ. al' کورتکراوەی کاڵە kal'e یە، کە بریتییە لە پێڵاوێکی چەرمین. وشەی کەڵاش kel'ash کە لە کاڵاش kal'ash ەوە وەرگێراوە، هەر لەم بنەڕەتەوەیە postal' واتە: کاڵەی لە پێست دروستکراو kal'ey le pêst dirustkiraw.

Potîn پۆتین (پێلاوێکە وەك لاپچین)، پۆت pot هوردەخۆڵە، واتە: پۆتین پێڵاوێکە بۆ رۆیشتن بە نێو هوردەخۆڵدا.

Proje. پرۆژە. لە projet ی فەرنسییەوە وەرگیراوە، کە بە شێوەی پرۆژێ projê دەردەبڕدرێ. لە ئینگلیزیدا project و لە ئەلمانیدا projekt ە، کە بەمانای پلان و نەخشەیە بۆ کردنی کارێك.

Prose پرۆسە، بەمانای رەوەند rewend ی کارێك، هێڵی گەڕیانی کارێك، وشەکە processus ی لاتینییە کە لە ئینگلیزیدا process و لە ئەلمانیدا prozeß ە، کە بە مانای بەگژ یەکداچوون لەسەر مافێك، بەتایبەتی لەڕێی دادگەوە. وشەکە لە فەڕەنسیدا procès یە کە بەشێوەی پرۆسێ prosê دەردەبڕدرێ. کوردی و فارسی لە فەڕەنسییەوە ئەم وشەیەیان وەرگرتووە.

Pûch پووچ (⟵ bosh بۆش).

Pûl پوول، لە وشەی یۆنانی obolos ʹ (οβολός) ەوە هاتووە.

Put پووت (⟵ bosh بۆش).

# Q ق

Qabîne قابینە/ Kabîne کابینە. وشەیەکە لە بنەڕەتدا لاتینییە capanna کە بۆ ← کۆختە koxte بەکاربراوە. لە فەڕەنسیدا cabine و لە ئەڵمانیدا Kabine یە و، بۆ ژووری بچووك بەکاردێ. بەڵام لە زمانی کوردیدا بۆ کۆمەڵەی وەزیرانی حکوومەتێك بەکاردێ.

Qach قاچ (قاچ و قول qach û qûl). قاچ qach بە هۆی جێگۆڕکێی شوێنی دەنگی ق q و چ ch ەوە، قاچ qach لە چاق chaq ەوە هاتووە. چاق chaq وشەیەکی هاومانای پاق paqە، کە پێ pê/ پا pa یە. پاق paq و چاق chaq هەردووکیان بە مانای لاق laq/ لنگ ling دێن لە کوردیداو، لە کوردیدا هەن. ئەوجا قاچ qach و پاچ pach یش یەك وشەن و، دەنگی پ p بووە بە ق q. قاچ qach < پاچ pach. پاچ pach واتە: پێیی بچووك کە پاچ pach پاچك pachkە.

Qach û Qûch قاچ و قووچ (ساختە) < kech û kirûch کەچ و کرووچ

Qalor قالۆر، بە تفەنگی سادە دەگوترێ (سەرنجی: قالۆرەشکاو qaloreshikaw بدە). قالۆر qalor لە گالۆر galor ەوە هاتووە. گالۆر galor بە لاسکی گیا دەگوترێ کە نێوەکەی ← ڤالا vala (← بۆش bosh) بێ، وەك ← لوولە lûle. هەر لە زمانی کوردیدا بە هێسکی قاچ (← ئێسقان êsqan ی ← قاچ qach) دەگوترێ: گاللۆر gallor. گا ga وشەیەکی دیکەیە بۆ جێ، سەیرانگا/سەیرانگە seyranga/e

لۆر lor لە: ← بلوێر /bilwêr بلوور bilûr ەوە هاتووە، کە لوولەیەکی نێو بۆشە.

**Qam** قام، وشەیەکی دیکەیە بۆ مەقام (← گۆرانی goranî). قام qam < کام kam < کلام kilam. کلام kilam لە کوردیی باکووردا مانای ← گۆرانی goranî یە. کلام kilam وشەیەکی کۆنی هێندۆئەورووپاییە. (← کلام kilam). "مقام" ی عەرەبی لە "قام" ی کوردییەوە وەرگیراوە. وشەی قام qam بە مانای ← پێنجە pênce/ پەنجە pence ش دێ.

**Qamîsh** قامیش، لە قام - هیشك qam-hîshk ەوە دێ. ← قام qam مانای ← پەنجە pence (← تلی tilî) دێ. قامە qame و خامە xame یەك رەگیان هەیە. قامیش qamîsh مانای: پەنجەیەکی هیشکە. قامیش خۆی لە شێوەی پەنجە دایە و، قامکێکی هیشکە و، ئەو تەڕاییەی لە پەنجەی مرۆڤدایە لەو قامکەدا نییە.

**Qamûs** قامووس، ئەم وشەیە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای ← فەرهەنگ ferheng (← وشەنامە wishename) و نێوەندی ← زەریا zerya بەکار دێ، لە بنەڕەتدا وشەیەکی لاتینییە و لە وشەی campus ەوە وەرگیراوە، کە بە مانای زەوییەکی تەختە. وشەی کامپ kamp و کامپینگ camping یش هەر لەمەوە وەرگیراوە.

**Qanûn** قانوون. لە κανόνι یۆنانییەوە هاتووە کە بە مانای ← دەستوور destûr و نەریت nerît ە.

**Qap** قاپ (← گەپ gep).

**Qapût** قاپووت. لە وشەی kaputze ی ئەڵمانییەوە هاتووە

که له بنەڕەتدا **cappuccio** ی ئیتالیاییە و بە ئینگلیزی **cape**ە. بۆ ئەو کڵاوە بەکاردەبرێ کە بە لای سەری پاڵتۆوەیە. بەڵام لە کوردیدا بۆ ← پاڵتۆ **pal'to** بەکاردەبرێ.

**Qare** قارە. بە پێنج بەشەکەی جیهان دەگوترێ. لە وشەی لاتینی **quartarius** ەوە هاتووە، بەم شێوەیە کەوتووەتە زاری عەرەبی و فارسی و کوردییەوە.

**Qarîn** قارین (کارین **karîn**، کانین **kanîn**) هەرسێکیان بە مانای توانین **twanîn** دێن. وشەیەکی کۆنی هێندۆئەوروپاییە. سەرنجی وشەی **können** ی ئەڵمانی و **to can** ی ئینگلیزی بدرێ.

**Qas** قاس (← گەز **gez**).

**Qash** قاش (کووزێك لە شتێك). قاش **qash** لە کاژ **kaj** ەوە هاتووە. دەگوترێ: مارەکە کاژی دەردا، واتە: قاشێکی تەنك لە پێستەکەی جیابووەتەوە. وشەی کووز **kûz** یش، بە گۆڕانی دەنگی ژ **j** بۆ ز **z** لە کووژ **kûj** ەوە هاتووە و کووژ **kûj** بووە بە کاژ **kaj** و ئەوجا بە قاش **qash**، یان بە پێچەوانە. وشەی قوژبن **qujbin** کە کووژی **kûjî** و کۆژین **kojîn** یشی پێدەڵێن، هەروەها وشەی گۆشە **goshe** < گۆژە **goje** < کۆژە **koje** < کۆزە **koze** < کووژە **kûje** < کووز **kûz** هەموویان پێوەندییان بە یەکەوە هەیە (← کۆخ **kox**/ کۆختە **koxte**).

**Qawirme** قاورمە، لە چەورمە **chewirme** ەوە هاتووە. مە **me** کورتەی "مەنی **menî**" یە (چەورەمەنی **chewremenî**). دەقەورێنم **deqewrênim** واتە: دەچەورێنم **dechewrenim** واتە: لە

# Q ق

ڕووندا سۆریدەکەمەوە. قاورمە **qawirme** چووەتە زاری ترکییەوە.

**Qawirme sewzî** قاورمەسەوزی: چێشتێکی سنەییانەیە، فارسەکان کردوویانە بە "قورمە سبزی".

**Qawit** قاوت (نانی هاڕاو و کراو بە ئارد) > قاو **qaw** + ت **t**. قاو **qaw** (کاو **kaw**) واتە: جووراو **cûraw** (هورد و خاشکراو **hurd û xashkiraw**). وشەی کاوێژ **kawêj** (جوونەوە) لەمەوە هاتووە.

**Qel’a** قەڵا/ **Qel’at** قەڵات، بەو خانووانە گوتراوە کە لەسەر کەل **kel** (چیا **chiya**) دروستکراون. وشەی کەلو **kelu** ش کە خانووی بلندە، هەر پێوەندیی بەمەوە هەیە. قەڵات کەلات **kelat** ە کە لە فارسیدا هەروا بەکاردەبرێ و لە عەرەبیدا بووە بە قلعة.

**Kelu** کەلو (← **Qel’a** قەڵا/ **Qel’at** قەڵات).

**Qel’em** قەڵەم (پێنووس **pênûs**). ئەم وشەیە لە عەرەبی و فارسی و ترکیدا بەکاردەبرێ. وشەی قەڵەم (قلم) لە قورئاندا هەیە ((ن والقلم وما يسطرون. سورة القلم (ك) **68/1**)). وشەی قەڵەم **qel’em** لە وشەی کوڵۆم **kul’om** ەوە هاتووە، کە ئەو پارچە دارە باریکەیە کە دەرگەی پێ دادەخن. (بۆ نموونە: دەرگەیان ← کلیل **kilîl** و کلۆم (کوڵۆم) دا). وشەی کوڵۆم لە پەهلەویدا هەیە. وشەی "کلك **kilik**" لە کوردیدا بۆ "قەڵەم **qel’em**" بەکاردێ کە ئەوەش کوتکراوەی کلۆم **kil’om** ە، لە ڕێی کلۆمـ ـ ك **kil’omk** ەوە.

**Qemterkirdin** قەمتەرکردن (← keftyar کەفتیار/ kemtyar کەمتیار).

**Qenare** قەنارە، پارچە ئاسنێکە کە قەساب، ئاژەڵی سەربردراوی پێدا هەڵدەواسن. ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا، کەنارە **kenare** یە و، وشەیەکی کۆنی هێندۆئەورووپاییە و لە گەننارە **gennare** ی یۆنانییەوە هاتووە. لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی **kannare** هەیە بۆ لغاوی ئەسپ و، وشەکە بەکاردەهێنرێ بۆ کۆنترۆلکردن و لە جووڵەخستنی شتێك. ئەم وشەیە لە عەرەبیدا بووە بە قتارة.

**Qendax** قەنداخ (شەکراوی کولاو). قەند **qend** مانای کولۆ شەکرە و، لە وشەی سانسکریتی کهەندە **khende** ەوە هاتووە. کە وشەی **coundy** ئینگلیزی لەمەوە هاتووە. داخ **dax** (گەرم بوون تا هەندازەی سووتاندن). داخ **dax** بە پەهلەوی داگ **dag** ە.

**Qenefe** قەنەفە، جۆرە کورسییەکە. وشەکە لاتینییە و لە فەرەنسیدا، بە شێوەی **canapé** و ئەڵمانیدا بە شێوەی **kanape** بەکاردێ.

**Qep** قەپ/ قەپلێدان **qeplêdan** (← گەپ **gep**) ە.

**Qepal’** قەپاڵ (← گەپ **gep**).

**Qepan** قەپان، جۆرە تەرازوویەکە بۆ شتکێشان. لە وشەی یۆنانی **γαppán** (گەپپان) ەوە هاتووە، کە لە یۆنانییەوە، کەوتووەتە فەرەنسییەوە و، زاری عەرەبی کردوویەتی بە "قبّان".

**Qepoz** قەپۆز، لە: کەپۆز **kepoz** ەوە هاتووە. کەپۆ/کەپوو **kepo/kepû**، کەپ **kep** بە مانای ← لووت **lût** (بێڤل **bêvil**) دێن لە زمانی کوردیدا. کەپ **kep** لە زمانی کوردیدا بە

شتێك دەگوترێ كە لە شتێكی دیكەوە، دەرپەڕێ بەڵام بە مەرجێك هەر بە شێك بێ لەو شتە. كەواتە: كەپۆ/كەپوو kepo /kepû پارچە شتێكە كە لە لەشی مرۆڤ، یان لە شتێك دەرپەڕیبێتە دەرێ. ز z كورتەی زن zin ە، كە مانای ئاودانەدەرەوە awdanederewe دەگەیەنێ، سەرنجی وشەی تەڕەزن terezin بدرێ، كە مانای تەڕی دانەدەرەوە terî danederewe دەگەیەنێ و لە دزن dizin و دزین dizîin ەوە هاتووە، سەرنجی وشەی: ئاودز awdiz و دەنگدز dengdiz بدرێ.

**Qerax** قەراخ (لێوار lêwar) وشەیەكی دیكەش بۆ قەراخ qerax هەیە، كە ئەوەش كەراخ kerax ە. كەراخ kerax < كەر ker + ئاخ ax. كەر ker لە كەرت kert ەوە هاتووە، كە مانای بەش besh، واتە: لەتی شتێك letî shitêk. ← ئاخ ax مانای← خاك xak ە. كەراخ/قەراخ k/qerax واتە: بەشی لای خاك (لای ئاخ lay ax، كەنار ئاخ kenar ax واتە: كەناری هیشكانی). وشەی كەرخ kerx كە لە كوردیدا بۆ ← سنوور sinûr (كەوشەن kewshen) بەكاردەبرێ، لەم وشەی كەراخ kerax ەوە هاتووە. بەشی كەرخ kerx لە بەغدا لەم كەراخ ەوە هاتووە، كە بە عەرەبی شاطيء ە.

**Qerebû** قەرەبوو (قەرەبوو كردنەوە qerebû kirdinewe). قەر qer نێوی فریشتەی بەختە، كە جارجار، لە شێوەی مرۆڤدا، دەردەكەوێ، وەك خێری زیندوو، كە یارمەتیی لێقەوماوان دەدا و، بەختیاریاندەكا.

قەرەبووکردنەوە، واتە: بەختیارکردنەوە و، لابردنی زیان و هێنانەوەی بەخت بۆ جێی خۆی. هەر لە کوردیدا چەند وشەیەکی دیکە هەیە کە پێوەندییان بە رەگی قەر qer دەوە هەیە، وەك قەرقۆت qerqot کە بە کەلوپەل kelupel ی نێومالٚ دەگوترێ، کە قەرەبووکردنەوە qerebûkirdinewe لێرەدا، بە مانای کەلوپەل تازە کردنەوە tazekirdinewe دێ.

**Qeresûran** قەرەسووران، ترکەکان ئەم وشەیە، بۆ ئەو پاسەوانانە بەکاردەبەن، کە لە سەر جادەکان دەوەستن بۆ دژایەتیکردنی جەردە و چەتە. وشەکە لە قەرە qere + سوور sûr + ان an دەوە هاتووە. قەرە qere لە گەڕ geř دەوە هاتووە، کە بە مانای شەڕو و زۆرانبازییە. سوور sûr کورتکراوەی سوار swar ە و ئان an نیشانەی گەلە، واتە: ئەو سوارانەی کە بۆ شەڕ و گەڕ و بەربەرەکانی ئامادەن. گەڕەسواران geřeswaran قەرەسووران qeresûran کەوتووەتە فارسییەوە.

**qerewêt** قەرەوێت/ قەرەوێتە qerewête/بۆیمباخ boyimbax کە بە کوردی ملبەند milbend ە و، بە عەرەبی (رباط) ە و، بە ئەڵمانی کراڤاتە krawatte یە، کە سووکراوە و بووە بە کراڤات krawat و بە فەڕەنسی cravate و بە ئیتالیایی cravatta لە بنەڕەتدا وشەیەکی کرواتی یە. زەمانی کۆن، خەلکی کرواتستان (کە پارچەیەك بوو لە یۆگۆسلافیا و دوایی سەربەخۆ بوو)، جۆرە ملبەندێکیان دەبەست بە

ملیانەوە، کە دوایی، بە هێندەك دەستکارییەوە، بوو بەو کراڤاتەی کە ئەورۆ لە ئەوروپا و لە هەموو جیهاندا بەکاردەبرێ.

**Qersîl** قەرسیل/ قرسیل **qirsîl** بەو لاسکە سەوزانەی دەخڵ دەبێژن کە ئاژەل دەیخۆن. < قر **qir** + سیل **sîl**. قر **qir** لە قرتاندن **qirtandin** ەوە دێ، کە لە بنەڕەتدا کرتاندن **kirtandin**ە بە گۆڕینی دەنگی ك **k** بۆ ق **q**. سیل **sîl** و شیل **shîl** و شیر **shîr** چەند وێنەیەکی یەك شتن کە ئەوەش: شیرە **shîre** ی ئەو لاسکانەیە کە ئاژەڵەکان دەیانقرتێنن و دەیانخۆن.

**Qes** قەس (← **Qêz** قێز).

**Qeshe** قەشە، کە لە عەرەبیدا بووە بە "قس" و لە فارسیدا بووە بە کشیش **kashish** لە بنەڕەتدا وشەیەکی سریانییە.

**Qeware** قەوارە/ قەواڵە **qewal’e**. لە گەورە **gewre** ەوە هاتووە، کە لێرەدا مەبەستی گەورەیی **gewreyî** (زلێتی **zilêtî**) شتە.

**Qeychî** قەیچی/ ← مەگریجەنی **megrîcenî** لە قیچا **qîcha** ی مەنگۆلی (مەغولی) یەوە هاتووە، کە کوردییەکەی برنگی **biringî** یەو لە: برِ **biř** + ن **n** + گی **gî** یەوە هاتووە و، ئامێرێکە بۆ هەڵپاچین و بڕینی تووکی مەڕ بەکاردەبرێ.

**Qeyran** قەیران، وشەیەکە لە زمانی کوردیدا بە مانای "مۆڵەت **mol’et** و ← ماوە **mawe**" بەکاردەبرێ. دەبێژن "نەخۆشەکە قەیران دانرا بۆی"، واتە: ماوەیەك دانرا بۆی، یان دەمرێ، یان، نامرێ. قەیران **qeyran**، لە کەیران **keyran** ەوە هاتووە، دەنگی ك **k** بووە بە ق **q**. (وەك: رك **rik** و رق **riq**،

کین kîn و قین qîn). لەم وشەیەدا، پارچەیەك هەیە، ئەوەش کەی key ە، واتە: چ کاتێك، کەینێ؟ keynê? زۆر ڕێی تێدەچێ کە کەیران keyran کەینان keynan بووبێ. کەین keyin. لە زمانی کوردیدا بە مانای: نێوان nêwan (بۆ زەمان zaman) دێ. کەواتە، کەین ـ نان keyin nan واتە: کەین ـ دا ـ نان keyin-da-nan، کات دانانە بۆ شتێك.

**Qêz** قێز، واتە: ئارەزووبوون لە شتێك arezûbûn le shitêk (قێزم دەبێتەوە لێی qêzim debêtewe lêy) واتە: ئارەزووم لێی دوور کەوتووەتەوە. قێز qez و قەز qez و قەس qes و حەز ĥez و هەژ hej و بێز bêz هەموو یەکمانان و هەموو ئەم وشانە لە شێوە زارەکانی کوردیدا هەن و گشتیان ئارەزوو دەگەینن، سەرنجی وشەی ← بێزوو bêzû بدرێ کە حەزی ژنی زکپڕە لە هێندەك خواردن. قێزلێهاتن qêzlêhatin/ قێزەوین qêzewin واتە: حەز لێنەبوون ĥez/j lênebûn و دڵتۆران dil'toran لە شتێك.

**Qilîchk** قلیچك (← کلیل kilîl/کلیت kilît).

**Qilîl** قلیل (← کلیل kilîl/کلیت kilît).

**Qilîsh** قلیش، واتە: درزی گەورە لە دیوار، یان دار، یان لە شتێکی دیکە. قلیش qilîsh > قل qil + یش îsh. قل qil > قەل qel > کەل kel. یش îsh > یشك îshk > یچك îchk. کەل kel ئەوەیە شتێك بەشێکی لێپەڕێندرابێ، یان، لێکەمکرابێ. یچك îchk نیشانەی بچووککردنەوەیە، وەك

دەگوترێ: گوێچك gwêchk (گوێیەکی بچووك). (سەرنجی وشەی ← کەروێشك kerwêshk > کەرگوێچك kergwêchk بدرێ. قلیش qilîsh/قەلیش qelîsh لە کەلیچك kelîchk ەوە هاتووە، واتە: کەلییەکی بچووك kelîyekî bichûk (← کلیل kilîl/ کلیت kilît).

**Qiře** قڕە، قڕە qiře بە کەسێك دەبێژن کە لە هەڵماتێن hel’matên (یاریی کەلان yarîy kelan) دا، دوای هەمووان بێ. قڕە qiře لە کڕە kiře وە هاتووە. کە لە کوردستاندا بۆ شایی، یان بۆ شین، پلاّو لێدەنێن، دەبێ هێندە زۆر بێ نەگاتە بنکڕ binkiř، بۆ ئەوەی مێوان ناچار نەبێ بنکڕەکە بخوات. هێندەك بنەماڵە هەن، شانازی بەوە دەکەن، کە پلاّوی وان ناگاتە بنکڕ "واتە: هێندە زۆرە". ئەوجا ئەو مێوانەی درەنگ بێ و دوابکەوێ، بنکر دەبێتە بەشی، واتە: کڕە kiře ی مەنجەلەکە دەمێنتەوە بۆی. قڕە qiře، کە بە مانای دواکەوتوو، بە جێماوە، لەم کڕە kiře یەوە سەریهەڵداوە.

**Qisil’** قسڵ، لە کلس kilis ەوە هاتووە، بە گۆڕینی دەنگی ك k بۆ ق q و جێگۆڕکێی شوێنی دەنگەکانی وشەکە کلس kilis بووە بە قلس qilis و ئەوجا قڵس qil’is و دوایی قسڵ qisil’. وشەی کلس kilis لە وشەی لاتینی calx ەوە هاتووە کە لە زمانی ئەڵمانیدا بووە بە kalk.

**Qîz** قیز (← کچ kich).

**Qoce** قۆجە، لە: کۆجە koce ەوە هاتووە، کە ← کاسە kase یە. هەر لەمەوە، وشەی کۆجەڵە

kocel'e و کۆجێله هاتووه، که مانای کاسەی گچکەیە. خۆ ئەگەر قۆجە qoce هاوەڵنێو (صفة) بێ، ئەوا لە گۆجە goce ەوە هاتووە. (⟵ kech کەچ).

**Qofir** قۆفر، بە زەوییەکی کشتوکالی دەگوترێ کە بەردی تێدابێ. قۆفر qofir لە کۆفر kofir ەوە هاتووە. کۆفر kofir لە کۆڤر kovir و کەڤر kevir ەوە هاتووە. کەڤر kevir و کەور kewir لە زمانی کوردیدا بە مانای بەرد berd دێن (⟵ کەڤر kevir/کەور kewir).

**Qol'** قۆڵ، وشەیەکە پێوەندیی بە کۆڵ kol' ەوە هەیە. چووەتە زاری ترکییەوە. وەك kol.

**Qonterat** قۆنتەرات، لە فەڕەنسییەوە وەرگیراوە contract ە کە وەك کۆنترا دەردەبردرێ و ct دەرنابردرێ، contract مانای گرێبەند girêbend ە.

**Qorix** قۆرخ: کردنی شوێنێك بە جێیەکی تایبەتی بۆ کەسێك، یان چەند کەسێك، کە کەسی دیکە مافی بەکارهێنانی نەبێ. وشەکە مەخۆلییە و کەوتووەتە زاری ترکییەوە و ئەوجا کوردی. بنچینەی وشەکە قۆرق ە واتە: ترسە.

**Qujbin** قوژبن > قوژ quj + بن bin. قوژ quj > گوژ guj > گوش gush > گۆشە goshe. واتە: گۆشە بن goshe bin. لە زمانی کوردیدا وشەی کوژبن kujbin یش هەیە کە بە مانای قوژبن qujbin ە.

**Qul** قول (بە زۆری بە مرۆڤی رەش و بەندە دەگوترێ). لە "کۆیلە" (عبد) ەوە هاتووە کە بنەڕەتەکەی لەگەڵ وشەی skuli ی ئەڵمانی و، cooli ی ئینگلیزی یەکە. وشەکە لە بنەڕەتدا kûlî کوولی هێندییە،

که بۆ کارکەری هەرزان و بارگران و خزمەتکار و کۆڵکێش بەکاردەبرێ. قول qul چووەتە زاری ترکییەوە: kul.

**Qul'** قوڵ، جارێك بە مانای کورت kurt ە (سەرنجی وشەی دارەقوڵە darequl'e ی هەقەکان بدرێ کە بە مانای دارە کوڵە dare kul'e یە). قوڵ qul' مانایەکی دیکەشی هەیە، ئەوەش کوڵ Kul' ە، کە لە کوڵاندن kul'andin ەوە دێ. قوڵی ئاگر qul'i agir واتە: کوڵی ئاگر kul'i agir (← کەلاندن/کوڵاندن kelandin/kul'andin). وشەی قوڵپ qul'p (قوڵپە قوڵپی ئاو و خواردنی سەر ئاگر) هەر لە مەوەدێ.

**Qumash** قوماش. لە بنەڕەتدا وشەی فەڕەنسی chemise ە کە مانای کراس kiras ە و، لە عەرەبیدا بوو بە قمیص. قەمسەلە qemsele کە جۆرە چاکەتێکە هەر لەم بنەڕەتەوەیە.

**Quř** قوڕ/ حەری ĥerî/ هەری heî واتە: گڵی تەڕکراو بە ئاو. هەرسێ وشەکە و، وشەی خۆڵ xol' یش هەر لە وشەی ← گڵ gil' ەوە هاتوون. گڵ gil' و کڵ kil' هەردووکیان پێوەندییان بە گڕ giř ەوە هەیە. سەرنجی وشەی گلبێنە gil'bêne ی ← تەندوور tendûr بدرێ، کە کونێکە بۆ بێندان bêndan (هەناسەدان henasedan) بۆ ئاگری تەندوورەکە و لە بنەڕەتدا گڕبێنە giřbêne یە. دیارە گڵ gil' لە بنەڕەتدا لە ئەنجامی گڕگرتن giřgirtin ی شتێکەوە هاتووە و بووە بە گڵ (خۆڵ xol'). کڵ kil' یش هەر وایە. کڵ kil' بە شوێنی بە ئاگر سۆرکردنەوەی سواڵەت swal'et دەگوترێ.

**Quřentêne** قورەنتێنە، شوێنێکە بۆ تێداهێشتنەوەی ئەوانەی نەخۆشیی درمیان هەیە تا بە خەڵکی دیکە نەگا. وشەکە فەڕنسییە **quarantane**.

**Quřimsax** قوڕمساخ (← ترمپف **tiřimpif**).

**Qurmîsh** قورمیش، قورمیش کردن، واتە: کۆك کردن **kok kirdin** ی کاتژمێر **katjimêr** لە قورولموش **kurulmuş** ی ترکییەوە هاتووە کە بە مانای سازکردن **sazkirdin** و کۆککردن **kokirdin** ە (کۆك **kok**).

**Qurtim** قورتم (خرطوم) ← قووتدان **qûtdan**.

**Qûl'** قووڵ/ **Kûr** کوور. هەردووکیان هەر یەك وشەن بە یەك مانا، بە گۆڕینی دەنگی ق **q** و ك **k** و دەنگی ر **r** و ڵ **l'** بۆ جێیی یەکدی. لە سانسکریتدا وشەی گەبهەر **gebher** هەیە بۆ دەمکردنەوە و باویشکدان و فراونکردنی شوێنێك. ئەم وشەیە لە ئاڤێستاییدا بە شێوەی گڤرە **givre** دێ کە بۆ شتێکی شاراوە و قووڵدانراو بەکاردێ. دیارە وشەی ژوور **jûr** (شوێنی نێوەوەی خانوو/ماڵ)، هەروەها گۆڕ **goř** (قەبر) و کۆڵین **kol'în** (قووڵکردنی شتێك) پێوەندییان بەمەوە هەیە. بێجگە لەوەش وشەی جُرُف کە لە عەرەبیدا بۆ قووڵ بەکاردێ لەمەوە وەرگیراوە، کە لە پەهلەویدا هەر بە شێوەی "جرف" **curf** ە. (سەرنجی: "... اسس بنیانه علی شفا جُرُفٍ هارٍ" بده، سورة التوبة 9/109).

**Qût** قووت، وشەیەکە لەگەڵ ← رووت **rût** دێت (رووت و قووت **rût û qût**) کە ئەوەش هەر مانای رووت **rût** ە و دەنگی ر **r**

گۆڕاوە بە ق q. وشەی قووتەڵ qûtel’ (واتە: رووتێکی تەواو رووت) لە رووتەڵ rûtel’ ەوە هاتووە.

Qûtdan قووتدان، بە شتێك دەگوترێ کە بە گەروودا بچێتە خوارەوە. لە هێندەك زاراوەدا بە گەروو gerû دەبێژن قورگ qurg و قوروگ qurug یش هەیە، کە قوڕگqurg پێوەندیی بە وشەی gorge ی فەڕەنسییەوە هەیە کە مانای گەروو gerû ە، لە ئەڵمانیدا وشەی gurgeln هەیە بۆ ئاو لە دەم وەردان، خەرخەرەکردن بە ئاو، یان بە شلاوکێکی دی. بێجگە لە وشەی قورگ qurg، وشەی قورتم qurtim یش هەیە کە وشەی خرطوم لە مەوە هاتووە، وشەی قووتدان qût-dan لە قورتدان qurt-dan ەوە هاتووە کە پێوەندیی بە قورگە وە هەیە. قورت qurt کەوتووتە زاری ترکییەوە و بووە بە غورت ğurt و لە فارسیدا بووە بە گلو gilû.

Qûtel’ قووتەڵ (← قووت qût).

# R ر

Ra را، نیشانەیەکە بۆ بۆسەرەوەچوون، وەك: رابوون ra-bûn، راوەستان ra-westan. را ra بە پەهلەوی: راس ras و راه rah.ە کە دەنگی س s کۆنترە لە دەنگی هـ h.

Rapermûn راپەرموون (← فەرموون fermûn).

Rastanî راستانی/ راستینە rastîne (← راستەقینە rasteqîne).

Rasteqîne راستەقینە/ راستەقانی rasteqanî، راستینە rastîne. راستەقینە rasteqîne لە ← راست rast + هەقینە heqîne ەوە هاتووە. راستەقانی rasteqanî لە راست rast و هەقانی heqanî وە هاتووە. هەق heq وشەیەکی عەرەبییە. وشەی کوردی پەتی بەرامبەر راستەقینە rasteqîne راستینە rastîne یە کە پێچەوانەی درۆیینە diroyîne یە.

Rastî راستی (← کەرەسە kerese، ← کەرەستە kereste).

Rastîne راستینە (←راستەقینە rasteqîne).

Razan رازان /نووستن/ nûstin خەوتن xewtin > راز raz + ئان an. راز raz لە راست rast ەوە هاتووە. چۆنکە کاتێك دەنگی س s و ت t پێکەوە دێن، دەبن بە ز z وەك رستگاری ristgarî کە دەبێ بە رزگاری، راست دەکەیت rast dekeyt دەبێتە راز ئەکەیت raz ekeyt. بەم جۆرە رازان razan لە راستان rastan ەوە هاتووە، واتە: راست خۆڕاکێشان /rastxorakêshan/ راکە(و)تن rake(w)tin. رازاندن

**razandin** > راستاندن **rastandin** (خەواندن **xewandin**)، واتە: راست راخستن **rast raxistin**. ← رازاندن **razandin** وێنەیەکی دیکەی راژاندن **rajandin** ە.

**Razandinewe** رازاندنەوە، لە ئاڤێستادا وشەی برازە **biraze** هەیە بە مانای جوانی، شۆخ و شەنگی **cwanî, shox û shengî**.

**Reben** رەبەن، بە کەسێك دەڵێن کە ماڵی بە کۆڵەوە بێ و گەڕۆك بێ‌هەروەها، بە کەسێك دەڵێن کە بێژن **bêjin** و ماڵ و سەلت **selt** بێ، یان هەژار بێ. رەبەن **reben** > رێ **rê** + بەن **ben**. بەن **ben** لە بەند **bend** ەوە هاتووە، واتە: کەسێك کە بە رێوە بەندە، نەك بە ماڵەوە. بیرێك هەیە کە گوایە رەبەن **reben** لە رهبان **rehban** ەوە دێ، (کە وشەکە لە بنەڕەتدا عیبرییە و راڤڤی **ravvî** یە، واتە: "مامۆستای من". وشەکە بە شێوەی راڤینۆش **ραβίνος** کەوتووتە زمانی یۆنانی و ئینگلیزی **rabbi** و **rabbin** و ئەڵمانی **Rabbiner** و لەوەشەوە بۆ نێو زمانە ئەوروپاییەکانی دی.) لە عەرەبیدا وشەی "رب" هەیە بۆ خاوەن، مرۆڤی گەورە. رەهبانەکانیش ژن ناهێنن. بەڵام ئەمە راست نییە، چۆنکە ژنهێنان لە مرۆڤی رەبەن **reben** رێبەند **rêbend** (ممنوع) نەکراوە ، وەك ئەوەی لە رەهبانی دیان کراوە، بەڵکو خۆی ژنمێری **jinmêrî** (زواج)ی نەکردووە.

**Rechel’ek** رەچەڵەك (بنەچە و رگی شتێك). > رەچە **reche** + ڵەك

l’ek. رەچە reche و، رەتە rete هەر یەك شتن. رەتە rete رەگە rege یە. سەرنجی وشەی رەتەوە retewe بدرێ کە بە مانای بناوانی خێزان دێ و، لە گەل وشەی ← رەگەز regez کە، لە رەگەزێ regezê (واتە: لە رەگەوە زاوە le regewe zawe) و وشەی race ی ئینگلیزی و Rasse ی ئەڵمانی یەك بنەچەیان هەیە.

**Rechend** رەچەند (ئەو پارچە کاغەزەیە کە بژیشك (دکتۆر) نێوی دەرمان دەنووسێ لە سەری بۆ نەخۆش، تا بچێ لە دەرمانخانە وەریبگرێ. وشەکە ئەوروپاییە. سەرنجی وشەی Rezept ی ئەڵمانی و recipeی ئینگلیزی بدرێ کە هەردووکیان لە وشەی لاتینی recipere (receptum) ەوە هاتووە کە مانای ئەوە دەگەیەنێ، کە دەرمانساز راسپێریی دوکتۆری وەرگرتووە. چۆنکە وشە لاتینییەکە، مانای گەیشتن دەگەیەنێ، کە وشەی گەیشتن لە زمانی ئینگلیزی ئەورۆپادا to recieve ە. رەچەتە، بە کوردی ← پەتە pete و ← پسووڵە pisûl’e ی دوکتۆرە. "وصلة" کە عەرەبی عێراق بۆ پارچە پەرۆ بەکاریدەبەن لەمەوە هاتووە.

**Rechû** رەچوو/ رەچووکاو rechûkaw (بە کەسێك دەبێژن، کە گوێنەداتە قسەی کەس و سەرەرۆ بێ) رەچوو rechû > رەچ rech + چوو chû. کورد دەبێژن: لە رەچ چووەتە دەرێ. رەچە riche/reche لە کوردیدا بە باریکەرێ دەگوترێ. دەگوترێ:

رچەی شکاند richey shkand واتە: ڕێیەکی باریکی کردەوە. وشەی: رەچوو rechû لە عەرەبی و فارسیدا بوە بە: لجوج lecûc.

Refîsk رەفیسک (پشتی ئەژنۆ pishtî ejno) > رەف ref + یسک îsk). - یسک îsk - و، یچك îchk نیشانەی بچکۆلەکردنەوەیە. وشەیەکی هاومانای رەفیسک هەیە، ئەوەش: رەپیسک repîsk ە. رەف ref لە شێوەی کۆنیدا رەپ rep بووە و دەنگی پ p بووە بە ف f، وشەی رەفە refe رەپە repe یە. رەپ rep، بە شتێك دەبێژن کە دەرپەڕیبێ و قیت بێ. وشەی "رَفّ" ی عەرەبی لەم رەپ rep ەوە وەرگیراوە.

Regez رەگەز > رەگ reg + ـە e + ز z. ز z کورتکراوەی زا za و زایین zayin (زاوزێ zawzê) یە. (← رەچەلەك rechelek). ئەم وشەیە بە فەڕنسی race و بە ئینگلیزی race و بە ئەڵمانی rasse و بە ئیتالیایی razza یە.

Remekî رەمەکی، لە رووەکی rûwekî یەوە هاتووە، واتە: لە خۆیەوە رواوە و پەیدابووە.

Rest-axêz (← رزگاری Rizgarî).

Rete رەتە (← رەچەڵەك rechelek).

Retewe رەتەوە (← رەچەڵەك rechelek).

Rewa رەوا، بە بارودۆخێك دەگوترێ، کە هەق و راست، یان، قانوونی بێ، بە پەهلەوی: رەواك rewak ە.

rexne رەخنە، لە رەژنە rejne و ڕێژنە rêjne ەوە هاتووە، واتە: رێ - ژەندن rê-jendin کە ئەوەش مانای لێدانی - رێ

lêdanî rê یە، یان رێ کوتان rê kutan ە.

Rexsan رەخسان/ رەخساو rexsaw (← رسکان riskan)

Rê رێ، وشەیەکی هیندۆئەوروپاییە، بە فەرەنسی rue و لە ئینگلیزیدا road و لە ئەڵمانیدا route یە کە ئەمەش لە وشەی فەرەنسی route ەوە وەرگیراوە و سەرچاوەکەی وشەی لاتینی rupta یە، لە فارسیدا بووە راه rah ە.

Rêsa رێسا < رێ rê + سا sa < رێ rê + ئاسا asa < رێئاسا rêasa واتە: رێی ئاسایی rêy asayî، رێ و شوێنی باو rê w shwênî baw.

Rêwas رێواس، جۆرە گیایەکی ئەستوورە، تامی مزرە، لە کۆنەوە لە کوردستاندا، بۆ هێندەك دەرمان بەکاردێ، لە فارسیدا بووە بە: رواس revas.

فەرهەنگی فارسی موعین (معین) نەزانانە، دەبێژێ عەرەبییە. بەڵام وشەیەکی کۆنی کوردییە. بە فەرەنسی rhubarbe و بە ئینگلیزی rhubarb و بە ئیتالیایی rabarbaro و بە ئەڵمانی Rhabarber و بە لاتینی rabarbaro کە ئەوەش لە یۆنانیی ناڤینەوە هاتووە کە rhá-bárbaros ە. rhá لە یۆنانی ناڤیندا مانای ← رەگە reg ە.

Rib رب (← رچال richal).

Richal رچال، رەچەڵ rechel/ریچاڵ rîchal (مێوەی کوڵاو و تێکەلکراو لەگەڵ شەکر، کە لەگەڵ بەرچایی دەخورێ) و بە عەرەبی (مربی) یە. لە سانسکریتدا بە رب rib ی مێوە دەگوترێ: رسا risa کە رب rib (ربی هەنار ribî henar)ە، وێنەیەکی دیکەی رچ rich ە.

رچ **rich** له زمانی کوردیدا، به شلاییەك دەبێژن كە مەیی بێ (**meyîn**) یان، توندبووبێتەوە، كە رەپ **rep** بە مانای كرژبوون و هەستان پێوەندیی بەمەوە هەیە. رچاو **richaw** بە مەیینی شلایی و بەستنی سەهۆڵ دەگوترێ. هەر لە كوردیدا بە هەوێنی پەنیر دەگوترێ ریت **rît** و بە هەویری شلیش دەگوترێ ریكە **rîke**. ـ ئاڵ/ل **al'/l** ـ لە كوڵاندن **/kul'andin** كەلاندن **kelandin** ەوە كورتكراوەتەوە. واتە: هەوێنێك كە كوڵێنرابێ. رچاڵ **richal** بە گۆڕینی شوێنی دەنگەكانی وشەكە، لە زاری فارسیدا بووە بە لیچار **lichar**.

**Rijandin** رژاندن (← رز **riz**/ رزین **rizîn**).

**Riskan** رسكان/ رسكین **riskîn**/ رستكان **ristkan** لە خۆوە دروستبوون، لە خۆوە پەیدابوون. وشەكە پێوەندیی بە ← رووان **rwan** ەوە هەیە، وشەی رەخسان **rexsan**/ رەخسین **rexsîn** یش هەر پێوەندیی بە رووان **rwan** ەوە هەیە.

**Riste** رستە (← ریز **rîz**).

**Rizan** رزان/ رزین **rizîn**/ دارِزان **dařizan** وێنەیەكی دیكەی رژان **rijan** و دارژان **darijan**ە، واتە: وشكبوون و گیان پێوەنەمان و هەڵوەرین. رژان **rijan** (سەرنجی ئاوڕژان بدرێ) كە لە عەرەبیدا بووە بە: رشّ (رش الماء = ئاوڕژان). هەروەها، لە كوردیدا: ئاورِشێن **awrishên** یش هەیە كە ئاورژێن **awrijên**ە. لە زمانی كوردیدا وشەی رز **riz** بۆ جیابوون و لە بەریەك چوونی

چەند شتێك دەگوترێ. لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Riß (ریس) هەیە کە لە زمانی ئەڵمانی کۆندا riz ە و، ئەمەش بە شوێنێك دەگوترێ کە درزی تێبووبێ، یان دڕابێ. بە ئینگلیزی rent ە.

**Rizgarî** رزگاری، لە رستگاری ristgarî ەوە هاتووە و ست st بووە بە ز z. راست بوونەوە rast bûnewe لە زمانی کوردیدا بە هەستان لە خەو. و، تەنانەت بە زیندووبوونەوەش دەگوترێ. بۆ وێنە: دەگوترێ: لە مردن راستبووەوە، لە نەخۆشی راستبووەوە، واتە: رزگاری بوو. هەروەها وشەی راست خێز rast xêz کە بە مانای زیندووبوونەوە دێ، لە راست rast و ئاخێز axêz ەوە هاتووە. ئاخێز axêz بە مانای راپەڕین rapeřîn و هەستان hestan و هەستانەوە دێ. راست ئاخێز rastaxêz لە فارسیدا بووە بە رستاخیز rastaxîz، هەر بە مانای زیندووبوونەوە. ئاخێز axêz لە ← ئاخ ax (← خاك xak) و خێزە xêze ەوە هاتووە، خێز xêz مانای خۆدەرخستن xoderxistin ە. واتە: لە خاکەوە سەری دەرهێناوە، خۆی دەرخستووە.

**Rîk** ریك/ ریگ rîg پارچە و پلۆوچی بەرد، کە لە ئەنجامی هووردکردن، یان، باران بارین بە سەریدا هوورد و خاش دەبن. ریك rîk بە شێوەی ریگ rîg کەوتووەتە فارسییەوە. وشەکە پێوەندیی بە وشەی رین rîn ەوە هەیە، واتە: پیسیکردن، کە لە پەهلەویدا: ریتەن rîten ە.

وشەی ریخ rîx واتە: پیسایی چوارپێ، هەروەها ← ریقنە rîqne پیسایی ← مەل mel پەیوەندیی بەم وشەیەوە هەیە.

**Rîqne** ریقنە (← ریك rîk/ ریگ rîg).

**Rîsh** ریش، ری rî، رە reh، ردێن ridên بە ئاڤێستایی رەئەشە reeshe و بە پەهلەوی: ریش rîsh و رێش rêsh ە. هەروەها وشەی ریس rîs کە بە دەزوو و، تاڵ تاڵ، دەگوترێ: پێوەندیی بە ریش rîsh ەوە هەیە، بە گۆڕینی دەنگی ش sh بە س s.

**Rîshal'** ریشاڵ/ **Rîzal'** ریزاڵ (پارچەیەکی باریك لە کالآیەك). ریش rîş و ریز rîz پێوەندییان بە ریس rîs ەوە هەیە کە دەزووە. ـاڵ -al' نیشانەی گچکەکردنەوەیە (← ریش rîsh).

**Rîswa** ریسوا، لە رست ـ وا rist-wa، وا wa مانای پێچەوانەیە، رست ـ وا، واتە: پێچەوانەی رست، پێچەوانەی ← ریز rîz.

**Rîtal** ریتاڵ/ رووتەڵە rûtel'e. ریت rît و ← رووت rût هەریەك وشەن، بە گۆڕینی بزوێنی î و û بۆ جێگەی یەکدی. ئاڵە al'e نیشانەی گچکەکردنەوەیە.

**Rîx** ریخ (← ریك rîk).

**Rîz** ریز، لە رست rist ەوە هاتووە. پێڕست pêřist واتە: بە پێی رست be pêy rist، بە پێی ریز be pêy rîz، پێڕست لە عەرەبیدا کراوە بە فهرست (فهرس) بە گۆڕینی دەنگی پ P بۆ ف f. ئەمەش لە گەلێك وشەدا دیارە، بۆ وێنە: پۆلات polat ی کوردی، لە عەرەبیدا بووە بە فولاذ، پەهلەوی pehlewî کراوە بە فەهلەوی

fehlewî، پاڵوودە palûde
کراوە بە فالوذج faluthec.
دەبێ ئەوەش بخەینە بەرچاو کە
وشەی رەستەك restek لە
پەهلەویدا بە مانای یەك لە
دوای یەك yek le dway yek
دێ، واتە: رستە riste. دیارە
دەنگی ست st دەبێتە ز z (←
رزگاری rizgarî).

**Robar** رۆبار < رۆ ro + بار bar.
رۆ ro بە پەهلەوی رۆت rot ە،
کە بە عەرەبی (نهر)ە و، لە
فارسیدا بووە بە رود rûd. رۆ
ro، پێوەندیی بە رۆچوون
rochûn ← گەڕیان geryan
(جريان) ەوە هەیە. وشەی رۆ
ro، پێوەندیی بە ← لوولە
lûle شەوە هەیە، کە لوولە lûle
ی کوردی و وشەی رۆر rohr ی
ئەڵمانی کە ئەوەش هەر لوولەیە
و reed ی ئینگلیزی کە زەل
zel ە پێوەندییەکی رەگییان
پێکەوە هەیە.

**Roj** رۆژ، بە پەهلەوی: roch ە، هەر
وەك کوردیی گۆرانی کە roch
ە. لە فارسیدا بووە بە روز rûz.
رۆژن rojin و رۆژین rojîn
← (رۆناك ronak) ی کوردی
لە فارسیدا بووە بە روشن
roshen و، لە ترکیدا بووە بە
revşen. روشن roshen ی
فارسی لە کوردییەوە وەرگیراوە،
چۆنکە دەنگی ژ j بووە بە ش
sh. ئەگەر فارسی بوایە، دەبوو
بگوترایە، روزن rûzen چۆنکە،
وشەی رۆژ roj بە فارسی: رۆز
rûz ە. هەروەها وشەی ←
رۆشنبیر roshinbîr هەر لەم
بنەمایە وەرگیراوە (←
کلاورۆژنە kil'awrojne).

**Ronak** رۆناك/ رووناك rûnak.
وشەی رووناك rûnak لە

نێوچەی سلێمانی و، هێندەك نێوچەی کەرکووك و رۆژهەڵاتی کوردستان بەکاردەبرێ. بەڵام، لە هەولێر و کۆیە و رۆژئاوای کوردستان رۆناك ronak بەکاردەبرێ. لە باکووری کوردستان رۆنی ronî بۆ رۆشن/ رۆژن و رۆناك بەکاردەبرێ. تەنانەت فرمێسکیش لەبەر رەنگە رۆناکەکەی بە "رۆندك rondik و رۆنتك rontik" نێودەبرێ. رۆناك ronak (بە o) لە رووناك rûnak (بە û) راسترە. چۆنکە رۆناك ronak لە رۆژناك rojnak ەوە هاتووە. کورد بە ← خۆر xor دەبێژن رۆژ roj و نابێژن رووژ rûj. لەبەر ئەوە رۆناك ronak کوردیترە لە رووناك rûnak، وەك چۆن وشەی رۆشن roshin لە رەوشەن rewshen راسترە.

چۆنکە رۆشن roshin لە رۆژن rojin ەو هاتووە، واتە: رۆژلێداو، هەتاوی. کورد دەبێژن: رۆژن rojin و نابێژن رۆژەن rojen. فارس، وشەی رۆژن rojin یان لە کوردییەوە وەرگرتووە و کردوویانە بە روشن rewshen. خۆ ئەگەر ئەم وشەیە فارسی بووایە، دەبوو ببوایە بە رَوْزَنْ rewzen، چۆنکە بە فارسی بە رۆژ roj دەبێژن روز rûz. هەر لە فارسیدا وشەی رَوْزَنە rewzene هەیە، کە بۆ کلاورۆژنە kil’awrojne بەکاردەبرێ، کە وشەکە کەوتووەتە زاری عەرەبیشەوە و، بەو کونە دەگوترێ کە لە سەربان دەکرێ، بۆ ئەوەی تیشکی رۆژ roj (خۆر xor) بێتە ژووریماڵێك. هەروەها رۆشنبیر roshinbîr

(← **Bîr بیر**) مانای رۆناکبیره و له رۆژنبیر **rojinbîr** ەوه هاتووه.

**Roshinbîr** رۆشنبیر (← رۆناك **ronak**/ رووناك **rûnak**).

**Rovî** رۆڤی (ریخۆڵه **rîxol'e**) > رۆ **ro** + ڤی **vî**. رۆ **ro** به پەهلەوی رۆت **rot** ە. (← رۆبار **robar**) واته: شوێنی گەڕیانی شتێك، یان شلاوێك. ریخۆڵه **rîxol'e**/ ریخۆره **rîxore** ریخ ـ ڕۆره **rîx-rore**/ ریخ ـ لۆله **rîx-lole** یە، به گۆڕینی دەنگی ر **r** بۆ ڵ **l'**. ← ریخ **rîx** وەك ری **rî** و ← ریك **rîk** مانای پیسایيیە. ریخۆره **rîxore** واته: رووره (لووله)، رێی پیسایی. سەرنجی وشەی ریان **riyan** بدرێ کە مانای پیساییدەرکردنە له لەش.

**Rû** روو/ رۆ **ro**/ رۆخ **rox** (رۆخسار) له پەهلەویدا: **rod** ە. (← روان **rwan**).

**Rût** رووت، له وشەی روخت **rûxt** ی ئاڤێستاییەوە هاتووە، کە له فارسیدا بووە به لخت **loxt**.

**Rûte** رووته (← شەلێت **shelêt**).

**Rwan** روان، له رۆشن **roshin** ەوە دێ. روان **rwan** ئەوەیە کاتێك تۆوێك (← تۆو **tow**) دەخرێته ژێر زەوی، واته: دەخرێته شوێنێکی تاریك، پاش ماوەیەك سەرهەڵدەدا و روو **rû** ی خۆی دەردەخا واته: رۆشنایی خۆی دەردەخا. کە وشەی روو **rû** (دەموچاو) یش هەر له رۆشنایی **roshnayî** یەوە هاتووە.

# S س

**Sabûn** سابوون، لە زمانە ئەوروپاییەکاندا بە شێوەی نێزیك لە یەك هەیە. بە فەڕەنسی **savon** ە و، بە ئینگلیزی **soap** و بە ئیتالیایی **sapone** و بە ئەڵمانی **Seife** یە. لە زاری عەرەبی و فارسیدا بووە بە "صابون". شایانی باسە، کە لە کوردستانی کۆندا و، هەتا ساڵانێك لەمەوبەر، جۆرە ← ئارد **ard** ێك هەبوو کە لە هوردکردنی گژوگیا دروستدەکرا و، پێی دەگوترا (ئە)سپۆن **(e)spon** و، بەوە، کە وەك سابوون **sabûn** کەفیدەکرد، جلك دەشۆردرا پێی و، ئەو دەمە، ئەم سابوونەی ئەورۆ هەیەو، لە ئەوروپاوە سەریهەڵداوە، نەبوو و، نەدەناسرا، تەنێ سابوونی بەزی لە کوردستان دروستدەکرا.

**Saman** سامان، ئەم وشەیە ئەورۆ بۆ ← سەروەت **serwet** و دەوڵەت **dewl'et** بەکاردێ، وشەکە بنەچەیەکی سانسکریتی هەیە کە سامە **same** یە و، بە مانای هەموو **hemû** دێ. سەرنجی وشەی ئەڵمانی **samt** بدە کە مانای هەموو دەگرێتەوە. لە زمانی لاتینیشدا وشەی **summe** هەیە، کە لە ئەڵمانیشدا بەکاردەبرێ و مانای: هەموو بەسەریەکەیەوە (هەڤ **hev**). هەروەها وشەی ئینگلیزی **to sum** مانای کۆکردنەوە و، خستنە سەر یەکە، کە بە ئەڵمانی **sammeln** ە. بەلای منەوە، وشەی سامان **saman**، باشترین وشەیە کە بۆ دەوڵەت **state** بەکاربیرێ. کە وشەی ئینگلیزی **wealth** و، وشەی

ئەڵمانی Reich هەردووکیان، بە مانای دەوڵەت state و لە هەمان کاتدا، بە مانای دەوڵەمەندییش دێن.

San سان، نازنێوێکە لە نێو کوردەکانی گۆراندا ماوە و، بۆ سەرگەورەکانیان بەکاریدەهێنن، وەك: جافرسان Cafirsan. سان san مانای پیرۆز pîroz ە، ئەم وشەیە لە زمانی لاتینیدا وەك: سانت saint هەیە. دوور نییە، وشەی سیمرخ sîmirx کە باڵدارێکی خەیالی و پیرۆزە، لە بنەڕەتدا سان مر san mir واتە: مەلی پیرۆز melî pîroz بووبێ (← مر mir). چۆنکە لە ئاڤێستا و پەهلەویدا بە شێوەی سینمروو sînmirû هاتووە و لە زمانی کوردیشدا بەرامبەر وشەی سیمرخ sîmirx سینمەل sînmel هەیە (← مەل mel). دیارە وشەی سیمیار sîmyar کە نازنێوێکە بۆ ← زەردەشت zerdesht پێوەندیی بەمەوە هەیە.

Sansor سانسۆر: چاوخشتنەسەر وتاری رۆژنامە و بلاوکراوەی دی و هەڵسەندگاندنی، کە بە عەرەبی "رقابة" یە. لە وشەی لاتینی: censor ەوە هاتووە کە لە ئەلمانیدا zensor و لە زمانی فەرەنسیدا censure بۆ نمرەدانان لە سەر ئەزموونی قوتابیی بەکاردەبرێ. بە ئینگلیزی censor.

Saq ساق (← sax ساخ).

Saqo ساقۆ/ ساکۆ sako. بە پالتۆ palto دەگوترێ. وشەکە بنەڕەتێکی ئەوروپایی هەیە. بە ئەڵمانی sack و بە فەرەنسی sac و بە ئینگلیزی sack، کە لەم زمانە ئەورۆپاییانەدا بۆ

← هەگبە hegbe، یان توورەکە tûreke ( ← توورەك tûrek) بەکاردەبرێ.

Sava/Sawa ساڤا/ساوا، شتی تازە پێگەیشتوو، تازەبوو، تازە زاو. ساڤا/ساوا، لە زاڤە/زاوە zave/zaweوە هاتووە واتە: شتێك کە لە دایك بووە، تەنانەت، بەو بێچووە ئاژەڵانەی کە لە گەڵ دایکەکەیان دەگەڕێن، بە کوردی دەگوترێ: ساواما sawama کە لە ساوا ماك sawamak/ زاوماك zawmak ە، کە/ ← ماك mak دایکە (← dayik دایك). وشەی صبی عەرەبی لە ساوا/ساڤا وە هاتووە. ئەمەش پێچەوانەی ئەو زانیارییەیە، کە کاتی خۆی بە هەڵە لە پەڕتۆکی "زمانی یەکگرتووی کوردی" دا نووسیبووم، کە ساوا، لە صبي عەرەبییەوە هاتووە، ئەوە راست نییە، پێچەوانەکەی راستە.

Sax ساخ، مرۆڤی تەندروست، یان شتێك، کە ناتەواویی تێدا نەبێ. ساخ sax وێنەیەکی دیکەی ساز saz ە، کورد دەبێژن: کەیفم سازە، واتە: کەیفم تەواوە. یان: ئەمە و، ئەوە، پێکەوە ناسازێن، واتە: پێکەوە، یەکدی تەواو ناکەن. ساق saq یش، هەر بە مانای: ساخ sax و ساز saz بەکاردەبرێ. ئەم وشەیە، بە شێوەی ساغ sağ کەوتووەتە زاری ترکییەوە. (← نەساخ nesax).

Saye سایە (← دراوسێ dirawsê).

Sayeqe سایەقە (ئاسمانی بێ هەور بەتایبەتی لە شەودا). لە سایەکەش saye kesh ەوە هاتووە. سایە saye واتە: ساف و لووس و بێنەخش. کەش kesh

به عەرەبی (طقس)ە کە جۆری ئاو و هەوا aw û hewa یە. وشەی seqa سەقا، کە لەم سالانەی دواییدا لە هەولێر بۆ کەش بەکاردەبرێ، لەم سایەقەیەوە وەرگێراوە. سایەقە لە (صاعقة) ی عەرەبییەوە نەهاتووە.

Saz ساز (← sax ساخ).

Sed سەد (← سەت set).

Sefer سەفەر (← سوار swar).

Sefir سەفیر (← سپاردن sipardin).

Sefaret سەفارەت (← سپاردن sipardin).

sekir سەکر/ سەکرکردن sekirkirdin (داخستنی دەرگە و پەنجەرە)، لە: سەرکڕکردن ser-kiř-kirdin ەوە هاتووە، واتە: لە سەرەوە کڕ kir (بێدەنگ bêdeng) کردن. ئەم وشەیە کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە: "سَكَرْ ألباب" واتا "دەرگەکە داخە".

semawer سەماوەر، وشەیەکی رووسییە самовар، کە مانای ئەوەیە "لە خۆوە جۆش دەستێنێ". وشەکە کەوتووەتە گەلێك زمانەوە بەتایبەتی زمانە ئەوروپاییەکان و رۆژهەلاتییەکان.

Seqet سەقەت، لە شەکەت sheket (ماندوو mandû و پەککەوتە pekkewte) ەوە هاتووە. کە شەکەت sheket یش لە شکان shikan و تێکچوون têkchûn ەوە هاتووە.

Sera سەرا، کە بۆ خانووی فەرمانگەی میری (حکومەت)، بەکاردێ، لە بنەڕەتدا مانای خانوو xanû/ خانی xanî یە. هەر لەمەوە، karwansera کاروانسەرا دروستبووە، کە ئەو خانووەیە،

که کاروانەکە لێیدابەزیوە بۆ پشوودان و حەسانەوە. (← کاروان **karwan**).

**Seraw** سەراو، کە بە زمانە ئەوروپاییەکان **fatamorgana** یە، ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ پێیوایە، ئاوی تێدایە، بەڵام تێیدا نییە و ← تراویلکە **tirawîlke** یە. ئەم وشەیە چووەتە زاری عەرەبییەوە و بووە بە سراب و، تەنانەت لە قورئانیشدا هەیە "أعمالهم كسرابٍ بقيعةٍ يَحسبُها ألظَمْآنُ ماءً... الخ" (سورة النور 24/39).

**Serbar** سەربار/ سەربارە **serbare** بە شتێك دەگوترێ، کە بخرێتە سەر بارێك، یان، سەر شتێکی دیکە. بە عەرەبی پێدەگوترێ "إضافي". سەربار **serbar** لە وشەی ئاڤێستایی: سەرەبارە **serebare** وە هاتووە.

**Serbaz** سەرباز/ سەرواز **serwaz**. واتە: ← ئەسکەر **esker**. بۆیە پێیدەڵێن: سەرباز چۆنکە سەری بۆ بازین **bazîn**، واتە: بۆ مردن ئامادەیە. بازین **bazîn** لە زمانی کوردیدا بە مانای دۆڕاندن **dorandin** دێ (سەرنجی وشەی گیانباز **giyanbaz** بدە، واتە: کەسێك ئامادەبێ گیانی لە پێناو شتێکدا بدۆڕێنێ.

**Serbest** سەربەست، واتە: سەربەستراو **serbestiraw**، سەرگیراو **sergîraw**، داخراو **daxiraw**. ئەم زاراوەیە، لە سەر دەمی کۆندا، بۆ رۆژی پشوودان **pshûdan** بەکاردەبرا، کاتێك دوکان و فەرمانگەکان دادەخران و خەڵك پشوویان دەدا و، نەدەچوون بۆ کار، سەری دوکانەکانیان دەبەست و، هەر

کەس ئازاد بوو، خەریکی چی دەبێ، ببێ. لەوەوە، وشەی سەربەستی **serbestî** بە مانای ئازادی **azadî** لە زمانی کوردیدا بەکارهێنرا و دەهێنرێ. بەڵام هەر بە شێوە کۆنەکەی، کەوتە ترکی و فارسییەوە. زاری ترکی سەربەست **serbest** بۆ رۆژی بێکاری بەکاردەبا. زاری فارسیش سەربەست بۆ سەربەستراو بەکاردەبا.

**Sergiran** سەرگران، بە کەسێك دەگوترێ کە تەمەڵ و تەوزەڵ بێ، هەروەها بە سەرخۆشیش دەگوترێ. وشەی "سکران" کە لە عەرەبیدا بەکاردەبرێ بۆ ← سەرخۆش **serxosh** لەم سەرگران **sergiran** ەوە هاتووە.

**Seĥ** سەح/ سەحکرن **seĥkirin** (من سەح نەکر، ئەو چ گوت **min (seĥ nekir ew chi got** (تێنەگەیشتم ئەو گۆتی چ **tê (negeyishtim ew gotî chi** لە ساخ کرن **sax kirin**/ ساخ کردنەوە **sax kirdinewe** وەو هاتووە (واتە: ساخم نەکردەوە **(saxim nekirdewe**). سەح **seĥ** لە صح ی عەرەبییەوە نەهاتووە.

**Sermawez** سەرماوەز (← وچان **(wichan**).

**Sermaye** سەرمایە (← مایە **maye**).

**Serwet** سەروەت > سەر **ser** + وەت **wet**. سەر **ser** لە زمانی کوردیدا بە پارەیەك دەگوترێ کە لە کڕین و فرۆشتنی شتێکدا دەمێنێتەوە. هەر لەمەشەوە وشەی سەرمایە **sermaye** > سەر **ser** + مایە **maye** (رأس المال) هاتووە. وەت **wet** لە وەتە **wete** ەوە هاتووە، کە بە مانای ئاوسایی **awsayî** و باکردن **bakirdin** و زلبوون **zilbûn** ە، بە شێوەزارێکی کوردی، بە گون

gun دەگوترێ: وەت wet و، بە گونی فۆڕی ئاوساو دەگوترێ وەتە wete. کە وەتە wete لە ڤەتە vete > ڤەتێ vetê وە هاتووە. ڤە ve > ڤا va (با ba)/ هەوا hewa. سەروەت، پارەیەکە کە قەوارەی گەورە بووبێ، وشەی "ثروة"ی عەرەبی لەم (سەروەت serwet) ەی کوردییەوە وەرگیراوە.

Serxosh سەرخۆش، خۆش لە زمانی کوردیدا گەلێک مانای هەیە، وەك: دلڕاکێش، شیرین... هتد. سەرخۆش بە کەسێك دەگوترێ کە شلاوکێکی کهوولاوی خواردبێتەوە و پێی مەست بووبێ، واتە: سەری خۆش بووبێ. ئەم وشەیە لە فارسیدا مەست mest ە. بەڵام سەرخۆش، هەر وەك خۆی، چووەتە زاری ترکییەوە و، ئەڕۆ بە تیپی لاتینی، بەم جۆرە: serhoş دەینووسن.

Set سەت، کە بریتییە لە ژمارە 100. لە هێندەك شێوەزاری کوردیدا سەت set ەو لە هێندەکی دیکەدا، سەد sed ە و لە ئاڤێستاییدا سەتە sete یە و، لە پەهلەویدا سەت set ە و لە فەرەنسیدا سانت sant ە. هێندەك کەس لە نووسینی کوردیدا، وەك "صد"دەینووسن کە ئەوەش هەڵەیە.

setil’ سەتڵ، وشەیەکی کۆنی هێندۆئەورووپاییە. بە زمانی لاتینی ناڤین scatula یە کە لە زمانی ئیتالیاییدا بووە بە scatola و لە فەرەنسیدا cassette و لە ئەڵمانیدا بووە بە شاختل Schachtel کە بۆ قوتوو بەکاریدەبەن. هەروەها لە ئەڵمانیدا وشەی schatulle

هەیە کە بۆ سنووقی گچکە بەکاردەبرێ کە زێڕ، یان شتی بە نرخی تێدەخرێ. ئەم وشەیە لە عەرەبی و فارسیدا بە شێوەی "سطل" دەرهاتووە. وشەی سنووق sinûq/ سندووق sindûqکە بە رووسی сундýкە و لە عەرەبی و فارسیدا بووە بە "صندوق" و لە زمانی کوردیدا بۆ جۆرە ← هەگبە hegbe یەك، یان بۆ ئامێری قەوانلێدان بەکاردەبرێ، هەر لەمەوە وەرگیراوە.

**Sext** سەخت (← خەست xest).

**Seywan** سەیوان/ سێوان sêwan. بە مانای ← چەتر chetir دێ. سێوان sêwan > سێ sê (سێبەر sêber) + وان wan (پاشگرێکە بۆ پارێزگاریی شتێك، یان کەسێك، یان هەبوونی شتێك). وان wan لە خاوەن xawenەوە دێ.

**Sibê** سبێ (← sivê سڤێ).

**Sifir** سفر، مانای هیچ hîch و، مانای شتێك shitêk. لە وشەی سانسکریتی sunya (سونیا) وە هاتووە کە بە مانای نیشانە nîshane دێ و، کەوتووەتە زمانی لاتینییەوە. لەمەوە وشەی "صفر" ی عەرەبی و "صفر" ی فارسی و zero ی ئینگلیزی و ziffer ی ئەڵمانی و chiffereی فەرەنسی وەگیراوە. لە فەرهەنگەکانی زمانی ئەڵمانیدا بە هەڵە، بە وشەیەکی عەرەبی دەدرێتە قەڵەم.

**Sikandal** سکاندال. وشەیەکی ئەوروپاییە بەمانای "ریسوایی" rîswayi و ئاوڕووچوون awřûchûn بە لاتینی scandalum و بە فەرەنسی scandale و بە ئەلمانی Skandal ە.

# S س

**Sim** سم، نینۆکی چوارپێی بەرزە ولاخ کە کون دەکرێ، واتە: دەسمرێ **desimrê** بۆ ئەوەی نالّی بکەن. نالّیش، وەك کەوشی بەرزە ولاخ وایە. "سم" لە "سمین" ەوە دێ کە مانای کونکردنە. لە پەهلەویدا بە شێوەی "سومب **sumb**"ە. سەرنجی وشەی **Sieb**ی ئەڵمانی بدرێ کە بۆ پالێوك (مصفی) بەکاردێ، کە ئامیرێکی کونکونە و بە ئەڵمانیی کۆن **Sib**ە و بە ئینگلیزی **sieve**ە. وشەی "سمکری" ی عەرەبی کە لە "سمکرە" ەوە هاتووە لە بنەڕەتدا "سمکاری" **simkarî** یە و کوردییەکی تەواوە.

**Simte col'e** سمتە جۆڵە، لە سمتە جوڕڕە **simte cuřře** ەوە هاتووە، کە جوڕڕە **cuřře** لە زمانی کوردیدا بە بازی نێر **bazî nêr** و شتی بچکۆلەش دەگوترێ. سمتە جۆڵە **simte col'e** قنگە جووڕە **qinge cûře** شی پێدەگوترێ.

**Sil** سل/ خول **xul**/ توورە **tûre** (← خول **xul**). وشەی "زعل" ی عەرەبی بەمانای تووڕەیی لەم سل **sil** ەوە هاتووە.

**Silaw/v** سلاو/ڤ، لە سەلام **selam** (سلام) ی عەرەبییەوە نەهاتووە، بەلکو، وشەکە پێوەندیی بە وشەیەکی کۆنی لاتینییەوە هەیە کە سالووس **salus** ە و لە فەڕەنسیدا وەك سالووت **salut** و سالوی **salû** بۆ سلاو/ڤ کر(د)ن بەکاردەبرێ. سالووت **salut** سلاوێکە بۆ ریزلێگرتن و بەخێرهاتنی مرۆڤی پایەبەرز، یان بۆ بەخێرهاتن لە لایەن لەشکەرێکەوە، بەکاردێ.

**Silf** سلف، کلیلی خستنە کاری ترومبێل. وشەکە لە **slave** ئینگلیزییەوە وەرگیراوە کە بۆ

ئەو ئامێرە بەکاردێ کە دەزگەی کارەبایی پێدەخرێتەکار.

**Sindûq** سندووق/ سنووق **sinûq** (← سەتل **setil**).

**Sinkrêtîstî** سنکرێتیستی. واتە: دانانی چەند ڕێبازێکی ئاینیی جیاواز لەیەك لە تەنیشت یەکەوە و بەستنیان بە یەکەوە، بێ ئەوەی هیچ کامیکیان تایبەتکاری خۆی لەدەست بدات، بەڵام دروستکردنی یەکەیەکی نوێ لەم پێوەندییە گشتگرییە.

**Sinûr** سنوور/ مەرز **merz**/ کەوشەن **kewshen**. وشەیەکی کۆنی هیندۆئەوروپاییە، سەرنجی وشەی **centure** ی فەرەنسی بدرێ کە بۆ ← پشتێن **pishtên** بەکاردەبرێ. هەروەها وشەی ئەڵمانی **schnur** و ئەڵمانیی کۆن **snuor** و **snur(a)** کە ئەوەش هەر هاوڕەگی **centure** ی فەرەنسییە و، بۆ قەیتان **qeytan** و پەت **pet** ی شتومەك بەستن بەکاردەبرێ. ئەم وشەیە وەك سنر **sinir** کەوتووەتە زاری ترکییەوە.

**Sipardin** سپاردن، واتە: شتێك بەرەوڕووی یەکێك بکرێتەوە، یان، لای دابنرێ، بۆ پاراستنی، یان، وەك کارێك کە جێبەجێی بکات. ئەم وشەیە لە فارسیدا "سفارش کردن"ە و، لە بەر ئەوەی دەنگی پ **p** لە زمانە ئێرانییەکاندا لە دەنگی ف **f** کۆنترە، وشەی سفارش **sifarsh** لە سپاردن **sipardin** ەوە هاتووە و لە پەهلەویدا بە شێوەی ئەپەسپارەتەن **epespareten** ە و، لەبەر ئەوەی وشەکە لە بنەڕەتدا فارسی نییە، سفارتن **sifarten** بەکارناهێنرێ. هەروەها وشەی عەرەبی "سفارة" و "سفیر" یش

له "سپاره sipare" و پێ سپێر pê sipêr ی کوردییەوە هاتووە. "سەفیر" کەسێکە نوێنەرێتی دەولەتێك سپێردراوە پێی. وشەی سپارە sipare لە زمانی کوردیدا بە مانای "سپاردە siparde" دێ. کە "سفارة" ی عەرەبی وەرگیردراوی: سپارە sipare ی کوردییە.

**Sipî** سپی، لە ئاڤێستاییدا سپێتە sipête و لە پەهلەویدا سپێت spêt ە و، لە فارسیدا بووە بە سفید sefîd. دیارە، دەنگی پ p کۆنترە لە دەنگی ف f.

**Sipon** سپۆن/ ئەسپۆن espon (← سابوون sabûn).

**Sirêsh** سرێش/ چرێش chirêsh ئەسریلك esrîlk جۆرێکە لە کەتیرە. سر sir وچر chir کورتکراوەی ئەسر esrە، کە مانای فرمێسك firmêsk ە و، شلاییەکە لە چاو دێتە دەرێ. ـلك ilk– لە وشەی ئەسریلك esr-îlk دا، بە مانای لکاندن likandin (پێوەنووساندن pêwenûsandin) ەوە دێ. وشەی سرێش بەشێوەی "سریش" کەوتووەتە فارسییەوە.

**Sirinc** سرنج، جۆرە ئامێرێکە کە بەوە دەرمانی شلاوك دەکرێتە رەگ و گیانی نەخۆشەوە. لە وشەی فەڕەنسی seringue هاتووە کە بە ئینگلیزی syringe ە و، وشەی شرینقە shirînqe هەر لەوەوە هاتووە.

**Sirke** سرکە، گوشراوی ترێیە، پاش ترشبوونی. سرکە sirke لە سوورکە sûrke/ سۆرکە sorke ەوە هاتووە، کە لە رەنگی سۆری ترێکەوە هاتووە، کە جاران، هەر ترێی سۆر، دەگوشرا بۆ سرکە. سرکە sirke کەوتووەتە زاری فارسی و ترکییەوە و، هەر بەو مانایە.

**Sirt** سرت، گەلێك مانای هەیە یەكێك لەوانە: رەك و سەخت **rek û sext**. كە بۆ وشەی سەخت **sext** لە كوردیدا سخت **sixt** یش هەیە. سرت **sirt** و سخت **sixt** یەك بنەڕەتیان هەیە. وشەی **sirt** بە مانای توندوتیژ و رەك كەوتووەتە زاری تركییەوە.

**Sitran** ستران، لە چراندن **chirandin** ەوە هاتووە كە جۆرە دەربڕینێكی دەنگە. فارس ئەم وشەیەی لە كوردییەوە وەگرتووە و، بە شێوەی ترانە **terane** > سترانـ(ـە) **sitran(e)** بەكاریدەبا. هەروەها لە عەرەبیدا بووە بە "ترنیمە" (لاواندنەوە).

**Sivê** سڤێ/ **sibê** سبێ، لە ← سپی **sipî** ەوە هاتووە، سپێتی بەری بەیان كە بە فارسی (سفید **sefîde** ) یە. وشەی "صباح" ی عەرەبی لە مەوە هاتووە.

**Siwir** سور (← ئەستوور **estûr**).

**Sîvîl** سیڤیل. وشەكە **civil** ی فەرەنسییە كە لە **civilis** ی لاتینییەوە وەرگیراوە، كە بە مانای هاوولاتانە **hawwilatane** و شارستانانە **sharistanane** و نالەشكری **naleshkirî** دێ. لە ئەڵمانیدا بە شێوەی **zivil** و لە ئینگلیزیدا بە شێوەی **civil** دەنووسرێ. لە مەشەوە وشەی **civilisation** كە مانای شارستانێتی یە وەرگیراوە. بە جلك وبەرگی نالەشكری، دەگوترێ جلكی سڤیل.

**Siyare** سیارە، وشەیەكی هاومانای ← سوارە **sware** یە. وشەی سَیّارة **seyare** ی عەرەبی، لەم سیارە

یەوە هاتووە (← سەفەر sefer).

**Sînmel** سینمەل (نێویکی دیکەیە بۆ← سیمرخ sîmirx).

**Sîmirx** سیمرخ (← سان san).

**Sîx** سیخ (← چووك chûk)

**Sol** سۆل (پێلاوی سووکەڵە، دەمپێ dempê). وشەیەکی کۆنی هیندۆئەوروپاییە. لە لاتینیدا solum، بە بنك bink، یان، بە ژێر jêr ی شتێك دەبێژن. کە وشەی sous (ژێر jêr)ی فەرەنسی لەمەوە هاتووە. وشەی solum بە شێوەی sohle کەوتووەتە زمانی ئەڵمانییەوە و، بە پارچە کاڵا، یان، ئەو شتانە دەگوترێ، کە دەخرێنە نێو پێڵاوەوە و، پێیدەگوترێ: Fußsohle واتە: سۆلی پێ.

**Sol** سۆل، چەند مانایەکی هەیە یەکێك لەوانە: خوێ xwê یە (سەرنجی وشەی نانوسۆل nanûsol واتە: نان و خوێ بدە). nan û xwê سۆل sol وشەیەکی کۆنی هیندۆئەوروپاییە. سەرنجی وشەی salt ی ئینگلیزی و salz ی ئەڵمانی و sel ی فەرەنسی بدرێ. وشەی سۆر sor/ سوێر swêr یش، پێوەندیی بەمەوە هەیە. هەروەها وشەی شۆر shor (کە مانای سوێر swêr)ە.

**Soma** سۆما، لە زمانی کوردیدا بە رۆناکی دەگوترێ. بۆ وێنە: دەگوترێ: سۆمای چاوی چوو (یان: نەما) واتە: رۆناکیی چاوی نەما، ئەم وشەیە لە زمانی سانسکریتدا هەر سۆما soma یە.وشەی sonne (←خۆر xor ← رۆژ roj) لە زمانی ئەڵمانیدا کە وەك "زۆنە" دەردەبردرێ، لەگەڵ وشەی sun (خۆر) ی ئینگلیزی و soleil

(خۆر) ی فەڕەنسی پێوەندییەکی ڕەگییان هەیە بە سۆما soma وە. وتووێژێکی زۆریش هەیە لە سەر ئەوەی کە بنەڕەتی وشەی "شمس" (خۆر)ی عەرەبی و "شەماش שמש" (خۆر) ی عیبری و، هەروەها وشەی "شەممە" shemme ی کوردی و "سبت" ی عەرەبی و "شەبەت" ی عیبری و Samstag ی ئەڵمانی کە بە زمانی ئەڵمانیی کۆن Sambaztac ە، هەر "سۆما" بێ، نەك ڕەگێکی زمانە سامییەکان.

**Sor** سۆر/ سوور **sûr** (ڕەنگ) لە پەهلەویدا سوخر **suxr** ە و، لە فارسیدا بووە بە سرخ **sorx**.

**Sor** سۆر/ سوێر **swêr** (← سۆل **sol**).

**Splît** سپلیت. وشەکە **split** ئینگلیزییە کە مانای دابەشکەر و جیاکەرەوە دەگەیەنێ. لە ئەلمانیدا وشەی **Spalten** هەیە کە بە مانای جیاکردنەوە **ciyakirdinewe** و درزتێخستن **dirztêxistin** دێ.

**Stûr** ستوور (← ئەستوور **estûr**).

**Supas** سوپاس/ سپاس **sipas**، بە پەهلەوی **spas** و، بە رووسی **спасйбо**.

**Sûran** سووران، لە سوور **sûr** ەوە هاتووە، سەرنجی وشەی: خەتەنە سووران **xetene-sûran**، چوارشەممە سوورێ **chwarsheme sûrê**، سووڕنا **sûřna** (کە بووە بە زووڕنا **zûřna**). سوور **sûr** کە لە پەهلەویشدا هەر سوور **sûr** ە، مانای گۆڤەند و هەڵپەرکێ و بانگێشتن بۆ ← زەماوەند **zemawend** و، شایی **shayî**. وشەی سووڕدان **sûřdan** یش هەر لەم سوور **sûr** وە هاتووە کە بە مانای هەڵپەرکێیە لە شاییدا.

# S س

**Sût** سووت، واتە: کەڵك **kel’ik** کە سوود **sûd** یشی پێدەگوترێ. **Sût** لە پەهلەویشدا هەر سووت **sût** ە.

**Sûtandin** سووتاندن/ شەوتاندن **shewtandin** (← شەم **shem**).

**Swal’et** سواڵەت > سو **su** + ـاڵ **al’** + ـەت **et**. سو **sw** لە سووتاندن **sûtandin** (سۆرکردنەوە بە ئاگر) ەوە هاتووە. ـ ئاڵ **al’** ـ وێنەیەکی دیکەی ئار **ar** (← ئاگر **agir**)ە. ت **t** کورتەی تین **tîn**ە واتە: ← هێز **hêz** و ← تاو **taw**. سواڵەت **swal’et** ئەو شتەیە کە بە تینی ئاگر سۆرکراوەتەوە. سواڵەت **swal’et** لە کڵ **kil’** دا سۆردەکرێتەوە.**kil’** کە لە کڕ **kiř** > گڕ **giř** ەوە هاتووە، شوێنی سۆرکردنەوەی سواڵەتە.

**Swan** سوان، لاچوونی شوێنەواری شتێك، لەسەر رووی شتێکی دیکە. ئەم وشەیە لە ئاڤێستادا، بە شێوەی **sane** دێ. سەرنجی وشەی ئاڤێستایی **fra-sane** بدرێ، کە بەمانای تەفر و تونەکردن **tefir û tunekirdin** ە، کە وشەی تونە **tune** (نییە **tune**) ش هەر لە سانە **sane** ەوە هاتووە، بە گۆڕینی دەنگی س **s** بۆ ت **t**. (سەرنجی دەنگی س **s** و ت **t** لە دوو وشەی هاومانا، نەتەوە **netewe** و نەسەوە **nesewe** بدە). ئەم وشەیە، لە فارسیدا بووە بە سایيدە **sayide** واتە: سوواو **swaw**.

**Swar** سوار/ سواربوون **swarbûn**. سوار **swar**/سڤار **svar**، کە لە عەرەبیدا بووە بە فارس، لە بنەڕەتدا وشەکە پارس **pars** بووە و، بە گۆڕینی دەنگی پ **p** بە ف **f**، بووە بە فارس (وەك

چۆن پۆڵات pol’at بووە بە فولاذ و پیرۆز pîroz بووە بە فیروز). پارس pars نێوی نێوچەیەکە لە کرماشان، کە کاتی خۆی هەسپە کێوی زۆری لێبووە و، ئاشوورییەکان، نێوی ئەو نێوچەیان، بە پارس pars بردووە و، لە زمانی عەرەبیدا بووە بە فارس. ئەم وشەی فارس fars،ە بەهۆی جێگۆڕکێی شوێنی دەنگەکانییەوە بووە بە سفار sfar و سوار swar، کە وشەی سەفەر sefer یش، هەر لەمەوە هاتووە. سوار swar بە پەهلەوی ئەسبار esbar ە، وادیارە ئەسبار esbar پێوەندیی بە ئەسپ esp ەوە هەبێ.

**Swax** سواخ/ سواخکاری /swaxkarî سواخدان swaxdan واتە: مشتومالکردنی دیوارێك بە ← قوڕ quř یان، بە ← گەچ gech. سواخ swax لە: سوو sû + ئاخ ax ەوە هاتووە. سوو sû لە سوون sûn (←swan سوان)ەوە وەرگیراوە، سوون، ئەوەیە شتێك بە شتێکی دیکەدا بهێنێت، واتە: بیسوویتەوە (سەرنجی وشەی هەڵسون hel’sûn، تێهەڵسوون têhel’sûn بدە) ← ئاخ ax مانای ← گڵ gil ە. واتە: گڵ، یان ← قوڕ quř (← هەری herî) تێهەلسوون، وشەی سواخ swax کەوتووەتە ترکییەوە.

**Swîch** سویچ، کلیلی کردنەوەی تەوژمی ← کارڤا kariva یان، کلیلی داگیرساندنی ئۆتۆموبیل. وشەکە switch ی ئینگلیزییە.

# SH ش

**Sha** شا، لە واژەی ← ئێرانیی کۆن خشایەثیا xshayeөya وە هاتووە، کە وشەی شێخ shêx یش هەر لەمەوە هاتووە.

**Shagird** شاگرد/شاگرت .shagirt ئەم وشەیە لە پازەندا ئەشاگەرد eshagerd ە.

**Shandin** شاندن، وشەیکی کۆنی هیندۆئەوروپاییە، بەمانای ناردن nardin (هەناردن henardin). سەرنجی وشەی ئینگلیزی to send و وشەی ئەڵمانی senden بدرێ کە هەردووکیان بە مانای شاندن shandin ن. دەنگی س s و ش sh جێییەکدیان گرتووەتەوە (وەك سووتاندن sûtandin = شەوتاندن shewtandin، بەرسیلە bersîle > بەرشیلە bershîle > بەرشیرە bershîre).

**Shanîk** شانیك، وشەیەکە بۆ بەڵگە (دلیل) بەکاردەبرێ < شان shan + یك ik. شان shan وشەیەکی دیکەیە بۆ نیشان/نیشانە nîshan/nîshane، شانیك shanîk کورتکراوە و گچکەکراوەی نیشان nîshan ە.

**Shano** شانۆ، لە سەردەمی کۆندا، شانۆ shano، بەو سەکۆیە دەگوترا کە ← کۆسەوازی kosewazî وازی (یاری) ی ← کۆسە wazî (yarî)y kose ی لەسەر دەکرا، لە سەردەمی نوێدا، بۆ ئەو سەکۆیە بەکاردەبرێ، کە ئەکتەرەکان، روڵی تێدا دەنوێنن و، بە ئەڵمانی پێیدەگوترێ Theaterbühne. شانۆ shano < شا sha + نۆ no. شا sha کورتەی نیشانە nîshane (← شانیك shanîk). نۆ no کورتەی نواندن nwandin ە. واتە: شانۆ shano نیشانە

نواندن nîshane nwandin دەگەیەنیٚ، واتە: یارییەك، رۆلێك، كە لەبەردەم خەڵكدا بێتە پێشاندان و نواندن. وشەی شانۆ shano، بە گۆڕینی دەنگی ش sh بۆ س s بووە بە سانۆ sano و سانۆ sano ش بووە بە سانە sane، ئەوجا بە سەهنە sehne و، پاشان بە صحنە śaĥna كە لە عەرەبی و فارسیدا بەكاردەبریٚ. گۆڕانی دەنگی ش sh بە س s لە زمانی كوردی و عەرەبیشدا باوە، وەك: وشەی سووتان sûtan لە كوردیی ناڤین و شەوتان shewtan لە كوردیی باكووردا. گۆڕینی وشەی بەرشیلە bershîle (واتە: تریٚ بەر لەوەی شیرە (شیرینی) تێبگەڕیٚ) بە بەرسیلە bersîle. هەروەها وشەی ← شەرواڵ sherwal' ی كوردی كە لە عەرەبیدا بووە بە سروال sirwal. شایانی باسە وشەی "صحنە" (شانۆ) كە فارسەكان بەكاریدەهێنن و، لە شانۆ (سانۆ) وە وەگێراوە، رەگەكەی لە رەگی وشەی "صَحن" ی عەرەبی كە بە مانای ← لەگەن legen و حەوشە ĥewshe و گەلێك شتی دی دیٚ، جیاوازە. گۆڕانی سانە sane بە صحنە śaĥna بەهۆی جێگرتنی بزوێنی (ڤاول) ی كورتی ئە e و "ح ĥ" پێكەوە لە جیاتی بزوێنی درێژ ئا a یە. ئەمەش لە زمانی كوردیدا باوە. سەرنجی وشەی تاڵ tal' بدریٚ كە لە كوردیی باكووردا (بەتایبەتی شێوەزاری خەڵكی رۆژاوای كوردستان) بووە بە تەحل teĥil.

Shasî شاسی، بەو چوارچێوە ئاسنینە دەگوتریٚ كە بە هۆی دوو هاسنی براوە و چەند هاسنێكی دیكەوە، كە ئەم دوو هاسنە دەبەستن بە یەكەوە، هەموو لەشی ئۆتۆمبێلەكە دەكەوێتە سەریان. وشەی شاسی فەڕەنسییە châssis.

**Shayer** شایەر، کەسێکە کە لە شایی shayî و ← زەماوند zemawend و ← گۆڤەند govend دا بەسەر خەڵکدا هەڵدەدا و بە وشەی کێش و لەنگەردار، پەسنیان دەدا بۆ ئەوەی پارەی بدەنێ. وشەی شایەر shayer لە گەڵ وشەی "شاعر" ی عەرەبی "هەستیار hestyar" یەك بنەچە و ڕەچەلەکیان نییە. وشەی "شاعر" ی عەرەبی نێوی کارا (أسم ألفاعل) ی کار (فعل) ی "شَعَرَ" یە. شاعر مانای مرۆڤی هەستیارە، بەڵام "شایەر" shayer ی کوردی، لە شایی یار shayî yar ەوە هاتووە، واتە: یاری شایی yarî shayî = هاودەمی شایی hawdemî shayî. شایی shayî لە شاتی shatî پەهلەوییەوە هاتووە، واتە: بەزم و خۆشی.

**Shayî** شایی (← شایەر shayer).

**Shefeq** شەفەق/ شەبەق shebeq. سەرەتای ڕۆناکیی بەیانیان، وشەکە لە شەڤەك shevek و شەوەك shewek ەوە هاتووە. شەڤ shev/ شەو shew لێرەدا بە مانای شەو shew (لیْلْ) نایەت، بەلکو ، بە مانای ← شەم shem دێ، واتە: ڕۆناکیی مۆمێك. (← مۆم mom، ←خۆر xor، ← هەتاو hetaw). (← سۆما soma).

**Sheftûl/r** شەفتوول/ر، واتە: شتێکی خوار بڕاو، بەتایبەتی بۆ ڕێ و بان. شەفتوول/ر sheftûl/r لە بنەڕەتدا چەفت (چەوت) توور cheft (chewt) tûr ە، کە توور tûr وێنەیەکی دیکەی توول tûl و شوول shûl ە. کە توول tûl و شوول shûl، بە مانای لکێکی بارێك دێن. کەواتە: شەفتوول (ر) sheftûl(r)، لە بنەڕەتدا

چەوت توول **chewt tûl** ە، لە زمانی ئەڵمانیدا بە شتێك كە خوار بێ دەگوترێ: **schief**، و بە چاوی خێل **chawî xêl** یش دەگوترێ **Schiel**.

**Sheket** شەكەت/ ماندوویی **mandûyî**، ← پرزە **pirze** لەبەر بڕاو **pirze leber biřaw**، لە ئەژنۆ كەوتو **le ejno kewtû**. شەكەت **sheket** < شەك **shek** + كەت **ket**. شەك **shek** لە كوردیدا بە مانای چۆك **chok** (← ئەژنۆ **ejno**) دێ، كە شەك **shek**، خۆی، وێنەیەكی دیكەی چۆك **chok** ە، كەت **ket**، لە كەوتن **kewtin** ەوە هاتووە. شەكەت بوون **sheketbûn**مانای ئەژنۆ لە كاركەوتن **ejno le karkewtin**.

**Shekir** شەكر، لە بنەڕەتدا وشەیەكی سانسكریتییە، كە: سەركەرا **serkera** یە. لە پەهلەویدا بووە بە شەكەر **sheker** و لە زمانی ئینگلیزیدا بووە بە **shuger** و لە فەڕەنسیدا **sucre** و لە ئەڵمانیدا **Zucker** و بە رووسی **cάxap** شەكر وەك سكّر چووەتە عەرەبییەوە و، وەك شِكَرْ **shiker** چووەتە فارسی و وەك **şeker** چووەتە تركییەوە.

**Shelaq** شەلاق، لە شەلتاق **sheltaq**/ شەلتاك **sheltak**/ شەلتاخ **sheltax**، كە شەڵت **shelt**/ شەڵتە **shelte** داری لۆكە شیكردنەوەیە و، بووە بە نێوێك بۆ قامچی **qamchî**. وشەی "جلطة"ی عەرەبی لەمەوە هاتووە، وەك چۆن باڵتە **bal’te**

(تەو/ڤر tew/vir) لە عەرەبیدا بووە بە (بلطة).

**Shelatî** شەلاتی (← شەرلەتەن sherleten/ شەرلەتان sherletan).

**Shelêt** شەلێت/ shelîte شەلیتە، بە بێشەرم bêsherim و دەمەوەر demewer دەگوترێ. شەل shel لە زمانی کوردیدا هەر بە مانای ئەوە نایەت کە کەسێك پێی کەل بێ (کەل kel و shel shel یەك بنچینەیان هەیە) شەلبە مانای رووت rût یش دێ. شەلان shelan و شەلین shelîn بەمانای رووتبوونەوە rûtbûnewe ش دێن، واتە: جلك لەبەرخۆداکرن cilik leber xwedakirin. وشەی "سلیط" ی عەرەبی لەم شەلێت shelêt ەوە هاتووە.

**Shem** شەم، واتە: مۆم mom. لە بنەڕەتدا لە وشەی سانسکریتی ← سۆما soma وە هاتووە کە مانای ← تیشك tîshk ەو، هەر بەو شێوەیەش لە کوردیدا بەکاردەبرێ (سۆمای چاوی چوو، واتە: تیشکی چاوی نەما). هەر لەم وشەیەشەوە، وشەی شمع و شمس ی عەرەبی دروستبوون، ئەگەرچی بیرێکی دیکەش هەیە، کە وشەی شمس دەباتەوە سەر بنەڕەتێکی سامی، بەڵام بەڵگەکەی لاوازە. لە وشەی سۆما soma وە وشەی sun (← رۆژ roj/← هەتاو hetaw) ی ئینگلیزی و sonne ی ئەڵمانی درستبوون. تەنانەت وشەی چاو/ڤ chaw/v کە لە هێندەك شێوەزاری کوردیدا چەم chem (شەم shem)ە، لەم بنەڕەتەوەیە کە چاو/ڤ بە مانای رۆناکی لەش دێ. هەروەها وشەی چۆم chom (چۆمی ئاو/ڤ chomî aw/v) و چاوە chawe (سەرچاوە serchawe) بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە، چۆنکە

کورد، ئاو بە نیشانەی ڕۆناکی دادەنێن (← ئاوێنە **awêne**). لە وشەی شەم **shem**ەوە مۆم **mom** دروستبووە. جا لەبەر ئەوەی مۆم **mom** ← چەور **chewir** و خڕ **xiř** و لووس **lûs** ە، وشەی شەمارە **shemare** دروستبووە، کە بە مانای خزین **xizîn** و خلیسکان **xilîsksn** ە لە کوردیدا. هەروەها وشەی شەمال **shemal** (بە ل **l** ی لاواز)، لە کوردیدا، کە بە مانای مۆم **mom** و ڕۆناکیی مۆمیش دێ، هەر لەم سەرچاوەوەیە. بێجگە لەوەش وشەی سووتاندن **sûtandin**/ شەوتاندن **shewtandin** کە ڕەگەکەی سوو **sû**/ شەو **shew** ە، هەر لەم بنچینەیەوە دێ.

**Shemal** شەمال ← مۆم **mom** (← شەم **shem**).

**Shemare** شەمارە (← شەم **shem**)

**Shende** شەندە، وێنەیەکی دیکەی چەندە **chende** یە، بە گۆڕانی دەنگی ش **sh** بۆ چ **ch**. کورد دەبێژن "شەندە لە مەندە کەمتر نینە" واتە: چەندە **chende** لە **le** + م **mi** + ـەندە **ende** (هەندە **hende**) ـ مقدار، بڕ **biř** ـ ە کەمتر **kemtir** نینە.

**Shengul** شەنگول، لە سەمەنگول **semengul** ەوە هاتووە، کە دەنگی س **s** بووە بە ش **sh**. شەنگول **shengul** ، بە کەسێك دەگوترێ کە کەمێك بشەلێ. وشەیەکی دیکەش بۆ شەنگول لە زمانی کوردیدا هەیە، ئەوەش شیرین شەل **shel shîrîn** ە. وشەی شەل **shel** و کەل **kel** یش پێوەندییان بە شەنگول **shengul** ەوە هەیە. شەنکەل **shenkel** > شەنکۆل **shenkol** > شەنگۆل **shengol**. وشەی

# SH ش

شەنگۆل shengol بە شێوەی şengül کەوتووەتە زاری ترکییەوە و، وەك نێوی ژنان بەکاردەبرێ.

Shepol شەپۆل، (موج) > شە she + پۆل pol. شە she (شا sha) مانای ← گەورە gewre، بەهێز behêz، سەرەکی serekî. پۆل pol و پێل pêl (موج)ە. شەپۆل shepol/ شاپێل shapêl واتە: پێلێکی بەهێز pêlêkî behêz.

Sheq شەق، وێنەیەکی دیکەی شەپ shep و تەپ tep و تەق teq ە کە پێوەندییان بە دەنگەکەیەوە هەیە.

Sheqam شەقام (← شەقاو sheqaw).

Sheqaw شەقاو (← هەنگاو/ڤ hengaw/v) > شەق sheq + کاو kaw. کاو kaw و کات kat و گاڤ gav و ← قاف qaf هەموویان یەك وشەن بە گۆڕینی دەنگەکانی و w و ت t و ڤ v و ف f و ك k و گ g. شەقاو sheqaw واتە: شەق هەڵدان، لەگەڵ کات.

Sheř شەڕ (← Geřnas گەڕناس).

Sherjîkirin شەرژیکرن/ سەربڕین serbirîn (لە کوردیی باکووردا) وشەکە لە سەرجێکرن sercêkirin ەوە هاتووە، واتە: سەر لە لەش جیاکردنەوە. دەنگی ش sh جێی دەنگی س s ی گرتووەتەوە.

Sherim شەرم، بە پەهلەوی شەرم sherim ە.وشەکە وشەیەکی هیندۆئەوروپاییی کۆنە. بە ئینگلیزی shame و بە ئەڵمانی scham (شەرم) و schande (شەرمەزاری) و schämen (شەرمکردن).

**Shеřleten** شەڕلەتەن (شەڕلەتان sheřletan) واتە: هەبوونی شەڕ لە نێو تەن (جسم) دا. شەڕ sheř ی کوردی لە "شَرّ" ی عەرەبییەوە نەهاتووە. شَرّ ، لە عەرەبیدا، بەمانی خراپەکاری و دژی چاکەخوازی (خێر)ە. شەڕ sheř ی کوردیی وێنەیەکی دیکەی ← گەڕ geř ە کە گەڕ geř مانای زۆرانبازی zoranbazî و جەنگ ceng ە. (شەڕ و گەڕ sheř û geř) ← گەڕناس geřnas پاڵەوان palewanە. لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی شارلاتان sharlatan هەیە وەك زمانی فەڕەنسی charlatan کە هەر بەم مانا کوردییە دێن، بەڵام بنەچە و ڕەچەلەکی ئەم دوو وشەیە، یەك شت نین. لەکاتێکدا وشەی "شەلاتی shelatî" بە مانای چەورە chewre یە و لە "شەڕلەتی sheř-le-tî" یەوە هاتووە. تی tî، بەمانای نێوەوەی شت دێ. تێکردن têkirdin واتە: کردنە نێو kirdine nêw، تێخستن têxistin، تێبردن têbirdin. تێ tê دیوی نیوەوەی شت. سەرچاوی وشەی ئەڵمانی و فەرەنسییەکە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی ئیتالیایی ciarlatano کە پێوەندیی بە خەڵکی شاری ئیتالیایی cerreto وە هەیە، کە ئەمانە کالاًفرۆش بوون و، بۆ فرۆشتنی کالاکانیان شیڕاندوویانە و، سەری خەڵکیان گێژ کردەوە و خەڵك بێزاربوون لێیان.

**Sherwal** شەروال/ شاروالْ sharwal. بە پانتۆڵی پیاوانە، یان بە جۆرە دەرپێیەکی ژنانە دەگوترێ شاروال/شەروال. شار shar لە وشەی سانسکریتی chîre وە دێ کە ئێستە هیندییەکان بە جۆرە سەرپێچێك دەڵێن، کە پیاوان بە کاریدێنن، یان، ژنان لەشی خۆیانی پێدا دەپۆشن و لە شێوەزاری بادینانیدا بووە بە

شەل shel (شەل و شەپك shel
û shepk). والْ wal’ لە والا
wal’aوە دێ كە ← قوماش
qumash ە. وشەی شەروالْ لە
عەرەبیدا بووە بە سروال (←
شانۆ shano) و، لە فارسیدا
بووە بە شلوار shelwar.

Shew/v شەو/ڤ، بە پەهلەوی شەپ
shep ە و، لە فارسیدا بووە بە
شب sheb.

Shewekî شەوەكی، واتە: "وەك هی
شەو wek hî shew". دەگوترێ
ئاوی شەوەكی، واتە: ئاوێك كە
شەو لە گۆزەدا هەڵگیرابێ و
مابێتەوە. بە پەهلەوی
shepîkە و لە فارسیدا بووە بە
"شبی" shebî.

Shewtandin شەوتاندن/ سووتاندن
sûtandin (← شەم shem).

Sheytan شەیتان، ئەم وشەیە لە
كوردی و عەرەبی و فارسی و
تركی و ئۆردودا بەكاردەبرێ.
بەڵام دوو جۆرە رەگی جیاوازیی
هەیە. رەگی یەكەمیان
وشەیەكی سامییە و لە
عیبرییەوە وەرگیراوە و، لە
لاتینی و یۆنانیشدا بەكاربراوە
و، لە وەشەوە كەوتووەتە زمانە
ئەوروپاییەكان و لە ئەڵمانی و
ئینگلیزیدا بە شێوەی satan
بەكاردەبرێ كە لە وشەی عیبری
ساطان שׂטן ەوە هاتووە،
بەمانای دژبەر dijber، بەڵام
بە لێكۆڵینەوەی خۆم بۆم
دەركەوتووە كە كورد لەسەر
دەمی پێش ئیسلامەتیدا، وشەی
"شەیتان" ی بە شێوەیەكی دی
و لە رەگێكی دیكەوە
بەكاربردووە، واتە: لە شا sha و
تەن ten ەوە، كە ماناكەی
پێچەوانەی "شەیتان" ی
سامییە. شا sha لە كوردیدا
بەمانای خوا xuwa و فریشتە

firîshte ش بەکاردەبرێ. تەن ten مانای لەش lesh و گیان giyan ە. کورد دەبێژن: هەموو گیانم دەیەشێ واتە: "هەموو لەشم دێشێ". کەواتە: "شاتەن" مانای بوونەوەرێکە کە گیانی وەك فریشتە وایە، واتە: "فریشتە گیان"ە. کوردە ئێزدییەکان، ئەم وشەیە بەکار ناهێنن، چۆنکە مانا کوردییەکەی نازانن. موسلمانەکانیش، لە نەزانینەوە، دێن وشەی "شەیتان"ی جوو و دیان و موسلمان کە وشەیەکی عیبرییە، لەگەڵ ئەم وشە کوردییە"شاتەن shaten" دەکەنە یەك، کە یەك شت نین. ئەوەتا خاوەنی پەرتۆکی "شاهنامە حقیقت" کە لە سەرەتای سەتەی بیستەمدا بە "قطب کل"ی کاکەییەکان (یارسانییەکان) دادەنرا، دەبێژێ: گۆرانەکان هێندە ساویلکە و نەزانن وشەی "شاتەن" لەگەل وشەی "شەیتان" دەکەن بە یەك و، لە یەکیان جیاناکەنەوە. لێرەدا دەمەوێ بێژم هەژاری موکریانی لە فەرهەنگەکەیدا کە زۆربەی زۆری لە فەرهەنگی کوردستان ی گێوی موکریانییەوە وەرگیراوە بەرامبەر وشەی شەیتان دەنووسێ: مەلەك تاوس، بنەمای خراپە و هەروەها بەرامبەر شەیتان پەرست sheytanperst دەنووسێ: یەزیدی، ئێزدی، داسنی. (فەرهەنگی "هەنبانە بۆرینە" ل 495، تهران 1376).

Shifte شفتە، لە شەفتاندن sheftandin (شەوتاندن shewtandin) واتە: سووتاندن sûtandin ەوە دێ. چۆنکە

گۆشتە کوتراوەکە دەخرێتە نێو تاوە و سەر ئاگر و بە جۆرێك دەسووتێنرێ.

**Shikar** شکار، مانای نێچیر **nêchîr** ە. بە پەهلەوی هەر شکار **shikar**ە. ئەم وشەیە لە کوردیدا، لەگەڵ وشەی راو **raw** بەکاردەبرێ و دەگوترێ: راوشکار **rawshikar** واتە: راوی نێچیر **rawî nêchîr**.

**Shikence** شکەنجە/ ئازاردان **azardan**، لە فارسیدا بووە بە أشکنجە **êshkênce** و ترکیش لە فارسییەوە وەریگرتووە و، بە **işkence** دەینووسن. لە پەهلەویدا شکێنجەك **shikênce**ە، کە پێوەندیی بە شکان **shikan** ەوە هەیە.

**Shirînqe** شرینقە (← سرنج **sirinc**).

**Shiv** شڤ (شیپ **shîp**).

**Shîp** شیپ (← لاشیپان **lashîpan**).

**Shîr** شیر، بە پەهلەوی: **shîr** و بە فارسیش هەر شیر **shîr** ە.

**Shîřandin** شیڕاندن، شیڕاندن **shîrandin** و شریخە **shirîxe** قیڕاندن **qîřandin** و قیرە **qîře** چڕاندن **chiřandin** هەموویان هەر یەك رگەزیان هەیە، کە دەنگی (ش **sh** و ق **q** و چ **ch**) جێییەکیان گرتووە و، چەند وشەیەکیان لێپەیدابووە بە چەند مانایەکی جیاواز، بەڵام نێزیك بە یەك. چڕاندن **chiřandin** بۆ ← گۆرانی گۆتن **goranî gotin** بەکاردێ. کە وشەی ← ستران **sitran** لەمەوە هاتووە. هەروەها ترانە **terane** ی فارسی و "ترنيمة" ی عەرەبی (گۆرانی **goranî**) لە مەوە وەرگیراوە. لە ئەڵمانیشدا وشەی **schreien** بۆ قیژاندن **qîjandin** و شیڕاندن **shîřandin** بەکاردەبرێ. هەر

لە زمانی کوردیدا، وشەی شریخە shrîxe/ شریقە shrîqe ش هەیە (بۆ دەنگی هەور hewr) و شریقە shirîqe و تریقە trîqe (بۆ پێکەنین) هاوڕەگی یەکن.

Shîrînî شیرینی/ شیرانی shîranî، لە شیر ـ ە ـ مەنی shîr-e-menî یەوە هاتووە، واتە: تایبەتکاری شیری تێدایە کە شیرینە.

Shîshe شیشە/ شووشە shûshe. بە پەهلەوی شیشەك shîshek ە و، هەر بە شێوەی شیشە shîshe کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە.

Shîw شیو. بە پەهلەوی شیپ shîp ە.

Shor شۆر (← سۆل sol، ← شۆرش shorish).

Shor شۆر، بە مانای "قسە qise" دێ لە هێندەك شێوەزاری کوردیی باکووردا. دەبێژن: شۆرێ خۆە کر shorê xwe kir، واتە: قسەی خۆی کرد qisey xoy kird. وشەی شۆر shor، لە وشەی کوردیی کرمانجکی (کرتکی، زازاکی) ڤاژۆر vajor ەوە دێ، کە بە مانای قسە qiseye یە و بنەڕەتێکی ئاڤێستایی هەیە (← وشە vajor (wishe بووە بە ڤاشۆر vashor بە گۆڕینی دەنگی ژ j بە ش sh، ئەوجا ڤە ve ی سەرەتاش قرتاوە و شۆر shor ماوەتەوە. بێجگە لەمەش، واژە vaje ی فارسیش هەر لە vajor ەوە وەگیراوە.

Shorish شۆرش > شۆر shor + پاشگری ش sh. شۆر shor لە زمانی کوردیدا، بە مانای "تێژ و توند" و "هەڵچوون" و "جۆشخواردن" بەکاردێ، هەروەها بە مانای "سۆر" sor/ سوێر swêr یش دێ. لە زمانی کوردیدا وشەی "شۆرە shore" هەیە کە ← کەرەسەیەکی زووتەقە (زوو دەتەقێ) و لەسەر

دەمی کۆندا بۆ دروستکردنی بارووت barût بەکاردەهێنرا لە کوردستان.دیارە "شۆرە" لە "شۆر" ەوە وەرگیراە، وەك چۆن "بۆرە bore" لە "بۆر bor" ەوە (وەك نێو لە هەڤالنێوەوە) وەرگیراوە. ئەوجا دەنگی ش sh بووە بە س s، وەك ئەوەی دەنگی ش sh لە وشەی شەروال sherwal ی کوردیدا، کراوە بە س s، کاتێك وشەی شەرواڵ sherwal ی کوردی خراوەتە نێو زمانی عەرەبییەوە و بووە بە سروال sirwal. بەم جۆرە وشەی شۆرە shore ی کوردی بە شێوەی سَوْرَة sawrah هاتووەتە نێو زمانی عەرەبییەوە. دوایی وشەی سَوْرَة sawrah بووە "ثوْرَة thawrah" کە ئێستە هەردوو وشەکە بە یەك مانا بەکاردێن. شایانی گوتنە کە، وشەی "الثورة" Al-thawrah ی عەرەبی لە وشەی "ثور" thawr ی ئاشوورییەوە نەهاتووە کە مانای گا/ڤ ga/v ە، بە تایبەتی "لە کاتی هاجبوون و هەڵچووندا" وەك موعتەسەم سالەیی لە گوڤاری "رەنگین rengîn" (ژ 114ی تەمووزی 1998) دا نووسیوێتی. (بۆ پتر زانیاری لەم بارەیەوە سەیری سەمیناری "کورد و شۆرش kurd û shorish" بکرێ لە پەرتۆکی: جەمال نەبەز: ناسنامە و کێشەی ناسیۆنالی کورد لە چەند سەمینار و کۆڕێکی زانستیدا. بلاوکراوەی "کوردنامە" لەندەن 2002، ل 231-259.

**Shos(t)e** شۆستە، لە وشەی فەڕەنسی chaussée ەوە هاتووە.

**Shop** شۆپ، واتە: جێی پێ لەسەر زەوی cêy pê le ser zewî <

شۆ **sho** + پ **p**. < شۆن **shon** (شوێن **shwên**) واتە: شۆن (شوێن) **shon/shwên** پێ **pê**. شۆن پێ **shon pê**.

**Shû** شوو، واتە: مێرد **mêrd**. شووکردن **shûkirdin**/ مێرکردن **mêrkirdin**. شوو **shû** لە وشەی ئاڤێستایی: خشاودرەکە **xshawdreke** ەوە هاتووە، کە لە فارسیدا بووە بە شوهر **shoher**.

**Shûshe** شووشە (← شیشە **shîshe**).

**Shûtî** شووتی/ شفتی **Shiftî**/ زەبەش **zebesh**. شفت **shift** وشەیەکی کۆنی کوردییە بۆ شیر **shîr**. لە زمانی کوردیدا بە شیردۆشین **shîrdoshîn** دەگوترێ شفت **shift**. سەرنجی وشەی **sweet** ی ئینگلیزی و **süß** ی ئەڵمانی بدرێ کە هاوڕەگەزی وشەی شووتی **shutî** کوردین. جۆرە ترێیەکی زۆر شیرین هەیە لە باکووری کوردستان نێوی سفتك **siftik** ە.

**Shw/v an** شوان/شڤان، بە پەهلەوی شوپان **shupan** ە. ئەم وشەیە، لە کارنامەکی ئەرتەخشێری پاپەکاندا هاتووە، کە لەوێدا، وشەی کورد **kurd**، بە شێوەی کورت **kurt** بەکارهێنراوە. وشەی شوان/شڤان، لە فارسیدا بووە بە چوپان **chupan** و لە ترکیشدا چۆبان **çoban**. پاپەك باوکی ئەردەشێرە کە دامەزرێنەری ئیمپراتۆرێتیی ساسانییە. کارنامەك بە پەهلەوی و لە سەتەی شەشەمی زایینی و زەمانی ئیمپراتۆرێتیی ساسانیدا نووسراوە. شوێنەواری هێندەك دەستکاری پێوەدیارە.

**Ta** تا/ هەتا **heta**، تاکو **taku**، هەتاکو **hetaku**، هەتاکوێ **hetakwê**. ئەم تا **ta** یە لە هەتاکو **hetaku** و تاکو **taku** دا لە "حتی" ی عەرەبییەوە نەهاتووە. **taku** تاکو کە لە پەهلەویدا تاك **tak**ە. ئەوەتا، لە زمانی کوردیدا تاکو **taku** هەیە بە مانای **he-taku** هەتاکو. لەبەر ئەوە وشەی هەتا **heta** (هەتاکو **hetaku** ی کوردی)، لە حتی ی عەرەبییەوە نەهاتووە. سەرنجی **till** ی ئینگلیزی بدە کە بە مانای تا **ta** دێ.

**Tal’** تاڵ، گەلێك مانای هەیە، یەکێکیان تاڵە موو **tal’e mû** ە، یان، داوە ← دەرزوو **dawe derzû** ە، کە دەچنرێ و دەکرێ بە جلك **cilk**. وشەی تاڵ بەم مانایە، کەوتووەتە زاری عەرەبییەوەو، لە وشەی طیلسان دا دیارە. طێلْ لە تاڵ **tal’** ەوە هاتووە، ← سان **san** نازنێوی مرۆڤی گەورە و خاوەن پایە و پلەیە وەك جافرسان **Cafirsan** لای هەورامییەکان. طیلسان ئەو جلکە (دشداشە)یە بوو، کە قازی و مەلا عەرەبەکان لە بەریاندەکرد واتە: جلکی مرۆڤی گەورە.

**Tal’** تاڵ/ تەحل **teĥl**، تەهل **tehl** بە پەهلەوی: تەخل **texl** و لە فارسیدا بووە بە تلخ **telx**.

**Talan** تالان، وشەیەکی مەغۆلییە، کە کەوتووەتە فارسی و هێندەك لە شێوەزارەکانی ترکمانەکانەوە، بەشێوەی تالانگ **talang**.

**Talweg** تالڤێگ. وشەیەکی ئەڵمانییە کە لە سنوورێکی نێونەتەوایەتیدا بەکاردەبرێ و

بریتییه له هێلی نێوەراستی رۆبارێك كه كەوتبێته نێوان دوو وڵاتەوه.

**Taman** تامان (← تانه **tane**).

**Tamar** تامار (← تانه **tane**).

**Tampon** تامپۆن (بەیەكدادانی دوو ئۆتۆمۆبێل). وشەیەكی ئەوروپاییه، به ئینگلیزی **tampon** و، به ئیتالیایی **tamponamento** و، به فەرەنسی **tamponement**ه.

**Tank** تانك (دەبابه) له ئینگلیزییەوه وەگیراوه **tank**.

**Tankî** تانكی، بەو سنووقه (← سنووق **sinûq**) دەگوترێ كه بەنزینی تێدەكرێ تا له ئۆتۆمۆبیلدا بەكار ببرێ، یان بەو ← عەمبار **ʿembar**ی ئاو دەگوترێ، كه ئاوی تێدا هەلدەگیرێ. ئەم وشەیه ئەوروپاییه. له ئەڵمانیدا وشەی **Tank** هەر بەو مانایه بەكاردەبرێ.

**Tane** تانه/ تانەلێدان **/tanelêdan/** تانەی سەرچاو **taney serchaw**. تان **tan** و تامان **taman** و تەیمان **teyman** له كوردیدا به لەكەی سەرچاو **lekey serchaw** و ← پەرژین **perjîn** یش دێ، واته: بەرهەڵستێك و لەمپەر **lemper** (حاجز) ێك كه بخرێته بەردەم شتێك، ← یان رەخنه **rexne** بگیرێ لێی، كه ئەو شته خەوشداره. وشەی تانووت **tanût** یش هەر لەمەوه دێ. تەنانەت وشەی تەم **tem** و تومان **tuman** (كه له تركیدا بووه به **duman**) و تامار **tamar** (تەماوی **temawî**) یش، هەر وێنەیەكی دیكەی تان **tan** و تامان **taman** ه. وشەی

**تانووت tanût** له تانەکوت tanekut ەوە دێ، واتە: تانەیەکی پێداکوتراوە. تانەکوت tanekut بووە بە تانووت tanût. هەروەها وشەی "طعن"ی عەرەبی کە بە مانای بریندارکردنی شتێکە بە ئامرازێکی تیژ، یان رەخنەگرتنی قانوونییە لە بریارێکی دادگە، لە بنەڕەتەوە لە تانە tane وە دێ.

**Tanût** تانووت (← تانە tane).

**Tapo** تاپۆ، لە وشەی یۆنانی τοπογραφικός تۆپۆگرافیگۆس ەوە هاتووە. کە بە ئەڵمانیش هەر تۆپۆگرافییە Topographie واتە: سنوورکێشانی پارچە زەوییەك و دیارکردنی ئەو سنوورانە. ئەم وشەیە کەوتووەتە ترکی و، ئەوجا عەرەبییەوە، سەرنجی (دائرة ألطابو) بدە.

**Tapû** تاپوو، بە کەنوو kenû (کەندەڵان kendelan) ی ← هەنگ heng دەگوترێ کە ← هەنگوێن hengwên ی تێدا دروست دەکرێ. سەرنجی وشەی Topf ی ئەڵمانی و pot ی ئینگلیزی بدە کە بە ← مەنجەڵ mencel دەڵێن.

**Taq** تاق، بە چاڵاییەك دەگوترێ کە لە دیواردا کرابێ، هێندەك جار، سەرەکەی لە شێوەی کەوانەییدا دەبێ. بە پەهلەوی تاك tak ە و بە فارسی بووە بە طاق. هەر ئەم وشەیە تاق taq لە زاری کوردیی باکووردا بووە بە تاخ tax، کە بۆ ← گەڕەك geřek بەکاردەبرێ. بۆ وێنە: دەگوترێ: تاخێ کوردان taxê kurdan واتە: "گەڕەکی کوردان".

**Tar** تار، ئامیرێکی مۆزیکەیە، کە وشەیەکی کۆنە و، بە لاتینی تار

tar و بە پەهلەویش هەر تار
tarە. وادیارە وشەی تار tar
پێوەندیی بە تاڵ tal’ (تاڵەموو
tal’emû) واتە: ئەو تەلانەی←
تەل tel) کە پێوەی بەستراون.
تەل tel و تێل têl یش هەر
پێوەندییان بە تاڵ tal ەوە
هەیە.

**Taran** تاران، ← تاراوگە tarawge.

**Taraw** تاراو (← تارسە tarse).

**Tarawge** تاراوگە/ Terawge
تەراوەگە، شوێنێکە کە خەڵکی
دەرکراو، دەرپەڕێو لە ← هەوار
hewar ی خۆیان، تێیدا بژین.
وشەکە، بنەڕەتەکەی: تەراوگە
terawge یە. لە زمانی کوردیدا
وشەی تەرەبوون terebûn
دوورکەوتنەوە لە شوێنی خۆ و،
تەرەکردن terekirdin هەیە،
بە مانای دەرکردن لە شوێنی
خۆی و، پەرەوازەکردن، بۆ وێنە
دەگوترێ: کۆترەکان تەرەبوون
terebûn واتە: لە شوێنی
خۆیان نەمان و دوورکەوتنەوە.
تەراو teraw/ تاراو taraw
وەك دەرکراو derkiraw
کەسێکە، یان زیندەوەرێکە کە لە
شوێنی خۆ تەرە بوو le
shwênî xo terebûە.
"تەراوگە terawge/ تاراوگە
tarawge" واتە: جێی ئەوانەی
کە تەرە بوون. گە ge
پاشکۆیەکە بۆ جێ cê شوێن
shwên (← تارسە tarse).
دیارە تۆران toran/ تۆرین
torîn یش هەر لەم رگەوە
سەریهەلداوە.

**Tarîk** تاریك، بە پەهلەویش هەر
تاریك tarîkە. هەر لە
پەهلەویدا تۆماك tomak هەیە
بۆ تاریك و لێڵ tarîk û lêl.

**tarkirdin** تارکردن (←تارسە tarse).

**Tarse** تارسە (← تاسە tase).

**Tas** تاس/ تاسولکە tasulke (تاسێکی
پچووك tasêkî pichûk). تاس

tas به ← دەفر defir ی قوولی لە مس دروستکراو دەگوترێ. وشەیەکی کۆنی کوردییە کە لە وشەی تەشت tesht ەوە هاتووە ولە عەرەبی و فارسیدا بووە بە "طاس" و لە رێی عەرەبەوە کەوتووەتە زمانە ئەوروپاییەکانەوە. لە زمانی ئەڵمانیدا بووە بە Tasse و لە فەرەنسیدا tasse. فەرهەنگی ئەڵمانی دودن Duden بنەڕەتی وشەکە بە تەشت tesht دادەنێ و تەشت tesht بە فارسی دەداتە قەڵەم، هۆی ئەمەش ئاشکرایە هەموو وشەیەکی ئێرانی دەبەنەوە سەر فارسی، ئەگەرنا وشەکە لە ئاویستاییدا تەشتە teshte یە. ئاویستا بە فارسی نەنووسراوەتەوە. پەهلەوی لە ئاڤێستاوە وەریگرتووە بە شێوەی تەشت tesht. هەر لە کوردیدا وشەی تەشپی teshpî هەیە بۆ کاسە ← kase یەك کە لە دار دروستکرابێ. پێوەندیی رەگی ← کاسە kase و ← تاسە tase ش، کە لە عەرەبیدا بووە بە طاس نابێ رەچاو نەکرێ، کە وشەی کاسە، کە لە عەرەبیدا کراوە بە "كأس"کەوتووەتە زمانی ئەڵمانی وەك Kasse و زمانە ئەوروپاییەکانی دیکەوە.

**Tas** تاس/ تاسبردنەوە tasbirdinewe لە ترساندا بێهوش بوون. لە شێوەزاری کوردیی باکووردا وشەی تاشا tasha هەیە بۆ ترس tirs، هەروەها لە کوردیدا وشەی ئەوتراشی ewtirashî هەیە (فەرهەنگی باشوور، بەرهەمی: عەباس جەلیلیان) بێجگە لەوەش وشەی ئەترەش etresh و ئەترەك etrek یش هەیە (ئەترەشی چوو etreshî chû). واتە: ترس بردییەوە tirs birdiyewe (← ئەترەش etresh). وشەی ئەترەش etresh بنچینەی وشەی ترس ters ی فارسییە.

# T ت

Tase تاسە (تاسەی بینینی دۆستانم کرد، واتە: ئارەزووی بینینیانم کرد). تاسە tase ئارەزووکردنە لە دوورەوە، کە بە عەرەبی (لوعة واشتیاق) ە. لە زمانی کوردیدا وشەیەکی دیکە هەیە بۆ تاسە tase، کە ئەوەش تارسە tarse یە. تار tar لە زمانی کوردیدا بە مانای دوورکەوتنەوە و تەرەبوون terebûn دێ (کۆترەکان لە هێلانەکەیان تەرەبوون، واتە: دوورکەوتنەوە). وشەی ← تاراوگە tarawge واتە: (شوێنی ژیانی دوور لە نیشتمان و ← wilat ولات) تاراو taraw (بە کەسێك دەگوترێ کە بۆ هەتا هەتایی لە شوێنی خۆی دوورکەوتبێتەوە)، هەروەها تارکردن tarkirdin و تەرەکردن terekirdin (دەرکردنی کەسێك، یان دوورخستنەوەی شتێك، لە شوێنی خۆی، هەتا هەتایی) هەر لە مەوە دێ. وشەی تاسە tase لە بنەڕەتدا لە tarse ەوە هاتووە، کە هەر بەو مانایە بەکاردێ، دەنگی ر r لە وشەی تاسە tase دا کەوتووە. سە se لە سێ sê وە هاتووە کە بە مانای پەنا pena و سێبەر sêber دێ. تاسەکردن tasekirdin واتە: لە دوورەوە سێبەری کەسێك، یان، تارمایی tarmayî کەسێك، هێنانە بەر چاوی خۆ.

Tash تاش/ تیش tîsh بە بەردێك دەبێژن کە ساف و لووس بێ، واتە: تەراشکراو terashkiraw بێ، تاش tash لە تاشین tashîn ەوە هاتووە. دیارە، وشەیەکی دیکەش بۆ تاش tash هەیە کە ئەوەش تات tat ە

(تاته بەرد tate berd)، تات tat مانای تەخت text واتە: ساف و لووس saf û lûs، زەوییەکە تاتە، واتە: تاشراوە و زرگوهەڵەتی تێدا نییە. پێتاتە Pêtate (تەختەی ژێر پێی جۆڵایە) تاش tash، چووەتە زاری ترکییەوە و، هەر بۆ بەرد berd (← کەڤر kevir) بەکاردێ. (← تاشین tashîn/ تراشین tirashîn). تاش tash وەك پاشگر دەچێتە پاڵ نێوەوە و دەیکا بە نێوی کارا، بۆ وێنە: بەرد تاش berd-tash، سەرتاش ser-tash.

**Tashîn** تاشین/ تراشین tirashîn، لە پەهلەویدا تەش tesh و تاشیتەن tashîten ە و لە ئاڤێستادا tash و تەش tesh هەیە کە مانای بڕین birîn ە. وشەی تیژ tîj (تێژ têj) و تیخ tîx و ← سیخ sîx لە مەوە هاتووە. تیخ tîx بە پەهلەوی تیگ tîg ە.

**Tat** تات/ تاتۆ tato بە ← باوك bawk دەگوترێ. وشەیەکی کۆنی هیندۆئەورووپاییە. لە سانسکریتدا تاتا tata یە. سەرنجی وشەی فاتەر vater ی ئەڵمانی و father ی ئینگلیزی بدرێ، کە دەنگی ت t و ف f/v جێیەکیانگرتووەتەوە. وێنەیەکی دیکەی تات tat لە کوردیدا هەیە ئەوەش ئات at ە کە لە شێوەزاری باشووری کوردستاندا ئاتك ـ بووتك atik-bûtik هەیە کە بە مانای بنەچە و رەچەلەك bineche û rechelek دێ. دیارە ـك k– پاشگرە بۆ کچکەکردنەوە و وشەکە ئات at ـ بووت bût ە. ئات at باوك bawk ە کە ئەمە

وێنەیەکی فات fat ە لە وشەی vater (باوك bawk) ی ئەڵمانیی ئەوروپادا، کە لە زمانی ئەڵمانیی کۆندا Fater بووە و بۆ خۆشەویستی فاتی vati بانگدەکرێ. وشەی ئات at (باوك bawk) ی کوردی، بە شێوەی ئەتە ata کەوتووەتە زاری ترکییەوە بە مانای باوك (سەرنجی وشەی ئەتەترك etetirk بدە). وشەی بووت bût لە ئاتك ـ بووتك -atik bûtik دا، پێوەندیی بە وشەی ← بووك bûk ەوە هەیە، کە لە بنەڕەتدا بە مانای مێینەیە.

**Taw** تاو، بە تینی گەرما و تینی جۆش cosh دەگوترێ. تینی گەرما بە پەهلەوی تاپ tap ە کە لە فارسیدا بووە بە تاب tab. تاو/ڤ taw/v بۆ هەتاو hetaw یش بەکاردەبرێ. هەروەها تا ta لە کوردیدا بە شێوەی تێ tê ش بەکاردەبرێ بۆ وێنە: گرانەتا giraneta/ گرانەتێ giranetê. تاو taw بە مانای داو daw یش بەکاردێ، وەك: داوە دەزوو dawe dezû، واتە: تاوە دەزوو tawe dezû (← تەناف tenaf).

**Tawan** تاوان، بە پەهلەوی تاڤان tavanە.

**Tawanî** تاوانی/ تاوێنی tawênî (ئەو پارەیەیە کە لە باتی کردنی گوناهێك دەبژێردرێتەوە بۆ گوناهلێکراو)، بە عەرەبی "غرامة".

**Tawe** تاوە، ئەو پارچە ئاسنە گردەیە کە خواردنی تێدا سۆردەکرێتەوە، یان، دەکوڵێنرێ. تاوە tawe لە ← تاو/ڤ taw/v ەوە هاتووە، بە مانای تینی گەرما (سەرنجی وشەی هەتاو/ڤ

hetaw/v بده). تاوە **tawe** کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە بە شێوەی "طبق" کە لە کوردیدا تەبەق **tebeq** ە. کە وشەی تەباخ **tebach** (طباخ) ی عەرەبی هەر لەمەوە هاتووە. وشەی مطبخ ی عەرەبی لە مە ـ تەباخ **me-tebach** ەوە هاتووە، کە مە **me** بە مانای ئامێر دێ لە کوردیدا (← مەگریجەنی **megrîcenî**). هەروەها وشەی طابوق، کە بە زاری عەرەبی، بە خشتی سۆرەوەکراو دەگوترێ هەر لە تاوە **tawe** ەوە وەرگیراوە.

**Tawe** تاوە (← ئافتاوە **aftawe**).

**Tawus** تاوس، نێوی مەلێکە کە لە عەرەبیدا بووە بە طاؤوس و لە فارسیدا طاوس. کە بە لاتینی **pavo** یە و بە ئەڵمانی **pfau**، بە زمانی هیندیی کۆن تاوسا **tawsa** یە.

**Tayen** تایەن، وشەیەکی دیکەیە بۆ دایەن **dayen**. دەنگی ت **t** و د **d** جێییەکیان گرتووە. هەردووکیان بە مانای لەلە **lele** ی ← مندالّ **mindal’**. دایەن **dayen** > دا **da** + یەن **yen**. دا **da** دایك **dayk** ە و یەن **yen** لە یەند **yend** ەوە هاتووە کە مانای هەند **hend** (هێندە **hênde**)یە. واتە: ژنێك کە، هێندەی دایك بۆ ← مندالّ **mindal’** بە پەرۆشە. هەر لە کوردیدا وشەیەکی دیکە هەیە بۆ دایە **daye** ئەوەش تایە **taye** یە.

**Taytil’** تایتڵ، لە **title** ی ئینگلیزییەوە وەرگیراوە کە بە مانای سەرنێوی پەرتۆکێك، یان نووسراوێکە. بە ئەڵمانی **Titel** و بە فەڕەنسی **titre** ە. لە بنەڕەتدا وشەکە **titulus** ی لاتینییە کە بە مانای وشەیەکە

دەخرێتە پێش نێوی کەسێکەوە بۆ پێشاندانی پلە، یان پایە، یان باوەڕنامەی ئەو کەسە.

**Tecawiz** تەجاوز (← **ciyawaz** جیاواز).

**Telîsm** تەلیسم، لە تێلسما **Τέλεσμα** (**télesma**)یۆنانییەوە وەرگیراوە، لە زاری عەرەبیدا بووە بە طِلَسمْ. لە زمانی لاتینیدا **talismen** ە و، لە ئیسپانیدا **talismán** و لە ئیتالیاییدا **talismand** و بە ئەڵمانی **talisman** ە کە بە کوردی بەرگری چاووزار **chawûzar** ە، لە شێوەی کووژەکەی شیندا.

**Tem** تەم (← تانە **tane**) لە ئاوێستادا تەما **tema** و تەم **tem** و لە پەهلەویدا تەم **tem**ە.

**Tembûr** تەمبوور/ تەمووره بە پەهلەوی: تەمبۆر **temûre** **tembor**. ئامێرێکی مۆزیکی کۆنی کوردە، لە فارسی و عەرەبیدا بووە بە طنبور.

**Temir** تەمر (پوولی پۆستە **pûlî poste**)، وشەکە فەڕەنسییە **timbre-poste** یە، کە بە شێوەی تامبر - پۆست دەردەبڕدرێ.

**Temûre** تەموورە. ئامێرێکی مۆزیقەلێدانە، بە زۆری یارسانییەکان بەکاریدەبەن. بە عەرەبی و فارسی طمبور و طنبور ە.

**Ten** تەن (← لەش **lesh**) لە تنۆ **tino** ی ئاڤێستاییەوە هاتووە و بە پەهلەوی تن **tin**ە.

**Tenaf** تەناف < تاناڤ **tanav** < تاوناڤ **tawnav**. واتە: رایەڵێك کە لە ناو/ڤ **naw/v** (نێوان **nêwan**)ی دوو شوێندا تەنراوە **tenrawe** و رایەڵکراوە. ئەم وشەیە لە عەرەبیدا بووە بە

"طناب" و لە فارسیشدا هەر "طناب" ە. فەرهەنگی فارسیی معین، وشەکە بە عەرەبی دەداتە قەلەم. ئەمە لە کاتێکدا وشەکە کوردییەکی ڕۆنە و، ڤ v ی کوردی لە عەرەبیدا دەبێتە ب. بۆ وێنە ← سەراو seraw دەبێتە سراب.

**Tender** تەندەر. خستنەڕوو، یان خستنە بەردەمی پێشنیازێکە بەنووسین بۆ کردنی کارێك، یان بەستنی گرێبەندێك. وشەکە ئینگلیزییە و هەر **tender** ە.

**Teng** تەنگ/ (← تەنك **tenik**).

**Tenik** تەنك، وشەیەکی هیندۆئەوروپاییە. بە هیندی تەنوکە **tenuke** و بە ئینگلیزی **thin** و بە ئەڵمانی **dünn** ە و بە پەهلەوی تنۆك **tinok**ە، کە بە شتێك دەگوترێ ← قوول **qûl**/ کوور **kûr** نەبێ. سەرنجی وشەی تەنکاو/ڤ **tenkaw/v** بدە.

**Tenik** تەنك/ تەنگ **teng**، ئەم دوو وشەیە هەردووکیان یەك بنەڕەتیان هەیە. تەنك **tenik** < تەن **ten** + ـك **ik**. تەنگ **teng** < تەن **ten** + ـگ **ig**. ـك **ik** و ـگ **ig** نیشانەی گچکەکردنەوەیە. تەنك **tenik** و تەنگ **teng** مانای تەن (لەش **lesh**) ێکی گچکە. وشەی تەنۆك **tenok** ی پەهلەوی و **dünn** ی ئەڵمانی و **thin** ی ئینگلیزی بە مانای تەنك **tenik** و تەنگ **teng** ی پەهلەوی و **eng** ی ئەڵمانی بە مانای تەنگ، پێوەندیی ڕەگییان بەم دوو وشە کوردییەوە هەیە. وشەی تەنگ **teng** لە عەرەبیدا بووە بە "طنجة".

**Tenûr** تەنوور/ تەندوور **tendûr**، (چاڵی نان پێوەدان و برژاندنی هەویری نان) بە ئاڤێستایی تەنوورە **tenûre** یە و لە پەهلەویدا تەنوور **tenûr** ە و لە

عەرەبیدا بووە بە تندور (وفار ألتنور: قورئان ك هود 11/40).

**Tenya** تەنیا/ تەنێ **tenê**. لە پەهلەویدا: تەنیها **tenîha** یە.

**Tel’e** تەڵە/ فاقە **faqe**/ داو **daw** بە پەهلەوی تەڵەك **tel’ek** ە.

**Tel’eke** تەڵەکە/ (فێڵ **fel’**) لە ← لە تەڵە **tel’e** ەوە هاتووە.

**Tem** تەم (← **Tane** تانە).

**Tenîn** تەنین (← **pîne** پینە).

**Tepl’** تەپڵ، ئامێرێکی مۆزیکی کۆنی کوردە کە دەهۆڵی لەشکربووە، وشەی تەپڵ **tepil’** لە تەبەق **tebeq** ەوە هاتووە (← تاوە **tawe**) لە عەرەبی و فارسیدا وەك "طبل" بەکاردەبرێ. فەرهەنگی فارسی معین بە هەڵە بە وشەیەکی عەرەبی داوەتە قەڵەم. رووی تەبەق **tebeq** وەك رووی تەپڵ پانە و زۆر جار لە تەبەق دەدرێ وەك تەپڵ. رەنگە وشەی دەهۆڵ **dehol’** یش هەر لە تەبڵ **tebl’** ەوە هاتبێ و بەم شێوەیە: دەهۆڵ **dehol’** > تەهۆڵ **tehol’** > تەبوڵ **tebul’** > تەبڵ **tebl’** > تەپڵ **tepl’**. (← تەپڵەك **tepl’ek**).

**Tepl’ek** تەپلەك، بە سینیەکی دار، یان، تەنەکە، یان، پلاستیك کە بچووك بێ دەگوترێ تەپلەك **tepl’ek**. تەپلەك **tepl’ek** = تەپڵ **tepil’** + ـەك **ek** – (نیشانەی گچکەکردنەوە) وشەکە وشەیەکی لاتینییە کە لە فەرەنسیدا **tablette** و لە ئەڵمانیدا **Tablett**ە، کە وشەی تابلێت **Tablett** گچکەکراوەی **table** ە کە ← مێز **mêz** ە.

**Teř** تەڕ (تازە **taze**، ئاولەخۆگر). لە پەهلەویدا هەر تەڕ **teř** ە، لە عەرەبیدا بووە بە "طري".

**Teratên** تەراتێن، بزووتنی ئەسپ و لۆقەکردنی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی، واتە: جێی خۆگۆڕین cêy xo gořîn ی ئەسپ (← تارسە tarse).

**Terceman** تەرجەمان، لە پەهلەویدا: تەرگەمان tergeman ە. geman گەمان و zuvan زوڤان لە پەهلەویدا بە مانای زمان ziman دێن. تەرگەمان tergeman لە عەرەبیدا بووە بە ترجمان کە بۆ ژیننامە jînname بەکاردەبرێ. وشەی "ترجمە" عەرەبی نییە و کوردییەکی کۆنە. تەنانەت وشەی دیلماجە dîlmace کە ئەوروپاییەکان بە ترکیی دادەنێن، لە وشەی تەرجەمە terceme وە هاتووە. تەرجەمە

terceme < دەل جەمە

delceme < دەل مەجە

delmece < دیل ماجە

dîlmace. وشەکە پێوەندیی بە وشەی ترکیی dil ەوە نییە کە مانای زمانە. تەر teř کە بە پەهلەویش هەر تەر teř ە، پێشگرێکە بۆ زۆرزانی و زیرەکی و چالاکی. بۆ وێنە: تەڕ زمان teř ziman تەڕ پیر teř pîr تەڕ دەست teř dest (کارا، ژێهاتی).

**Terebûn** تەرەبوون/ تەرەکردن terekirdin (← تارسە tarse ← تاراوگە).

**Teřetîze** تەڕەتیزە، جۆرە گیایەکە دەخورێ لە تەڕەتیژە teřetîje ەوە هاتووە. (← تەڕ teř).

**Terîq** تەریق/ تەریقی terîqî، تەریق بوون terîqbûn. تەریق terîq لە تەریك terîk ەوە هاتووە. تەریکی terîkî دوورەپەرێزییە لە شتێك کە ئەمەش لە تەرەبوون terebûn ەوە دێ، واتە: دوورکەوتنەوە (← تەرە tere، ← تاراوگە tarawge).

**Terxûn** تەرخوون > تەڕ **teř** + خوون **xûn**. ئەم وشەیە لە ڕێی عەرەبەکانەوە کەوتووەتە زمانی لاتینیی ناڤین و لە وێشەوە کەوتووەتە فەڕەنسی و لە ئەڵمانیدا بووە بە **Estragon**، فەرهەنگی ئەڵمانی **Duden** دەبێژێ ئەم وشەیە لە عەرەبییەوە هاتووە. کە ئەمە ڕاست نییە. بەشێك لەو گیایانەی کە لە کوردستان وەك بەهارات لە گەڵ خواردن دەخورێن، بە تەڕ دەستپێدەکەن وەك تەڕەتیزە **teřetîze** کە تەڕەتیژە **teřetîje** یە. هەروەها تەڕە پیاز **teře piyaz**، تەڕلە **teřle**، تەڕچك **teřchik** (بە شینایییەك کە تەڕ و تازە بێ دەبێژن تەڕچك **teřchik**) > تەڕشك **teřshik** > تەڕشینك **teřshînk**، **teřepene** تەڕەپەنە...هتد. تەرخوون > **teřxûn** تەڕخوونك > **teřxûnk** تەڕخینك > **teřxînk** تەڕشینك > **teřshînk** واتە: شینایییەکی تەڕ. هێندەك جار لە کوردیدا بە ڕەنگی خوێن **xwên** دەگوترێ شین **shîn**. سەرنجی وشەی شینە دەمار **shînedemar** (ڕەگی خوێن **regî xwên**) بدرێ.

**Tesht** تەشت (← تاس **tas**).

**Tev** تەڤ (هەموو **hemû**/ تەواو **tewaw**) سەرنجی وشەی **too** ی ئینگلیزی و **tous** و **tout** ی فەڕەنسی بدە

**Tevgeř** تەڤگەڕ. تەڤ **tev** مانای هەموو **hemû**، تەواو **tewaw**. گەڕ **geř** لە گەڕان **geřan** ەوە دێ، واتە: بەهەموو لایەکدا لە جووڵە دایە.

**Tewir** تەور/ **Balte** باڵتە بە پەهلەوی تەپەر **teper** ە.

## T ت

**Tewîle** تەویلە، جێی ولاخ. کە لە فارسیدا وەك "طویلة" دەینووسن و لە عەرەبیدا بە شێوەی أصطبل بەکاردەبرێ، لە بنەرەتدا وشەیەکی هیندۆئەورووپاییە. لە زمانی لاتینیدا **stabulum** و لە ئینگلیزیدا **stable** و بە ئەڵمانی **stall** و بە فەڕەنسی **étable**. ئەم وشەیە لە زاری عەرەبی بازاریدا بووە بە "طاولة" وەك زاری ترکی **tavle**. لە زمانی کوردیدا وشەی دێوڵ **dêwil’**/ تەوڵ **tewil’** هەن، کە بە زەنگوڵەی ملی سابرێن **sabrên**/ ساورێن **sawrên** دەگوترێ.

**Teyman** تەیمان (← تانە **tane**).

**Têj** تێژ (← **tîj** تیژ).

**Têkoshîn** تێکۆشین > تێ **tê** + کۆشین **koshîn**. کۆشین **koshîn** لە پەهلەویدا کۆخشیتەن **koxshîten**ە، کە لە فارسیدا بووە بە کوشیدن **kûshîden**.

**Tift** تفت، بە خواردنێك دەگوترێ کە ← تاڵ **tal’** و ← تیژ **tîj** بێ. ئەمەش لە وشەی ئاڤێستایی: تەفتە **tefte**ەوە هاتووە. کە بۆ شتی گەرم **gerim** (تاڵ **tal’** و تیژ **tîj**) بەکاردێ. وشەکە پێوەندیی بە ← تاو **taw** (گەرمی **germî**) یە وە هەیە.

**Tijî** تژی (پڕ) > ت **t** + ژی **jî**. ت **ti** تو **tu** (واتە هەموو/ هەمی **hemû/hemî** (← تو **tu**) سەرنجی وشەی تەڤ **tev** بدرێ. ژی **jî** لە: جی **cî** و جهێ **cihê** و جێ **cê** وە هاتووە. واتە: هەموو جێیەکی ئەو شتەی گرتووتەوە، واتە: پڕی ئەو شتەیە و، تەڤ جی **tevcî** یە.

**Tilî** تلی، بە مانای پەنجە **pence** دێ و، لە کوردیی باکووردا

بەکاردەبرێ. تلی tilî لە قلی qilî یەوە هاتووە، بەو مانایەی کە "وەك قل qil وایە". لە فارسیدا بووە بە سیلی sîlî کە مانای رەپکردنی پەنجەکانی دەستە. "سیلی زدن" لە فارسیدا، مانای: زللە لێدان بە بەری دەست و پەنجەکان بە کوردی کرماشانی شەقە سیلە sheqesîle ی پێدەڵێن.

Tilʾîsh تلێش/ qilʾîsh قلێش. لە ئاڤێستاییدا تریش ووا tirîshûa یە.

Tiraw تراو، لە تەڕاو teřaw ەوە دێ (← تەڕ teř).

Tiřimpif ترمپف، بە مانای گەوج gewic و گەواد gewad یش دێ. لە فارسیدا بووە بە قرمپوف qorumpuf. پف piff وشەیەکە لە رێی pouf ی فەڕەنسییەوە کەوتووەتە زمانی ئەڵمانییەوە بە شێوەی puff و، هەر بەو جۆرە و، بۆ رووسپیخانە rûspîxane بەکاردێ، کە وشەکە لە بنەڕەتدا عیبریە. ترِم tiřim وێنەیەکی دیکەی وشەی ترۆ tiřo یە کە مانای بێئاوڕوو bêawřû ە. ترِۆکردن tiřokirdin واتە: بێئاوڕووکردن bêawřûkirdin ترِم پف tirim pif، کە هێندەك جار بە شێوەی ترِم پرِم پف tiřim piřim piff دەگوترێ، مانای بێئاورووبی و بێشەرمی دەگەیەنێ. وشەی قورم ساخ qurimsax لەمەوە هاتووە، واتە: بێئاڕووی تەواو.

Tirîqe تریقە (← shîřandin شیڕاندن).

Tirît تریت، گۆشتئاوێکە کە نانی تێبگۆشن. تریت tirît وێنەیەکی دیکەی چریت chirît ە، کە

ڕەگی وشەی چەور chewir ی تێدایە. بە پەهلەوی بە چەور دەگوترێ چەرپ cherip کە لە فارسیدا بووە بە چرب و لە عەرەبیدا بووە بە سرب. وشەی تریت tirît لە عەرەبیدا کراوە بە ثرید. تریت لە ثرید ەوە نەهاتووە، بەلکو ثرید لە تریتەوە هاتووە. ئەمە پێچەوانەی ئەو زانیارییەیە، کە کاتی خۆی لە پەرتۆکی "زمانی یەکگرتووی کوردی" (چاپی 1976) دا، نوسیبووم، کە تریت tirît لە "ثرید" ەوە هاتووە، ئەوە ڕاست نییە، ئەمەی ئێرە ڕاستە.

**Tiřleylî** تڕلەیلی، واتە: مرۆڤی بێهۆش **bêhosh** و گێل **gêl** > تڕ **tiř** + لەیل **leyl**. لەیل **leyl** واتە: لەگەڵ **legel’**. تڕلەیلی **tiřleylî** واتە: مرۆڤی تڕلەگەڵ **tiřlegel’** (تڕکەن **tiřken**). یەکێکی بێهۆش کە ئاگای لە قوونی خۆی نەبێ.

**Tirs** ترس/ تەرس **ters**، بە ئاڤێستایی ترسە **tirise** یە و، لە پەهلەویدا تەرساک **tersak** ە.

**Tirsh** ترش، بە پەهلەوی تورش **trush** ە.

**Tiř û Tifaq** تڕ و تفاق، تڕوتفاق **tiř û tifaq** > تەڕ **teř** + و **û** + تفاق **tifaq**. ← تەڕ **teř** دژی هیشک **dijî hîshk** ە. تفاق **tifaq** بە ئالیکێکی هشک دەگوترێ، کە بە ولاخ دەدرێ. کەواتە: تڕوتفاق **tiř û tifaq** مانای تەڕ و هیشک **teř û hîshk**.

**Tirumpa** ترومپا، ئامێرێکە ئاو دەردەهێندرێ پێی لە بیر. وشەکە لە فەڕەنسییەوە وەرگیراوە کە **trompe** ە و لە ئەڵمانیشدا هەر بەو شێوەیە بەکاردەبرێ.

له فارسیدا بووه به تلمبه tolombe و کەوتووەتە زاری ترکییەوە.

**Tîj** تیژ/ **Têj** تێژ/ تووژ **tûj** (یان بۆ خواردەمەنی **xwardemenî** یان بۆ ← تیخ **tîx**). له ئاڤێستادا وشەکە **vêj** ڤێژ، تەیج **teîc**ە و له پەهلەویدا **têj** تێژ/**têz** تێزە. (← تاشین **tashîn**).

**Tîl** تیل/ تیلکردن **tîlkirdin** بۆ جوولاندنی هەڵمات بەکاردێ کە به پەنجە ببزوێنرێ و ئاراستەی هەڵماتێکی دیکە بکرێ. تیل **tîl** له تیر **tîr** ەوە هاتووە. تیلکردن **tîlkirdin** تیرکردن **tîrkirdin** ە، واتە: وەك تیرێك کە نیشانە بگریتەوە پێی. (← تیلماسك **tîlmask**).

**Tîlmask** تیلماسك، بە پارچەیەك زەوی دەگوترێ کە بارێك بێ و، بەرەکەی تەنگ بێ. وشەکە له تیرماسك **tîrmask** ەوە هاتووە. ماسك **mask** و مازك **mazk** گچکەکردنەوەی ماز **maz** و ماس **mas** ە. ماز **maz** بە ڕێیەکی تەنگ و سەختی چیا دەگوترێ. مازە **maze** لە زمانی کوردیدا بۆ بڕبڕەی پشت **biřbiřey pisht** بەکاردەبرێ، کە ستوونێکی باریکە.

**Tîshk** تیشك < تی **tî** + شك **shk** (بۆ گچکەکردنەوە) تی **tî** لە تین **tîn** (گەرمایی و ڕۆناکی **germayî û ronakî**) یەوە هاتووە. واتە: ڕۆناکییەکی گچکە.

**Tîv** تیڤ (← تویژاڵ/تویژ **(twêj(al’)**.

**Tîvshal** تیڤشال (← تویژاڵ/تویژ **(twêj(al’)**.

**Tîx** تیخ (← تاشین **tashîn**).

**To** تۆ، بە ئاڤێستایی تـ **ti** یە و بە پەهلەوی تۆ **to** یە، بە فەڕەنسی **tu** و بە ئینگلیزی **you** و بە ئەڵمانی **Du**.

**Tom** تۆم (تۆو **tow**) ← توومك **tûmik**

**Tomar** تۆمار. وشەكە بنەڕەتێكی یۆنانی هەیە كە تۆم **tom** ە بە مانای نەخشەكێشان **τομογραφία** دێ. سەرنجی وشەی **Tomographie** ئەڵمانی و **tome** فەڕەنسی بدە كە بەمانای بەشێكە لە پەرتۆكێك.

**Tomez** تۆمەز/ تمەس **times**/ تمەز **timez** لە تۆمەزانە **tomezane** ەوە هاتووە. (ئەو وایگوت، تۆمەز (تمەز) مەبەستی شتێكی دیكە بوو). كە تمەس **times** دەگوترێ هێندەك جار لە باتی تۆمەز **tomez**، دەنگی س **s** لە جیاتی ز **z** بەكاردەبرێ، ئەمە وەك گوڕینی دەنگی ز **z** بە س **s** لە وشەی نەخازمە **nexazme** دا كە بووە بە نەخاسمە **nexasme**. هێندەك جار وشەی تمەرز **timerz** لە جیاتی تمەز **timez** بەكاردەبرێ. بۆ وێنە: تمەرز مەكە **timerz meke** ئەوە تۆمەرز (مەرج) مەكە **tomerz (merc) meke** یە.

**Top** تۆپ. لە بنەڕەتدا رووسییە **тушка́** و بە شێوەی تۆپ **top** كەوتووەتە فارسی و تركییەوە، لە فارسیدا بووە بە توپ **tup**.

**Toran** تۆران (← تاراوگە **tarawge**).

**Torîn** تۆرین (← تۆران **toran**).

**Tornechî** تۆرنەچی. تۆرنە **torne** لە **turn** ی ئینگلیزییەوە هاتووە كە بە مانای بادان **badan** و خولدان **xuldan** ە.

**Tox** تۆخ (← دۆشاو **doshaw**).

**Tow** تۆو (← **Tumik**).

**Toz** تۆز، لە تۆژ **toj** و توێژ **twêj** ەوە هاتووە. كە شتێك توێژێكی هەڵدا بەرە بەرە هوردەبێ و وەك خۆڵی لێدێ. بە هەموو وردیلەیەكیش دەگوترێ تۆز **toz**. ئەم وشەیە چووەتە زاری

تركییەوە بە شێوەی توز tuz و خوێ xwê بەکاردەبرێ.

**Tu** تو/ تەڤ tev/ هەموو hemû/ هەمی hemî. سەرنجی وشەی too ی ئینگلیزی و، tous و tout ی فەرەنسی بدرێ.

**Tuman** تومان (← Tane تانە).

**Tund** توند/ تند tind/تونت tunt دژی شل shil. بە ئاڤێستایی تڤانت tvant و توڤانت tuvant. توند tund لە فارسیدا بۆ خێرا xêra و ← گورج gurc و پەلە pele بەکاردەبرێ. وشەی توون tûn (توونی گەرماو tûnî germaw) کە بە پەهلەوی تۆن ton ە لە گەڵ توون tûn ی خواردەمەنی، وەك توونیی پیڤاز tunî pîvaz لەمەوە هاتووە.

**Tune** تونە/ (نییە niye)، تونەبوون tunebûn (بە جارەك نەمان)، تونەکردن tunekirdin (بە جارەك نەهێشتن) (سەرنجی وشەی تەفر و تونا tefr û tuna بدرێ). تونەکرن tunekirin < تو tu + نە ne + کرن kirin. ← تو tu مانای هەموو hemû، یان هیچ hîch. من تو کەس نەدیت min tu kes nedît واتە: من هیچ کەسێکم نەدیت min hîch kesêkim nedît. تونەکرن tunekirin واتە: کردن بە هیچ (لە نێوبردن). تو کەس هاتبوون tu kes hatibûn (هەموو کەس هاتبوون). سەرنجی وشەی ئینگلیزی too (هەموو) و وشەی ئەڵمانی total (هەموو، گشت) بدرێ. هەروەها وشەی فەرەنسی tout(e) (هەموو).

**Tûm** تووم/ (تۆو tow) ← توومك tûmik

**Tûmik** توومك، ئەو خۆراکەیە کە بۆ مەلێك، یان ئاژەڵێك دادەنرێ بۆ

فریودان و گرتنی. توومك tûmik > تووم tûm + ـك ik (پاشکۆیەکە بۆ بچووککردنەوە)، تووم tûm، تۆم tom (تۆو/ڤ tow/v). وشەی "طُعْمَة" ی عەرەبی، کە فارسیش لە عەرەبییەوە وەریگرتووە، هەر لەم توومك tûmik ی کوردییەوە وەرگیراوە و پێوەندیی بە "طعام"ەوە نییە.

**Tûr** توور (کیسە) توورەك tûrek/ توورەکە tûreke (کیسەی بچووك) کە لە ترکیدا بووە بە tûrbe واتە: تووربار (توورەکی بارهەڵگرتن) و بە فارسیش "توبرە" یە، وشەیەکی کۆنی کوردییە (سەرنجی وشەی Tüteی ئەڵمانی بدرێ کە هەر بەو مانایەیە). سەیر ئەوەیە فەرهەنگی ئەڵمانیی گشتگر کە بە Duden ناسراوە، وشەی tûrbe بە ترکی دەداتە قەڵەم و، دەبێژێ کە لە گوومەز gumez ەوە وەرگیراوە، کە بە شێوەیەکی قووچە. و بە ئەڵمانی Turm ە، لێرەدا دەبێ بگوترێ "هەمزە لە هەباسی چی".

**Tûrdan** توورِدان. لە دوور ـ دان dûr-dan ەوە هاتووە، واتە: خستنە دوور dûr xistine و دوورخستنەوە dûr xistinewe.

**Tûrek** توورەك (← Tûr توور).

**Tûtin** تووتن (← dûkel' دووکەڵ).

**Twan** توان، لە کاری ویستن wîstin ەوە هاتووە، لە ئاڤێستاییدا تەڤەنت tevent ە.

**Twanîn** توانین/ توانست twanist بە پەهلەوی تەڤانستەن tevanisten و بە فارسی بووە بە توانستن.

**Twê** توێ (← تیف tîv، ← توێژاڵ/توێژ (twêj(al')).

# T ت

**Twêj(al)** تویێژ(ال)، بنەچەی وشەی تویێژ(ال) **twêj(al)** وشەیەکی دیکەی کوردییە، کە هەر بەو مانایە بەکاردێ. ئەو وشەیە تیڤشال **tîvshal** ە. تیڤ **tîv** و توێ **twê** یەک مانایان هەیە، دەنگی ڤ **v** بووە بە و **w**. تیڤ **tîv**/ توێ **twê**، بە پارچە شتێکی ساف و لووس و باریك دەگوترێ کە بە چەقۆ **cheqo**، یان هەر تیخێکی (← تیخ **tîx**) دی ، لە شتێکی دیکە کرابێتەوە (گوشتەکەی توێ توێ کرد). شاڵ **shal** وشەیەکی کۆنی هیندۆئەوروپاییە کە مانای توێك **twêk** و توێخ **twêx** ە، کە ئەورۆش لە زمانی ئەڵمانیدا، هەر بەو مانایە (توێك **twêk**/تویێژ **twêj**/توێخ **twêx**) بەکاردێ، ئەوەتە **schal** توێکل و **schälen** توێکلکردن لە زمانی ئەڵمانیدا، بە مانای توێژ لێکردنەوە دێ، واتە: توێك /توێکڵ **twêk(il')** لێکردنەوە. و بە ئینگلیزیش توێکڵکردن **to peel** ە.

**Twêk** توێك (← تویێژاڵ/تویێژ **twêj(al')**).

**Twêkil** توێکڵ (← تویێژاڵ/تویێژ **twêj(al')**).

**Twêx** توێخ (← تویێژاڵ/تویێژ **twêj(al')**).

Va ڤا/ با ba، لە ئاڤێستادا ڤا va و ڤاتە vate و، لە پەهلەویدا ڤات vat و ڤای vay یە.

Val’a ڤالا (بۆش bosh) > ڤا va + لا la. ← ڤا va وێنەیەکی دیکەی وشەی با ba یە، بە گۆڕینی دەنگی ڤ v بۆ ب b. ڤا va بە مانای با ba لە شێوەزاری کرمانجکی (زازاکی) دا هەیە. لا la لە بنەڕەتدا را ra و ئارا ara یە، کە مانای جێ و شوێنە. ڤالا vala > ڤا ئارا va-ara واتە: شوێن و جێی ڤا va (با ba). دیارە وشەی والآیی wal’ayî ش هەر بە مانای ڤالایی valayî دێ، وشەی والآیی wal’ayî لە کوردیدا هەیە. (← بۆش bosh). وشەی "فاضي" کە لە زمانی عەرەبیی میسر و لوبناندا بەکاردەبرێ، لەم ڤالا vala یەوە وەرگیراوە. هەروەها وشەی بەتاڵ betal’ > باتاڵ batal’ یش هەر لە مەوە هاتووە.

Varisht ڤارشت/ڤارش varish/ باران baran. لە ئاڤێستادا باران بارین baran barîn بە شێوەی ڤارشتە varishte و ڤار var و، لە پەهلەویدا بە شێوەی ڤارە vare و ڤەرنتە verinte و ڤارنت varint هەیە.

Vedander ڤەداندەر (داهێنەر، هێنەرە بوو، نازنێوێکە بۆ خودێ بەکاردێ). ڤەداندەر vedander > ڤەدان vedan (دانەوە danewe) + دەر der.

Vent- - ڤەنت (← خاوەن xawen).

Verês ڤەرێس (← گوریس gurîs/ گورێس gurês).

Vewir ڤەور/ بەفر befir/ وەفر wefir/ ڤەر ver/ ڤەرڤە

# V ڤ

verve. لە ئاڤێستادا ڤەفرە vefre و لە پەهلەویدا وەفر wefr و vefrە. لە فارسیدا بووە بە برف berf.

**Viyan** ڤیان (خۆشەویستی xoshewîstî)/ ڤین vîn/ئەڤین evîn، لە ویستن wîstin ەوە هاتووە. ویستن wîstin > ویتن wîtin > وین wîn > ڤین vîn > ڤیان viyan.

Wajo واژۆ/ ئیمزا îmza. واژۆ wajo له زمانی کوردی (شێوه زاری کرمانجکی) بەکاردێ لەگەڵ وشەی ← هوما(ی) homa(y) که مانای ← "خودێ xudê" یه. واژۆ wajo به مانای "وشه دەربڕین wishe derbiřîn و گوتن gotin و فەرماندان fermandan"ه. هۆما(ی) واژۆ homa(y) wajo واته: به فەرمانی خودێ، بەرازیبوونی خودێ. کاتێك که مرۆڤ له سەر پارچه کاخەزێك (← کاخەز kaxez) ئیمزا دەکا، واته: فەرمانی خۆی و رازیبوونی خۆی دەردەبرێ. واژۆ wajo و ← وشه wishe پێوەندییەکی رەگییان پێکەوه هەیه.

Wan وان/ ڤان van، وەك پاشکۆیەك، به مانای خاوەنی شتێك، یان، لێزانی شتێك دێ، ڤ/وان v/wan کورتکراوەی وەند wend ە، که مانای ← خاوەن xawen ە و له فارسیدا بووه به بان ban وەك مرزبان merzban (سنوورپارێز sinûrparêz).

Wane وانه (← پێچەوانه pêchewane).

Wane وانه، مانای دەرز derz ە (عەرەبی: درس). وانه wane له چاوگی وێندن wêndin (خوێندن xwêndin) ەوه دێ، که له زمانی کوردیدا، بەو شێوەیه نەمایه.کەواته وانه wane وێنەیەکی دیکەی خوانه xwane (شتی خوێندراوه shitî xwêndirawe) یه. وەندنەوه wendinewe و، وەندی wendî مانای دەرز خوێندن derz

xwêndin و، وانه فێربوون wane fêrbûn ە. وەندۆخ wendox (خوێندەوار xwêndewar، وەندۆك wendok/ خوێندۆك xwêndok ە. دەنگی خ x و، و w له جیاتی یەكدی بەكاردێن. به كوردیی كرتكی (كرمانجكی) به خواردن xwardin دەگوترێ واردش wardish. هێندەك جار، دەنگی ه h له جیاتی دەنگی خ x بەكاردێ. به كوردیی هەورامی خوێن xwên هوێن hwên ە.

War وار/ ڤار var پاشكۆیەكه گەلێك مانای هەیه، یەكێك لەوانه به مانای هەبوونی شتێك دێ. وەك: كۆڵەوار kol'ewar، واته: كەسێك ← كۆڵی kol'î هەبێ، بێوار (بێ وار bêwar) واته: كەسێك كه وەچه weche ی نەبێ، واته: نەزۆك nezok بێ. خوێندەوار xwêndewar كەسێكه كه سەرمایەی خوێندنی هەبێ. رێزوار rêzwar كه نێوی فریشتەیەكی مێیینەی گەورەی یارسان (كاكەییەكان)ە و، به دایه رێزوار daye rêzwar نێودەبرێ، مانای خاوەنی رێزه و رێزی هەیه لای خەلك. وار war ـ هێندەك جار به شێوەی بار bar ـ دێ، وەك خەفەتبار xefetbar (كەسێك كه خەفەتی هەیه). ڤارا vara له سانسكریتیدا و var له ئاڤێستایی و پەهلەویدا به مانای شوێن و جێ دێ. دەبێ بگوترێ كه پاشكۆی وەر wer یش هەر وەك پاشكۆی وار war وایه. بۆ وێنه: گیانەوەر giyanewer، واته: ئەوەی گیانی هەیه. وار war هێندەك جار دەبێته وێر

wêrبۆ وێنە دەگوترێ: لە گەڵ چەند هاورێ چووم بۆ چایخانە، ورێمکردن wêrimkirdin، واتە: لە جیاتی وان پارەمدا و، بوومە خاوەنیان، خۆمکردە خاوەنیان (بەخێومکردن/ خۆم کردە خێویان). وار war و وێر wer هەر بەو مانایانە کەوتوونەتە زاری ترکییەوە.

War وار/ هەوار hewar مانای ← وەلات welat/ نیشتمان nîshtiman/ جێ cê/ شوێن shwên ە. سەرنجی وشەی کوردەواری kurdewarî بدرێ، واتە: ئەو جێیەی کە کوردی لێیە. ئەم وشەیە لە ترکیدا بووە بە: yer (îş yeri) واتە: جێی کار cêy kar).

Wardin واردن (←خواردن xwardin).

Wash واش/ وەش wesh مانای: وەك wek ە. دەنگی ك k و ش sh جێییەکیان گرتووەتەوە. کە دەنگی ش sh، هێندەك جار، دەبێتە س s، بۆ وێنە وسا: wisa (وەسا wesa) مانای: وەك wek و هێندە جاریش س s دەبێتە ھ h، بۆ وێنە وەسا wesa/وەها weha/ئاوها awha/ئاوا awa. سپی واش spî wash، مانای: وەك سپی wek sipî نە سپیی تەواو ne sipî tewaw. زاری فارسی ئەم وشەیەی وەرگرتووە، سەرنجی وشەی ماهوش (ماە وەش) mahwesh بدە، کە مانای: وەك مانگە و، بۆ نێوی ژنان بەکاردەبرێ.

Washe واشە (←باز Baz).

Watewat واتەوات (←باروێت Barwêt).

Waz واز (کراوە kirawe/ ڤەکری vekirî) ( ← کەل kel).

Wec وەج، مرۆڤی هوشیار و خاوەن مێشك. بێجگە لەمەش وەج

wec له زمانی کوردیدا، مانای: هۆش hosh (عقل)، دەگوترێ فیسارە کەس: بێ وەج bê wec ە، واتە: بێ ئەقڵە. هۆش hosh و، وەج wec > وەژ wej > ڤەژ vej، یەك مانایان هەیە. هۆش hosh > وەش wesh > وەژ wej. ئەورۆ کورد وشەی وەزیر wezîr یان، بە شێوە عەرباوییەکەی وەگرتووە، نە بە شێوە بنەرەتیەکەی کە ڤەژیر vejîr، یان وەژیر wejîr ە، کە مانای مرۆڤی ژیر و خاون هۆش دەگەیەنێ. وشەی زیرەك zîrek ژیرەك jîrek ە.

Wecax وەجاخ، لە: ← وەچە weche + ئاخ ax ەوە هاتووە. ئاخ ax– وێنەیەکی دیکەی پاشکۆی ـاك – ak ە.

Weche وەچە، لە گەڵ بەچە beche (← منداڵ mindal ← زارۆك zarok) یەك بابەتە (← وەجاخ wecax).

Welat وەلات/ Wilat ولات، لە "ولایة" ەوە نەهاتووە، بەلکو لە وار war ەوە هاتووە بە مانای نیشتمان (←هەوار hewar).

Wencene وەنجەنە (← دۆخین doxîn)← دێخوون dêxûn ← بەندەخوێن bendexwên) وەن wen بەن ben ە. جەنە cene (← هۆجەنە hocene).

Wen وەن (← وچان wichan).

Wend وەند (← ڤ/وان v/wan ـ و/ڤان w/van).

Wendene وەندەنە (← وانە wane).

Wendî وەندی (← وانە wane).

Wendok وەندۆك (← وانە wane).

Wendox وەندۆخ (← وانە wane).

Wenewz وەنەوز (خەوبردنەوە xewbirdinewe. لە خەون وەز xewin wez ەوە هاتووە، وەن

**wen** وێنەیەکی دیکەی خەون **xewn** ە، واتە: خەونلێداو **xewinlêdaw**. بەپێی دەستووری جێگۆڕکێیی دەنگەکان وەنەوز **wenewz** لە بنەڕەتدا وەنەوس **wenews** بووە. وەنەوس **wenews**، بووە بە وەنەس **wenes** و وەسەن **wesen** و هەر بە شێوەی وسن و نعاس، کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە. (← وچان **wichan**).

**Wer-** وەر ـ (پاشکۆ) (← وار **war**).

**Werdiyan** وەردیان. ئێشکگر، نوبەتگری گرتووخانە، بە ئینگلیزی **guardian** و بە فەڕەنسی **guardien** ە. ساخ نەبووەتەوە لە بنەڕەتدا کامیانە. بەڵام بە لاتینی **gardianus** ە. لاتینی بنەڕەتی زمانی فەڕەنسییە.

**Werz** وەرز، کە بە ئاڤێستایی: ڤەریزە **verîze** و، بە پەهلەوی: ڤەرز **verz** ە و، بە مانای کاری کشتوکاڵ دێ، لە کوردیدا بۆ دەمساڵ (فصل، موسم) بەکاردێ، بۆ وێنە دەگوترێ: وەرزی بەهار **werzî behar**.

**Wesh** وەش (← **xosh** خۆش، بالکێش **balkêsh**) وێنەیەکی دیکەی باش **bash** ە. بە ئاڤێستایی وەش **wesh** ە. وشەی خۆش **xosh** یش هەر لەم بنەڕەتەوەیە.

**Westa** وەستا (← مامۆستا **mamosta**).

**Wete** وەتە (بە شێوی ئەردەڵانی، بە گون **gun** دەبێژن: وەتە **wete**. کە بۆ گون، لە کوردیدا وشەی باتوو **batû** ش هەیە. وەتە **wete** و باتوو **batû** هەر یەك وشەن. وە **/we** ڤە **ve**

وێنەیەکی کۆنی ← ڤا va/ با ba یە و vate ڤاتە بە ئاڤێستایی و vat ڤات بە پەهلەوی با یە و، تە te/ توو tu کورتکراوەی تێدا têda یە. واتە: شوێنێك کە بای تێدایە و، ئاوساوییەکە، کە گون لەو شێوەیەدایە. (← serwet سەروەت).

Wewî (← Bûk بووك).

Wez وەز (← وچان wichan).

Wezin وەزن، لە کوردیی ئەورۆدا بۆ زیان ziyan بەکاردەبرێ. وەزنی نییە wezinî niye (زیانی نییە ziyanî niye). بۆ وێنە: ئەو مارە بێ وەزنە ew mare bê wezine (بێ زیانە bê ziyane)، لە زمانی کوردیدا وشەی وەزنە wezne هەیە بۆ مرۆڤی بالأبەرز balaberz و خەڵك ترسێن xelk tirsên. وەزنە wezne لە وەررزنە werizne ەوە هاتووە، کە بەشی یەکەمی: وەرز werz وێنەیەکی دیکەی بەرز berz ە. وەزن wezin لە فارسیدا بووە بە گەزن gezin. بێ وەزن bê wezin بووە بە بی گزند bî gizind. ڕەنگە وشەی گەزین gezîn و گازگرتن gazgirtin یش پێوەندیی بە مەوە هەبێ.

Wezîn وەزین، کەوتنە جووڵان و بزووتن bizûtin. وەرزین werzîn یش لە کوردیدا هەیە بە مانای خۆ جوولاندن و (وەرزش werzish) ە. وشەی بەزین bezîn کە بە مانای: شکان و هەڵاتن و ڕەڤین revîn و ڕاکردن rakirdin دێ، هەر هاورەگی وەزین wezîn ە. ـ وەز wez ـ پاشگرێکە بە مانای بزووتوو bizûtû و جووڵاو

cûl'aw و لێهاتوو lêhatû ش دێ. سەرنجی وشەی سەرماوەز sermawez، واتە: سەرما لێهاتوو sermalêhatû، سەرمالێبزوتوو sermalêbzutû، سەرمالێداو sermalêdaw خۆرنەوەزان xornewezan (خۆرلێنەداو xorlênedaw) بدە (← وەنەوز wenewz).

Wezîr وەزیر، لە پەهلەویدا: دوو وشە هەن: ڤەژیر vejîr و ڤچیر vichîr ئەوەش، بە کەسێك دەگوترا، کە، بیروڕایەك دەربڕێ، یان ئامۆژگارییەك بکا، یان راوێژێك پێشکێشبکا. وادیارە، ئەم وشەیە، لە پێش ئیسلامەتیدا کەوتووەتە زمانی عەرەبییەوە و، بەو مانایەی سەرەوە هەبووە. ئەوەتا، لە قورئاندا هاتووە کە مووسا، پەیامبەری جووان، لە خودێ داوای کردووە، زمانی وی بکاتەوە (مووسا لاڵ و پس بووە بە چیرۆکی جووان) تا خەڵك تێبگەن لێی و،هاڕوونی برای بکا بە وەزیری (واتە: راوێژکاری): (ربي إشرح لي صدري و يَسّرْ لي أمري واحْلُلْ عقدةً منْ لساني يفقهوُا قوْلي. واجعلْ لي وزيراً منْ اهلي، هارونَ اخي أشددْ به أزري وأشركهُ في أمري) (سورة طه، ك 20/29) ئەم وشەیە وەزیر wezîr لە سەر دەمی عەباسییەکاندا، هاتە نێو چارچێوەی دەزگەی بەڕێوەبەرێتیی میری و سامان (دەوڵەت) ەوە و، بۆ یەکەمین کەسی دیوانی (← دیوان dîwan) ی خەلافەت بەکاربڕاو لەو ساوە، کەوتە نێو زمانی ترکی و فارسییەوە و،

تا ئەورۆ بەکاردەبرێ. ئەگەر سەرنجێکی وشەی ڤەژیر vejîr بدەین، دەبینین کە دەنگی ژ j بووە بە ز z و دەنگی ڤ v بووە بە و w و وشەکە لە ڤەژیر vejîr ەوە بووە بە وەزیر wezîr چۆنکە دەنگی ڤ v و ژ j لە زمانی عەرەبیدا نین. ئەم وشەی ڤەژیر vejîrە پێوەندیی بە وشەی ژیر jîr ەوە هەیە کە بە مانای مرۆڤی هۆشیارە. (← وەج wec).

Wêne وێنە (← نواندن niwandin).

Wêl' وێڵ/ ویت wît/ بە مانای بەرەڵڵا berel'l'a و بێ جێ و ڕێی دیاریکراو. لە ئاڤێستادا ڤیتە vîte یە، کە ویت wît و ← dewît دەویت ی کوردیی ئەمرۆ لەمەوە هاتووە. لە فارسیدا بووە بە ول/ولگرد wel/welgerd.

Wêl' وێڵ/ وێڵکردن wêl'kirdin. ڕێزگرتن لە خەڵك و بانگکردن بۆ بەشداریکردن لە خواردندا. وێڵ wêl' لە: وێر wêr/ وار war ەوە هاتووە، واتە: کردن بە خاوەن (← وار war).

Wêr وێر/ وێرکردن wêrkirdin (← وار war).

Wêt وێت (← Barwêt باروێت).

Wichan وچان واتە: پشوودان pishûdan. وچان wichan وێنەیەکی دیکەی وتان witanە. وت wit لە کوردیدا مانای خەوت xewt ە (کاری تێپەربووی خەوتن xewtin). وتەن witen مانای: خەوتوو xewtû ە. بە زۆری، دەنگی خ x لە شێوەزاری کوردیی گۆرانی و کرمانجکی (زازاکی) دا لە شێوەی کۆنی و w دا، ماوە، وەك: خواردن xwardin (واردن wardin). خوانا (خوێندەوار)

(xwêndewar) xwana/ وانا wana (← وانه wane) کەواتە: وشەی وچان wichan لە وچدان wichdan < وتدان witdan ەوە هاتووە، واتە: نەجوولان، وەك: خەو لێکەوتن xew lêkewtin. لێرەدا ئاماژە بە وەیە کە وشەی وەنەوز wenewz لە وەن wen (خەون xewn) و وەز wez مانای لێهاتوو lêhatu لە کاری وەزین wezîn/ لێهاتن lêhatin (سەرنجی وشەی سەرماوەز sermawez واتە: سەرما لێهاتوو serma lêhatû/ چیای خۆرنەوەزان chyay xornewezan واتە: چیای خۆر لێنەهاتوو chyay xorlênehatû ە. لێنەداو lênedaw ە. کەواتە: وەنەوز wenewz مانای خەولێهاتوو xewlêhatû خەولێداو xewlêdaw ە. وەن wen خەون xewn ە، وشەی وەنەوز wenewz بە گۆڕینی شوێنی دەنگەکانی و گۆڕینی دەنگی ز z بە س s لە عەرەبیدا بووە بە وسن. وشەی نعاس یش، هەر لەم رگەوە، شین بووە.

Widim ودم (وووم wûm) بە جۆرە هێزیکی دەروونی دەگوترێ، کە لە هێندەك کەسدا هەیە و، ئەو کەسە بە چاك chak و پیرۆز pîroz دەدرێتە قەڵەم، وەك شێخی تەریقەتەکان، کە بە ودم دار widimdar دەدرێنە قەڵەم و، دەگوترێ فیسارە کەس ودم widim (ووم wûm) ی پێیە و، دەتوانێ بیدا بە دەروێشەکانی. دەبێ ئەم وشەیە وشەیەکی هێندۆئەوروپاییی زۆر کۆن بێ، ئەوەتا، لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی wisdom بە مانای ← پێتۆری (پێتۆلی

(pêtorî/pêtolî) واتا: "حیکمەت" دێ. لە زمانی ئەڵمانیشدا وشەی **widmen** هەیە، بە مانای ئەوەی شتێك پێشکێشی کەسیکی دیکە بکرێ بۆ ڕێزگرتن و، بە چاوی بەرز تەماشا کردنی. هەروەها و، هەر لە ئەلمانیدا وشەی **Weisheit** بە مانای پێتۆری **pêtorî** و زانینی فەلسەفە و ← پەند **pend** دەگوترێ و وشەی **wissen** بە مانای زانین **zanîn** دێ. لە زمانی کوردیدا وشەی وژدن **wijdin** و ویژدان **wîjdan** هەیە کە مانای هەستی دەروون **hestîderûn** ە و هاورگی **wisdom** ئینگلیزییە. وشەی "وجدان" ی عەرەبی لەمەوە هاتووە.

**Wilat** ولات (← وەلات **welat**).

**Wird** ورد/ هورد **Hurd**/ ورد **wird** و هورد **hurd**. لە واردن ← خواردن **wardin** **xwardin** ەوە هاتووە، کە شتێك خورا ورد دەکرێ. خوردە **xurde** وردە **wirde** و هوردە **hurde** یە.

**Wiraz** وراز/ بەراز **beraz**/ گراز **giraz**. لە ئاڤێستاییدا: ڤەرازە **veraze** ولە پەهلەویدا ڤراز **viraz** ە.

**Wiřêne** وڕێنە/ وڕاوە **wiřawe**. قسەی بێسەروبەر و نادروست، واتە: درۆ **diro**/ڤڕ **vir**. وڕێنە **wirêne** > وڕ **wir** + ێنە **yêne**. وڕ **wir** و ڤڕ **vir** یەك وشەن. ڤڕ **vir** مانای درۆ و ناڕاست. ێنە **yêne** لە: وێنە **wêne** ەوە هاتووە. وڕێنە **wirêne** لە بنەڕەتدا: ڤڕوێنە **virwêne** یە، واتە: درۆیینە **diroyîne**، لە شێوەی درۆودا. وڕاوە **wiřawe** لە وڕ **wir** + ئاوە **awe** ەوە هاتووە. کە ئاوە

awe له ئاوا awa وه هاتووه.

وڕاوه wiřawe وڕئاوا wiřawa یه، شتێك كه له شێوەی درۆدایه. وشەی وڕك wiřk/ وڕكگرتن wiřkgirtin كه بۆ پێداگرتنی منداڵ دەگوترێ بۆ هێنانەدی ئارەزووەكانی، هەر لەم بنەڕەتەوە سەریهەڵداوه.

Wishe وشه، Wite وته، له وشەی ئاڤێستایی ڤەچەه vecheh ەوه هاتووه كه له پەهلەویدا واچەك wachek ە. سەرنجی وشەی ماچۆ macho ی هەورامی بده. ڤەچەه vecheh بووه به ڤەشەه vesheh ئەوجا ڤەشه veshe ئەوجا وشه wishe و وته wite.

Wishename وشەنامه. پەرتۆكی وشەكانی زمان (← قامووس qamûs).

Wishtir وشتر، (حوشتر ĥushtir) به پەهلەوی: ئوشتر ushtir و له فارسیدا بووه به شتر shotor.

Wîjdan ویژدان/ وژدن wijdin (← ودم widim).

Wite وته (← wishe وشه).

Wîl ویل ی ترومبێل له wheel ی ئینگلیزییەوه هاتووه.

Wît ویت (← wêl’ وێڵ).

Wît-wîtik ویت ویتك (← Barwêt باروێت).

Workshop وۆرك شۆپ. وشەكه ئینگلیزییه و بەمانای شوێنی كار، یان دوكانی كار shwênî kar دێ. له عەرەبیدا بووه به وَرْشَة.

Wutewut وتەوت (← Barwêt).

# X خ

Xa خا/ Xay خای (هێلکە hêlke، هێگ hêg، gun گون) بە پەهلەوی: خایك xayik ە (← خاك xak).

Xa خا ← خۆ xo.

Xak خاك، لە بنەرەتدا هاك hak و هاگ hag ە کە مانای هێگ hêg ە واتە: هێلکە hêlke لە کوردیی باکووردا. دیارە هێگ hêg (هێلکە hêlke) مانای: تۆو tow ە کە بە فارسی: تخم toxm ە. هێگ بە ئینگلیزی egg و بە ئەڵمانی Ei و بە فەرەنسی oeuf. تۆو tow یش بنەرەت (أساس) ی ژیان و پەیدابوونە. تەنانەت بە کوردیی فەیلی بە هێلکە دەگوترێ خا xa کە بە گون gun یش هەر دەگوترێ خا xa، گونیش تۆودان towdan ی مرۆڤە. بە گۆڕینی شوێنی دەنگەکانی خاك xak وشەی ئاخ ax دروستبووە، کە لە کوردیی باکوردا مانای گڵ gil و خاك xak ە.

Xanûtik خانووتك (← بیانی biyanî).

Xas خاس/ رند rind/ باش bash/ چاك chak/ قونج qunc، خوو xû، وشەی خاس xas لە خاص ی عەرەبی، کە بە مانای: تایبەت taybet ە، نەهاتووە. بەلکو لە خواست xwast ەوە هاتووە. خواست xwast بووە بە خواس xwas واتە: شتێك کە بە خواستی خەلك بێ و، مرۆڤ بیخوازێ (بیەوێ و پێی باش بێ) خاس xas لە ئاڤێستاییدا هووس hûs ە و لە کوردیدا وشەی خواستاییتی xwastayîtî یش هەیە، کە پێوەندیی بە

خواستن xwastin (ویستن wîstin) ەو هەیە. خواس xwas بووە بە: خاس xas، بە کەوتنی دەنگی و wوەك چۆن چوار chwar بووە بە چار char، خواردن xwardin بووە بە خارن xarin. ئەم وشەیە بە شێوەی "خاص" کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە.

Xawen خاوەن. > xa-wend خا ـ وەند. خا xa کورتەی خڤەتای xwetay (⟵ خوا xwa). ـ وەند wend– پاشکۆیەکە مانای "سەر بە شتێك" دەگەیەنێ، لە وشەی کوردیی ـ ئێرانیی کۆن ـ ڤەنت vent ـ ەوە هاتووە.

Xawenkar خاوەنکار، نێوی خوای یارسانییەکانە.

Xawên خاوێن/ پاگژ pagij. خاوێن xawên > خا xa + وێن wên. ⟵ خا xa لە زمانی کوردیدا، بە مانای: هێلکە hêlke (هێگ hêg، ⟵ خاك xak) کە وشەی هێگ و هێلکە پێوەندییان بە خا xa ەوە هەیە، بە گۆڕینی دەنگی خ x و هـ h بۆ یەکدی. وێن wên کورتەی وێنە wêne یە کە مانای: وەك هێگ wek hêg، بە شێوەی وی (ە). کەواتە: خاوێن مانای پاگژ و بێگەردە، وەك: هێلکەی پاککراو، کە هێلکەی پاککراو لە زمانی کوردیدا نموونەیە بۆ بێگەردی و "خاوێنی". شێمانەیەکی دیکەش ئەوەیە، خاوێن xawên لە خاس ـ وێنە xas-wêne ەوە هاتبێ (⟵ خاس xas).

Xaye خایە (⟵ خۆ xo).

Xeber خەبەر/ خەوەر xewer/ هەواڵ hewal'، بە پێی لێکۆلینەوەی نوێم ـ بە پێچەوانەی لێکۆلینەوەی

ناڕاستی کۆنمەوە، کە پێموابوو "هەواڵ hewal'"ی کوردی لە خەبەر (خبر) ی عەرەبییەوە هاتووە، بۆمدەرکەوتووە پێچەوانەکەی راستە ـ بەم شێوەیەی خوارەوە:

هەواڵ hewal' > هەوار hewar > هاوار hawar

بنچینەی وشەی خەبەر xeber (خەوەر) هاوار hawar ە. دەنگی ھ h و خ x زۆر جار لە جێی یەکدی، بەکاردەبرێن، کە یەکێك هاواریکرد، مانای وایە خەڵك ئاگادار agadar دەکات، واتە: خەبەردار xeberdar دەکا.

**Xerar** خەرار، رەنگە پێوەندیی بە وشەی هۆڕ hoř ەوە هەبێ. لە زمانی ئەڵمانیدا وشەی horten هەیە بە مانای ئەوەی شتی بە نرخ لە شوێنێکدا قایم بکەیت. وشەکە بە شێوەی "غرار" کەوتووەتە عەرەبی و بە شێوەی "غراره" کەوتووەتە فارسییەوە.

**Xeřek** خەڕەك، ئامێرێکە، لۆکە دەرێسدرێ پێی. وشەکە لە بنەڕەتدا هەڕەك heřek ە بە مانای: ← بزووتن bizûtin و جووڵان cûl'an. سەرنجی وشەی هەڕاکردن heřakirdin بدرێ، کە هەڕاکردن (راکردن rakirdin) مانای جووڵان دەگەیەنێ. وشەی "حرکة" ی عەرەبی لەم هەڕەك heřek ەوە هاتووە. سەرنجی وتەی منداڵان، لە یاری منداڵاندا بدرێ "هەڕەکان و مەڕەکان، بانی بانی گردەکان" کە مانای جوولان cûlan "هەڕەکان heřekan" و ← وچاندان wuchandan "مەڕەکان meřekan (مەرەکان me-rekan، نە ـ رەکان ne-rekan، واتە: نەجوولێ"

دەگەیەنێ. وشەی "هەڕە" heře کە لە کوردیی فەیلیدا بە "مشار" دەگوترێ و لە فارسیدا بووە أرّه erre هەر لەم رگەوە دێ.

**Xerîk** خەریك/ خەریکبوون /xerîkbûn خەریککردن .xerîkkirdin. خەریك xerîk لە هەریك herîk ەوە دێ (← خەڕەك xeřek) کە بەمانای: جوولان cûlan و بزووتن bizûtin ە و کەوتنەکار .kewtinekar. خەریك و خەرکاو xerîk û xerkaw خەریکبوون بە شتێکەوە بە ئارەزوو .arezû. خەرکاو xerkaw > خەر xer (هەر her) + کاو .kaw. کاو kaw ئارەزوو (کاوەخۆ kawexo بە ئارەزووی خۆ be arezûy xo). (← خەڕەك xeřek).

**Xerkaw** خەرکاو (← خەریك xerîk).

**Xesaw** خەساو/ خەسیاو /xesyaw خەسیاگ .xesyag. خەساو xesaw لە خاساو xasaw ەوە هاتووە. (واتە: خا xa ← هێلکەی ← گون hêlkey gun). ساو saw لە سوونەوە sûnewe ەوە هاتووە. واتە: گونی ساوێندراوە، بۆ ئەوەی لە پیاوەتی بکەوێ.

**Xest** خەست (← kesek کەسەك).

**Xestexane** خەستەخانە/نەخۆشخانە /nexoshxane بیمارستان .bîmaristan. خەستەخانە xestexane وشەیەکی کوردییە کە لە زاری ترکیدا بە شێوەی خەستانە hestane بەکاردەبرێ. "فرهنگستان" ی ئیرانیش لە پەنجاساڵی دووەمی سەتەی رابوردوودا خستییە فارسییەوە (تەماشای فەرهەنگی موعین/فرهنگ فارسی دکتر

محمد معين بكه).
"خەستەخانە" لە خستەخانە xistexane دوە هاتووه. "خستە xiste" لە "خستن xistin" دوه هاتووه، وەك چۆن گرتە girte لە: گرتن girtin و بردە birde لە: بردن birdin دوه هاتووه. خستن xistin "دانەسەرزەوی" يە و كاری تێپەڕ (متعدی) ی كاری تێنەپەر (لازم) كەوتن kewtin ە. كەواتە "خەستەخانە" كە لە "خستەخانە" دوه هاتووه، بەو شوێنە دەبێژن كە خەلكی لێدەخەن. خەستە (خستە) لە فارسيدا بە مانای "ماندوو mandû، ماندی mandî، ← شەكەت sheket، ويستياى wîstyay" دێ، نەك بە مانای "كەوتوو kewtû، پاڵكەوتوو pal’kewtû". لەبەر ئەوە وشەكە بە مانای نەخۆشخانە، لە كوردييەوە وەرگيراوەو، بۆ فارسی و تركی خوازراوە.

**Xesyaw/g** خەسياو/گ (← خەساو xesaw).

**Xewerneq** خەوەرنەق، خۆرنەق (خَوَرنَق). ئەمە، كۆشكێك بووە كە عەرەبەكان زۆر باسيانكردووە و، بە قصر خَوَرنَق نێويانبردووە. خەوەرنەق xewerneq لە: خۆرناك xornak دوه هاتووه، واتە: رۆناك و ← رۆشن roshin.

**Xew(n)** خەو(ن) لە ئاڤێستادا خوەفنە xwefne و لە پەهلەويدا خواپ xwap ە.

**Xezal** خەزال، وێنەيەكی ديكەی كەژاڵ kejal’ ە، كە نێوی ژنانەيە و، مانای ئاسك ask (مامز) mamiz ە. وشەكە لە عەرەبيدا بووە بە غزال، وشەيەكی كۆنی

هێندۆئەوروپاییە، لە ئەڵمانیدا Gazelle و لە فەڕەنسیدا gazelle و لە ئیتالیاییدا gazzella یە. فەرهەنگی دودن Duden ی ئەڵمانی بە وشەیەکی عەرەبی دادەنێ. ئەمەش جێی گومانە، چۆنکە لە کوردیدا چوارپێیەك هەیە وەك ڕێوی rêwî/ رووڤی rûvî وایە، نێوی خەز xez ە.

**Xeyar** خەیار/ harwê هاروێ/ arû ئاروو/ هاروو harû. یەك وشەن، دەنگی خ x و هـ h جێییەکیان گرتووەتەوە.

**Xezêne** خەزێنە، شوێنێکە ئاو، یان، شتی دیکەی تێدا هەڵدەگرن. وشەی (خزن) ی عەرەبی لە "کنز" ەوە وەرگیراوە، بەگۆڕینی دەنگی ك k بە خ x و جێگۆڕکێی شوێنی دەنگەکان. "کنز"لە عەرەبیدا مانای ← ئەمبارکردن embarkirdin ە. وشەی "کنز" لە وشەی گەنج genc ی کوردییەوە هاتووە کە گەنج genc شتی بە نرخە. وشەی خەزینە xezêne لە گەنجینە gencîne ەوە هاتووە کە ژوورێك بوو، جاران، خواردەمەنی تێدا هەڵدەگیرا. هەر لە کوردیدا وشەی هژن hijin هەیە بە مانای پاشکەوتکردن pashkewtkirdin. "فرهنگستان ایران" وشەی هزینە hezîne ی لە هژن hijin ی کوردییەوە داتاشیوە، بۆ مەسرەف (مصرف) و خەرج (خرج) بەکاریدەبا (فەرهەنگی معین).

**Xezûr** خەزوور/ xesûr خەسوور. باوکی ژن. لە ئاڤێستا و پەهلەویدا xwesûre خوەسوورە. دەبێ وشەکە پێوەندیی بە خێزان xêzan و ← xizm خزمەوە هەبێ.

**Xêw** خێو/ خاوەن xawen خودان xudan. خێو xêw لە: خودێ وەند xudê wend ەوە هاتووە. واتە: خاوەنی شتێك، یان، گەورە gewre. لە زمانی عەرەبیی مسرییەکاندا بووە بە: ← خدێو xidêw. ئەم نازنێوە بۆ بنەماڵەی برایم پاشا کە، بنەماڵەیەکی بە بنەچە و رەچەڵەك کورد بوون، بەکاردەهێنرا. سمایل پاشا لە ساڵی 1247 ك.م. دا خۆی ئەو نازنێوەی لە خۆنا. شا فاروق کە لە ساڵی 1952 دا، لە لایەن عەرەبە ناسیونالیستەکانەوە، لە تەخت هێنرایە خوارەوە، لەم بنەماڵەیە بوو.

**Xêwet** خێوەت، لە وشەی هێوەت hêwet ەوە هاتووە، بە گۆڕینی دەنگی ھ h بۆ خ x. لە زمانی کوردیدا وشەی هێور hêwir بۆ هەیوان heywan یش بەکاردێ، کە هەیوان heywan سەکۆ seko یەکی سەرگیراوە. وشەی: "خيمة" ی عەرەبی، لەم سەرچاوەیەوەیە، واتە: لە هەیوان heywan ەوە وەرگیراوە، کە لە فارسیدا بووە بە أیوان. هەیوان heywan > خێوان > خێمان > خێمە. گۆڕینی دەنگی ھ h بە خ x لە زمانی کوردیدا ئاساییە، وەك خوێن xwên و هوێن hwên، خەم xem و هەم hem، خوێندەوار xwêndewar و هیندار hîndar (فێرکەر fêrker، مامۆستا mamosta).

**Xidêw** خدێو، بنەماڵە کوردەکانی میسر کە سەرکردیەتیی و فەمانڕەوایی ولاتیان بە دەستبوو بە تایبەتی لە سەر دەمی عوسمانیدا (بۆ وێنە:

بنەماڵەی برایم پاشا و عەبدولفەتاح پاشا) ئەم نازنێوەیان بەکاردەهێنا، لە جیاتی (ئەمیر) و (سوڵتان). خدێو xidêw وشەیەکی کوردییە کە بە شێوەی کوتکراوەی خێو xêw، چ لە میتۆلۆژیای کوردی و چ لە زمانی سادەی خەلکدا بەکاردەبرێبۆ وێنە دەگوترێ: ئەم ئەشکەوتە، یان ئەم گۆڕستانە، خێو xêw ی هەیە، مانای وایە: ← "خاوەن" xawen ی هەیە.کە لێرەدا مەبەست، لە گیانێکی نەبینراوە کە مرۆڤ نییە. یان، دەگوترێ: ئەم باخە خێوی هەیە، واتە: خاوەنی هەیە. وشەی: خێو xêw و خاوەن xawen (کە خاوەند xawend یش هەیە)/ لە وشەی: ← خۆدێ وەند xodêwend ەوە هاتووە. خۆدێ وەند > خدێوەند xidêwend > خدێوەن xidêwen > خدێو xidêw، وادیارە ئەم وشەیە، لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبییەوە کەوتووەتە نێو زمانی میسرییەکانەوە. وەك: وشەی ← بیمارستان bîmaristan کە ئێستەش، لە میسر بەکاردەبرێ بۆ نەخۆشخانە و، وشەی مەهمانە mehmane بۆ مانگانە mangane (مووچە، معاش).

**Xinc** خنج: چەند مانەیەکی هەیە. یەکێکیان بازنەیی bazneyî یە. بۆ وێنە: خنج بڕین xinc biřîn هەروەها، دەرەوەی شتێك، لەپاڵ شتێکدا. xincê wî خنجێ وی. خنج xinc لە کنج kinc ەوە دێ. واتە: کن ـ جێ kin-cê، نك ـ جێ nik-cê، نێزیك جێ nêzîk cê.

Xirp خرپ، مانای: باش bash/ رند rind،له کوردیی بادینانیدا دەگوترێ: ئەو خرپ کوردی دئاخڤە ew xirp kurdî diaxive (واتە: ئەو باش بە کوردی قسە دەکا ew bash (be) kurdî qise deka).
وشەی خوب (باش) ی فارسی لە خرپ xirp ەوە هاتووە. کە بە پەهلەوی خڤەپ xvep ە.

Xiř(t) خڕ(ت): وێنەیەکی دیکەی گر(د) gir(d)/ گرۆڤەر girover.

Xizim خزم، خزم xizim لە: خواز xwaz و، خواستن xwastin ەوە دێ. بۆ تێگەیشتن لەمە، دەبێ سەرنجی وشەی ← نەخاسمە nexasme ی بادینانی کە لە "سۆرانی" دا ← نەخوازەلا nexwazela یە بدەین. نەخاسمە nexasme، نەخوازمە nexwazme یە، واتە: ناخوازم ـ ە na-xwazim-e خوازمە xwazme بووە بە خۆزمە xozme و خزمە xizme و خزم xizim واتە: کەسێك کە دڵ دەیخوازێ و خۆشەویستە. کە وشەی هۆز hoz و خۆز xoz یش، هەر یەك رەگەزن. دەنگی ﻫ h و خ x زۆر جار شوێنی یەك دەگرن تەنانەت وشەی هۆ ho کە بۆ (سەبەب) بەکاردەبرێ لەگەڵ ← خۆ xo یەك بنچینەیان هەیە، بۆ دوو مانای جیاواز.

Xo خۆ، کە بە عەرەبی "نفس، ذات" و بە فارسی "خود" و بە ئینگلیزی self ە، لە بنەرەتدا لە تۆو tow (بذر) ەوە هاتووە کە بنچینە (أصل) ی شتە. ئەوەتە: ← هێگ hêg (هاگ hag، ← هێلکە hêlke) بە کوردیی فەیلی ← خا xa یە. تەنانەت، بە گون

gun که تۆودانی مرۆڤە، دەگوترێ: خایە xaye (خایە و مایەم نەما). هەروەها وشەی خاك xak که بنچینە و بنەڕەتە، پێوەندیی بە هاگ hag (هێلکە hêlke)، واتە: تۆو/ڤ tow/v ەوە هەیە.

Xolemêsh خۆلەمێش (←مێش mêsh).

Xor خۆر، لە ئاڤێستاییدا xver و هەڤەرە hevere یە. لە زمانی کوردیدا وشەی هۆر hor یش هەیە بۆ خۆر xor.

Xorisk خۆرسك (طبیعي) بە شتێك دەگوترێ، کە لە خۆیەوە چێبووبێ. > خۆ xo + رسك risk. رسك risk لە: رستکان ristkan ەوە هاتووە. رسکاو riskaw مانای لە خۆوە دروست بوو. دەگوترێ ئەو درەختە لە خۆیەوە رسکاوە، مانای لە خۆیەوە رِوواوە. هەروەها وشەی رەخساو rexsaw/ رەخسان rexsan لە رسکاو riskaw و رسکان riskan ەوە هاتوون.

xornewezan خۆرنەوەزان (← وچان wichan).

Xosh خۆش، بە ئاڤێستایی وەش wesh مانای جوان /cwan xoshik خۆشك ە. بە پەهلەوی خڤەش xvesh ە. وەش wesh لە شێوەزاری هەورامی و دێرسمی دا بە باش bash و خۆش xosh دەگوترێ.

Xul خول، مانای پێچخواردن pêchxwardin و تووڕەیی tûřeyî یە، خول xul لە خوڕ xuř ەوە هاتووە، کە خوڕ xuř یش وێنەیەکی دیکەی گوڕ guř ە. (← چەرخ cherx). (← xulorbûnewe خولۆربوونەوە).

**Xulorbûnewe** خولۆربوونەوە (← چەرخ cherx). لە ڕۆژئاوای کوردستان وشەی سل sil بەکاردەهێنن بۆ تووڕەیی tûreyî کە سل sil و ←خول xul یەك بنەڕەتیان هەیە و، وشەی "زعل" ی عەرەبی کە تووڕەییە، لەم چاوگەیەوە هاتووە.

**Xumam** خومام، واتە: تەپ و تۆز و مژ tep û toz û mij > خوم xum + ئام am. خوم xum ئەو جۆرە گیایەیە، کە پێیدەگوترێ هەش hesh و ڕەنگی جلکی پێشیندەکرێ. ئام am وێنەیەکی دیکەی ئاو aw و ← باو baw، مانای "لەو شتە دەچێ". خومام xumam واتە: لە خوم دەچێ. وشەی خومار xumar واتە: سەرئێشان و شینبوونی ڕەنگی چاو، پاش سەرخۆشی serxoshî، کە چاو ڕەشکە و پێشکە دەکا، لەمەوە هاتووە. دەگوترێ کچەکە چاو بە خومارە kicheke chaw be xumare. وشەی "غبار" ی عەرەبی، بە مانای تەم و مژ و تەپوتۆز لەم خومار xumar ەوە هاتووە کە خومار xumar بووە بە غمار و ئەوجا بە غبار.

**Xulya(n)** خولیا(ن) > xul خول + yan یان. (yan یان و an ئان هەر یەك پاشکۆن، بۆ وێنە: geryan گەڕیان و geran گەران، هەریەك شتن). خول xul، پێچخواردن pêchxwardin. خولیان بیرۆکەیەکە کە بە مێشکی مرۆڤدا خولدەخوات.

**Xurma** خورما، بە پەهلەوی خەرماڤ xermav ە.

**Xwa** خوا (ئێزدان Êzdan) لە پەهلەویدا خڤەتای xvetay یە و لە فارسیدا خدا.

Xwace خواجه، وەك نازنێوێك بۆ ← mamosta مامۆستا بەكاردەبرێ. لە هێندەك باژێری كوردستان، لە نێو ئەوانەدا شاری سلێمانی، جاران بە ← جوولەكە cûleke خوێندەوارەكانیان دەگوت: "خواجە xwace". وشەی خواجە xwace لە خواندە xwande و خوێندەوە xwendewe هاتووە، هەروەها وشەی "حجة" ی عەرەبی كە بەو مرۆڤانە دەگوترێ كە قسەكانیان وەك بەلگە پێشاندەدرێن و، بە زانا دادەنرێن، لەم خواجە xwace یەوە وەرگیراوە. خواجە xwace كەوتووەتە زاری تركییەوە وەك huce هوجە و، بۆ مامۆستا بەكاردەبرێ. (← Ĥunce حونجە).

Xwan خوان (سفره sifre)/ Xwanche خوانچە بە پەهلەوی خڤان xvan كە بۆناندێن nandên بەكاربراوە. رەنگە وشەكە پێوەندیی بە خواردن xwardin ەوە هەبێ.

Xwane خوانە (← وانە wane).

xwar خوار، بە پەهلەوی: خڤار xvar ە، كە بە مانای ← نزم nizim و ← نەوی newî و ریسوا rîswa دێ.

Xwardemenî خواردەمەنی، مەنی menî لە زمانی كوردیدا بە كەرەسە و بابەتی شتێك دەگوترێ، لە ئاڤێستاییدا مونوو munû ە. خواردەمەنی لە ئاڤێستاییدا خوارموونو xwarmunû ە.

Xwardin خواردن، بە ئاڤێستایی هڤەر hiver و بە پەهلەوی: خڤارتەن xvarten ە.

# Y ی

**Yaprach** یاپراخ، ئیپراخ **îprach** وشەکە ترکییە، کوردییەکەی پەلێ ڕەزان **pelêrezan** ە.

**Yaqût** یاقووت ← بە ڕووسی **яхонт**

**Yarsan** یارسان، نێوی ئاینی ئەهلی هەق **Ehlî Heq** (کاکەیی **kakeyî**) یە. یار **yar** مانای: دۆست **dost**، خۆشەویست **xoshewîst**، ← سان **san** واتە: فرەمەزن **fire mezin** (نێویکە بۆ خودێ **nêweke bo xodê**). یارسان **yarsan** واتە: خۆشەویستانی خودێ **xoshewîstanî xodê**.

**Yasawil** یاساول > یا **ya** + ساول **sawil**. یا **ya** کورتەی: یاوەر **yawer** ە، واتە: یارمەتیدەر **yarmetîder** و هاوکار **hawkar**/ هەڤال **heval** ساوڵ (بە ئاڤێستایی سەئووروو **seûrû** و بە پەهلەوی ساڤوڵ **savul**) نێوی دێوێك بووە، یاساول واتە: هاوکاری دێو **hawkarî dêw**. وشەی یاساول **yasawil** ئەوڕۆ، بۆ کەسێك بەکاردەبرێ کە ← ئێشك **êshk** بگرێ. دەبێ ئەوەش بخرێتە بەرچاو کە **Sawil** نێوی جۆرە تفەنگێکە.

**Yexe** یەخە/ یاخە **yaxe**/ ئێخە **êxe** وشەکە ئەوروپاییە. بە فەڕەنسی **jaquette** و ئەلمانی **Jacke** یە.

# Z ز

**Zagon** زاگۆن (قانوون **qanûn**) له وشەی رووسی **закóн** ەوە هاتووه.

**Zařo** زارۆ (زارۆڵه **zařol’e** > زا **za** + رۆ **ro** + له **le** (نیشانەی کچکەکردن) زا **za** له زایین **zayîn** ەوە دێ. رۆ **ro** مانای منداڵه که پێوەندیی به رووان **rwan** ەوە هەیه، که به فارسی (روییدن **ruîden**)ه. گیاکه روو‌ا **rwa** **giyake**، واته: سەریدەرهێنا و هاتەبوون.

**Zanin** زانین. له ئاڤێستادا زانمم **zanimim** و له فارسیدا دانستن **danisten** ه.

**Zar** زار. چەند مانەیەکی هەیه، وەك: **deng** دەنگ، **dem** دەم، ← **ziman** زمان. سەرنجی وشەی **zarezar** زارەزار (دەنگی گریانی درێژخایەن)، **zirre** (دەنگی راتڵەکاندنی زنجیر) **ziringanewe** زرنگانەوه (دەنگی ئاسن و مس و زێڕ) بده. (← **Bêzar** بێزار).

**Zawa** زاوا/ زاڤا **zava** ← (زەماوەند **zemawend**).

**Zaw û zê** زاو و زێ/ زاڤ و زێ **zav û zê** (بۆ مرۆڤ): منداڵ دروستکردن. (بۆ ئاژەڵ و پەلەوەر): بێچوو (بەچکه) هەلهێنان. زاو/ڤ **zaw/v** ئەندامی سێکسی نێرینەیه. زێ **zê** ئەندامی سێکسی مێیینه. (← **kuz** کوز/ **kus** کوس). کاتێك پەڵه هەورێك به ئاسمانەوه دەبێ و، باران دەبارێ لێی و، له لایەکێ دیکەوه ← سایەقه **sayeqe** یەك دەمی دەکاتەوه و ← خۆر **xor** خۆی پێشاندەدا، دەگوترێ "گورگه زێ

# Z ز

"gurge zê " یە، واتە: وەك زێی گورگە (وەك ئەندامی سێکسی گورگە). وشەی زاو/ڤ zaw/v لە زمانی عەرەبیدا بووە بە: زب zib (ئەندامی سێکسی پیاو). لە زمانی کوردیشدا زەب zeb و زۆب zob هەیە بە مانای رەپ rep.

**Zeb** زەب (← زاو و زێ zaw û zê/ زاڤ و زێ zav û zê).

**Zebesh** زەبەش/ شووتی /shûtî شفتی shiftî. زەبەش zebesh و زەوەش zewesh هەردوو یەك شتن. زەوش zewesh لە زۆشاو zoshaw ەوە دێ، کە زۆشاو zoshaw وێنەیەکی کۆنتری ← دۆشاو doshawە، (دەنگی ز z کۆنترە لە دەنگی د d بۆ وێنە: ← زەریا zerya، ← بێزات bêzat). وشەی زەبەش zebeshی کوردی لە عەرەبیدا بووە بە: دبش debesh و، ئەوجا بە دبس dibs کە مانای دۆشاوە.

**Zefer(birdin)** زەفەر(بردن) (← zor زۆر).

**Zeife** زەعیفە. کە هێندەك جار بە ژن دەگوترێ، بەڵام بە نیازی داشکاندن. وشەکە لە بنەڕەتدا لە "ضعیفة" ی عەرەبی بە مانای (بێ هێز bê hêz، بێ دەسەڵات bê desel'at) ەوە نەهاتووە بەلکو لە زا ـ یفە za-yife هاتووە. زا za لە زایین zayîn واتە: هێنانەبوون hênanebûn، یفە yîfe کورتکراوەی ئەفە efe و ئەفراندن efrandin (خەلق کردن) ە. زایفەکە کراوە بە زەعیفە (ضعیفة) بابەتێکە وەك کردنی Ezdî بە یەزیدی yezîdî.

**Zelam** زەلام < زەل zel + ئام am. زەل zel < زل zil (زەبەللاح zebellah ← گەورە (gewre

## Z ز

ئام am > ← ئادەم adem. مرۆڤی زل کە بە زۆری بۆ پیاو بەکاردەبرێ. وشەکە بە شێوەی "زَلَم" و "زَلِم" چووەتە زاری عەرەبییەوە و، گەلەکەی بووە "أزلام" و "زِلمة".

Zelate زەلاتە. بەکوردی "ترشوپیاز" tirshûpiyaz ە. وشەی زەلاتە، وشەیەکی ئەوروپاییە، لە بنەڕەتدا ئیتالیاییە insalata (واتە: شتێکی خوێکراو) بە ئەڵمانی salat و بە فەڕەنسی salade ە.

Zeman زەمان/ کات kat/ دەم dem. زەمان zeman گەل (جمع) ی zem ە. کە زەم zem شێوەیەکی کەڤنی dem ە. وشەکە لە زمانی ئێرانیی کۆندا بەشێوەی cemane جەمانە هەیە. وشەی زەمانە zemane لە کوردیی ئەڕۆشدا بەکادەبرێ. هەروەها لە پەهلەویدا بە شێوەی زەمان zeman ە. ئەم وشەیە کەوتووەتە زمانە سامییەکانەوە. لە ئارامیدا بە شێوەی جیمان cîman و بە عیبری زمان זמן ە و، لە عەرەبیدا زمان. ترکی و فارسیش ئەم وشەیە هەر بەو مانایە بەکاردەبەن.

zemawend زەماوەند > زەما zema + وەند wend (پاشگرە بۆ پێوەندبوون بە شتێکەوە). زەما zema، وێنەیەکی دیکەی زاما zama و زاڤا zava یە. کە زاما zama و زاڤا zava هەردووکیان بە مانای زاوا zawa لە کوردیدا هەن. زاڤا zava لە زان zan ەوە هاتووە، کە لە ئاڤێستادا زاماتەر zamater ە و لە پەهلەویشدا زامات zamat ە، واتە: کەسێك کە بتوانێ بزێنێ bizêne واتە: وەچە weche بخاتەوە و ← زاڕۆ zařo دروستبکا. وشەی

"زفاف" (زەفاف) ی عەرەبی کە بە شەوی بووکینی دەگوترێ "لیلة ألزفاف" لە زەماوەند zemawend ی کوردییەوە وەرگیراوە بەم جۆرە خوارەوە: زەماوەند zemawend > زەڤاڤەند zevavend > زەفافەند zefafend> زەفافە zefafe > زەفاف zefaf (زفاف zefaf).

**Zena** زەنا (هاوار hawar) (← دەنگDeng).

**Zerd** زەرد (رەنگی زەرد) بە ئاڤێستایی زەرەتە zerete و زەرت zertە کە ئەمەش لە وشەی ← زەردەشت zerdesht کە لە ئاڤێستادا وەك: زەرەث zereth ئوشترە ûshtire هاتووە وەرگیراوە. بە پەهلەوی زەرت zertە. زەردەشت گەلێك نێوی هەیە، دەگوترێ مانای "خاوەنی حوشتری زەرد"! کە ئەمەش جێی گومانە.

**Zerdechêwe** زەردەچێوە، جۆرە بەهاراتێکی زەردە دەکرێتە چێشت بۆ تامخۆشکردن. ← چێو chêw مانای دار darە. وشەکە بە شێوەی زەردەچاڵ zerdechal’ کەوتووەتە زاری ترکییەوە، کە دیارە زەردە zerde کوردییە و لە رەنگی بەهاراتەکەوە هاتوو. چاڵ chal’ یش چڵ chil’ە کە چڵ chil’ دار و چێوە dar û chêwە، کورد دەبێژن: چڵ و چێو chil’ û chêw.

**Zerdesht** زەردەشت (← زەرد zerd).

**Zerya** زەریا، لە وشەی ئاڤێستایی zerya وە هاتووە. وشەی زەریا zerya کۆنترە لە وشەی دەریا derya/دەلیا delya چۆنکە دەنگی ز z لە دەنگی د d و دەنگی ر r لە دەنگی ل l کۆنترە. (سەرنجی: گۆلی زرێبار golî zirêbar و زێی گەورە zêy gewre بدە).

**zev** زەڤ (← جەفەنگ cefeng).

**Zewac** زەواج/ژنمێری jinmêrî. دوورنییە زەواج عەرەبی نەبێ و پێوەندیی بە زاوزێ zawzê ەوە هەبێ، یان زووج zûc وێنەیەکی کۆنی دوو یان جووت dûcût بێ.

**Zewî** زەوی/ زەڤی zevî/ زەو zew کە بە ئاڤێستایی: زمە zime یە و بە پەهلەوی: زەمیك zemîkە، بووە بە: زەمین zemîn و زەوین zewîn و زەوی zewî و زەو zew. فارسیش زەمین بەکاردەبا.

**Zilĥort** زلحۆرت/ Zilhort زلهۆرت، مرۆڤی زل zil و لەندەهۆر lendehor > زل zil + حۆرت ĥort، حۆرت hort لە هۆرت hort ەوە هاتووە. هۆرتە horte و وەرتە werte بە مافوور mafûr ی گەورە دەگوترێ. تەنانەت وشەی هۆڕ hoř کە بە جەواڵ cewal’ ی زل و مرۆڤی دەموچاو سەیر و کەنە دەگوترێ، هەر پێوەندیی رەگیی، بە هۆرت hort ەوە هەیە. زلهۆرت zilhort واتە: زلێکی وەك هۆڕ.

**Ziman** زمان/ زڤان zivan/ زوان ziwan. وشەی ئەزمان ezman و زمێن zimênیش هەیە هەر بۆ زمان ziman. زمان بە پەهلەوی: زووڤان zûvan و گەمان geman ە، کە لە فارسیدا بووە بە زبان zeban. (← تەرجەمان Terceman)

**Zincîr** زنجیر، بە پەهلەوی zencîl ە و، بە شێوەی "جنزیر" کەوتووەتە زاری عەرەبییەوە.

**Zirav/w** زراڤ/و (باریك و درێژ barîk û dirêj) بەم مانایە لە زراڤ/و zirav/w ەوە هاتووە کە توورەکێکی باریك و درێژکۆلەیە لە زگی مرۆڤدا و، شلاوێکی زەردی تێدایە. زراڤ/و zirav/w

له زەرد zerd ئاڤ av ەوە هاتووە، واتە: ئاوە زەردە awe .zerde

**Zirêbar** زرێبار. لە زەریا ـ بەر zerya-ber وە هاتووە، واتە دەوروبەری زەریا.

**Ziyan** زیان، بە مانای زەرەر zerer دێ، بە پەهلەوی: زیان ziyanە.

**Zob** زۆب (← زاو و زێ zaw û zê/ زاڤ و زێ zav û zê).

**Zor** زۆر، دوو مانای هەیە لە زمانی کوردیدا یەکێکیان: بە مانای شتێکە کە پتر لە پێویست هەبێ، واتە: فرە fire بێ واتە: بە کوردیی باکوور "پڕ pir" بێ. ماناکەی دیکەشی ← گوشار gushar و ← دەسەڵات desel'at و ← هێز hêz و توانست tiwanist ە. وشەی زۆر zor لە ئاڤێستاییدا زوورە zûre و زەڤەرە zevere (سەرنجی وشەی زەفەربردن zeferbirdin واتە: زاڵبوون zal'bûn بدە) و زاوەر zawer ە، لە پەهلەویدا، هەر وەك كوردی زۆر zor ە.لە فارسیدا زور (zûr) ە. زۆر zor بە مانای فرە fire لە زمانی ئەڵمانیدا: sehr ە، کە س s وەك ز z دەردەبڕدرێ و دەگوترێ "زێر"، بە ئەڵمانیی کۆن sore (زۆرە) یە. دیارە وشەی زۆر zor بە مانای توانست و توند و هێز هەر پێوەندیی بە مانای "فرە" وە هەیە. زاری ترکی وشەی zor ی لە کوردییەوە وەرگرتووە و هەر وەك خۆی "زۆر zor" بەکاریدەبات، نەك بە شێوەی فارسی "زور zûr". هەروەها، ترکی وشەی زۆربایی zorbayî شی لە شێوەی زۆربا zorba دا لە کوردییەوە وەرگرتووە. کەچی

## Z ز

فەرهەنگی ئیتمۆلۆژیای زاری تركی هی Eyuboğlü لە ل 406 دا دەنووسێ: zor و zorekî زۆرەكی  تركی لە زور zûr ی فارسییەوە وەگیراوە، كە ئەمەش راست نییە. چۆنكە ئەگەر لە زور zûr ی فارسییەوە وەربگیرایە دەبوو، ببوایە بە زویر zür، یان هەر زوور zûr بووایە، وەك فارسی. پاشان، زۆرەكی zorekî كوردییە و ئەم وشەیە لە فارسیدا نییە.

**Zup** زوپ (← دوپشك dupishk).

**Zushk** زوشك (← دوپشك dupishk). دەنگی ز z كۆنترە لە دەنگی د d. (←زوپ zup)

**Zurna** زوڕنا (← سووران sûran).

# کۆبەرهەم

**لە زنجیرەی ئەم کۆبەرهەمەدا تا ئێستە ئەمانەی خوارەوە بڵاوکراونەتەوە:**

1. ژمارە (1) هێندێک لە کێشە بنەڕەتییەکانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم / بابەتی بیرکاری و تیۆری ژمارە (1) بەرگی یەکەم ، چاپی دووەم – هەولێر کوردستان 2001. بڵاوکراوەی رۆژنامەی "میدیا" ژمارە(2) چاپی یەکەم – بڵاوکراوەی "سۆکسە" لقی سوێد، ستۆکهۆڵم ، 2596 ک/ 1984ز.
2. ژمارە (2) بیری نەتەوەیی کوردی، نە بیری "قەومیەت"ی رۆژهەڵاتی و نە بیری "ناسیۆنالیزم"ی رۆژئاوایی یە. بابەتی بیرکاری و پیتۆری ژمارە(2) چاپی دووەم، لەندەن 2002 بڵاوکراوەی کوردنامە، چاپی یەکەم 1984 ستۆکهۆڵم.
3. ژمارە (3) کوردستان و شۆرشەکەی، چاپی دووەم (ئەلیکترۆنی) بە کوردی 2003، زنجیرەی سەمینارەکان و کۆڕە زانستییەکان ژمارە (1) چاپی یەکەم بە زمانی ئەڵمانی. بڵاوکراوەی NUKSE میونیخ 1972، چاپی یەکەم بە کوردی، سوید 1984.
4. ژمارە (4) ناسنامەو کێشەی ناسیۆنالی کورد لە چەند سەمینار و کۆڕێکی زانستیدا، بڵاوکراوەی بنکەی کوردنامە لەندەن 2002 چاپی دووەم ؛ هەولێر 2007. زنجیرەی سەمینارەکان وکۆڕە زانستیەکان ژمارە(2). ئەم بەرهەمە پێنج بابەتی لەخۆگرتووە:
   1 – پێوەندارێتیی کوردی 2– دۆزی ناسیۆنالی کورد
   3– سەمیناری کوردستان، راپۆرتێک لەسەر بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کورد و وتوویژ لەسەر باری کوردستان.4– کوردو شۆرش
   5– بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کوردو پێشبینیی دواڕۆژی.

5. المستضعفون الكورد و اخوانهم المسلمون ، سلسلة السمينارات والمحاضرات العلمية رقم(3)،الطبعة الثانية، السليمانية– جنوب كوردستان 2006، الطبعة الاولى – لندن 1997 من منشورات كوردنامه.
6. ژماره(6)زنجیره وتارو وتوویژ لەگەڵ دەزگەی راگەیاندی گشتی ژماره(1) سلێمانی 2006.
7. ژماره(7) زنجیره وتارو وتوویژ لەگەڵ دەزگەی راگەیاندی گشتی ژماره(2) سلێمانی 2007.
8. وشەنامەکی ئێتیمۆلۆژیای زمانی کوردی، چاپی یەکەمی ئەلیکترۆنی 2008 / ماڵپەڕی کوردبوون
www.kurdbun.de
www.kurdbun.com
www.kurdbun.net